


گۆڤاری

# مێژوو

- گوتاری ناسیۆنالیزمی کوردی
- فەرهەنگنووسی کوردی لە ١٩٧٠-١٩٨٤
- دۆزینەوەی وێنەی سەر بەرد لە کوردستان
- ڕۆڵی کورد لە بزووتنەوەی خەواریج لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەویی
- هەولێر لە سەردەمی سەلجوقییەکاندا
- دەوڵەتی عوسمانی و دامەزراندنی
- کورتەیەك لە مێژووی دپلۆماتیك (زانستی لێکۆلینەوەی بەلگەنامەکان)
- أهمية الوثائق العثمانية في كتابة التأريخ الكوردي
- عوامل النهوض الحضاري

زستانی ٢٠٠٧

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژوویی کوردستان دەریدەکات

ژمارە 1

ساڵی یەکەم

# گۆڤاری مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات



ژمارە (١) سالی یەکەم ٢٠٠٧




**راوێژكاران**

د. حەسەن جاف

د. جەوهەر سدیق شاوەیس

- گۆڤار : مێژوو
- ژمارە : [ ١ ]
- تیراژ : [ ٧٠٠ ] دانە
- چاپخانە :
- پیت چنین : یاسر سعدالله ، هەوار اسماعیل

رامان شارباژێڕی



كوردستان / هەولێر - گەڕەكی تەیراوە ، نزیك قوتابخانەی ئەیوبیەی سەرەتایی تیكەڵاو

govari_meju@yahoo.com
govari_meju@maktoob.com

# پێرست

## سەروتار

## وتار

لاپەڕە



## توێژینەوە



## وەرگێران

## دیدار



## ملحق العربی



## کەشکۆڵی گۆڤار

# کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان و گۆڤاری مێژوو بۆ...؟



ماوەیەک بوو ڕوویەڕووی ئەو پرسیارە دەبوینەوە کە لەنێو ئەو هەموو کۆمەڵە وسەندیکا وسەنتەرانەی لەکوردستاندا هەن، بۆچی مێژوونوسان لەژێر سێبەری ناوێک کۆنابنەوە. لەهەمانکاتدا یەکێک لەو پرسیارانەی زۆرجار لەخۆمم کردووە، بۆچی بەدرێژایی مێژوویی ڕۆژنامەگەری کوردی ڕۆژنامەیەک یان گۆڤارێکی تایبەت بەمێژوو نەبووە، ئەمە لەکاتێکدا کە مێژوو یەکێك لەپێکهێنەرە گرنگەکانی ڕۆشنبیری هەر نەتەوەیەکە، وبوونی کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان وەکو وەڵامێکی دروست بۆ ئەو پرسیارانە، بەماندوبونێکی زۆر لەدایك بوو وگۆڤاری (مێژوو)ش وەکو پێویستیەکی گرنگی بواری ڕۆژنامەگەری ورۆشنبیریی کوردی دەبێتە دیارییەکی بەنرخ بۆ کورد.

کۆمەڵەکەمان سەرەڕای دەرکردنی ئەم بڵاوکراوەیە کاردەکات لەسەر بەرهەمهێنانی هەندێ فیلمی دۆکۆمێنتی لەسەر مێژووی کورد، وپتر جەخت لەسەر لایەنی شارستانی لەمێژووی کورد دەکاتەوە، دواتریش بەپێی توانا ئەم فیلمە دۆکۆمێنتانە وەردەگێڕدرێنە سەر زمانی عەرەبی وئینگلیزی ودەبنە دیارییەکی بەنرخ بۆ کورد ودەزگاکانی ڕاگەیاندن هەوڵ دەدەین

زیاترین ژمارەی قەڵەم لەبواری مێژوونوسین وەرگێڕانی بابەتی مێژوویی لەگۆڤارەکەدا بەشداری بکەن وبەگوێرەی توانا، کۆمەڵە هەوڵدەدات دۆکۆمێنتی مێژوویی کۆبکاتەوە وهەر جارەی دانەیەکیش لەگۆڤارەکەمان بڵاوبکاتەوە.

کۆمەڵە هەوڵ دەدات لەڕێگای پێشکەشکردنی بەرنامەی مێژوویی لەڕادیو وتەلەفزیونەکانی کوردستاندا. ڕۆشنبیری مێژوویی لەکوردستاندا پتر بڵاوبکاتەوە وهەوڵ دەدات زیاترین ژمارەی مێژوونوسان بەجیاوازی ئینتمای حیزبیەوە کۆبکاتەوە، بەڵام هەموو ئەو ئامانجانەی بەبێ یارمەتی ژمارەیەکی باش لەمێژوونوسان ودەزگاکانی حکومەتی هەرێم نایەتەدی یان تەگەرەی دەکەوێتەبەر. بۆیە ئێمە داوای یارمەتی لەهەموو لایەک دەکەین وپیرۆزبایی لەکورد دەکەین.

**سەرنوسەر**



# گۆڤاری مێژوو

پ.ی.د. ئەرسەن موسی ڕەشید
خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری مێژوو

مێژوو ناسنامەی نەتەوەیە، بۆیە دەرچوونی گۆڤاری مێژوو لەو قۆناغەدا، کە ژمارەی لەپسپۆڕانی ئەم بوارە، بەتایبەتی مێژوونووسانی کورد ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەزیادبووندایە، مامەڵەکردن لەگەڵ پرسەکانی ژیانی ڕۆژانەمان وبڕیاردان لەسەر جۆر وچۆنیەتی پەیوەندییە دەرکییەکان، یان پەند وسود وەرگرتن لەمێژوو دەخوازێ، ئەرکێك بوو لەسەرشانی پسپۆڕانی بواری مێژوو کە نەدەکرا چیتر وبەهەربیانویەك نەیخەینە ئەستۆی خۆمان، هەر چەندە کە کارێکی ئاسانیش نەبێ، لەم ڕووەوە لەهەنگاوی یەکەمدا دەستکرا بەدامەزراندنی کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان ودەرکردنی گۆڤاری مێژووش دەبێتە زمانحاڵی ئەو کۆمەڵەیە وسەکۆی سەرەکی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی مێژوویی لەکوردستاندا، لەم ڕووەوەش ئەگەرچی کۆمەڵەکەمان زیاترین ژمارەی مێژوونووسانی لە خۆکۆکردۆتەوە، بەڵام لەهەمان کاتدا داوای هاوکاری ویارمەتی لەهەموو لایەن ودەزگایەك دەکەین کەدەیەوێ خزمەت بەمێژووی کورد بگەیەنێ، بەتایبەتی ئەوانەی وێنە ودۆکۆمێنتی مێژووییان

لەلا هەیە، دەتوانن لەڕێگای گۆڤارەکەمانەوە بڵاوی بکەنەوە ولەفەوتاندن ڕزگاری بکەن، هەروەها ئامادەین بۆ هاوکاری کردن لەگەڵ ئەو کەسایەتی ودەزگا کوردی وبێگانانەی دەرەوەی وولآتیش کە دەخوازن خزمەت بەمێژووی کورد بکرێ وهیوادارین خوێنەرانیش پێشوازییەکی زانستی ودوور لەسۆز لەگۆڤارەکەمان بکەن، وکاتی ئەوەش هاتووە مێژوو لەلایەن خەڵکی کوردستانیشەوە لەوانەی کەپسپۆڕانی ئەم بوارەش نین وەکو زانست سەیری بکرێ، نەك وەکو چیرۆك وحەکایەت.

لەکۆتاییدا بەبۆنەی دەرچوونی ئەم گۆڤارە پیرۆزبایی لەخۆمان ونەتەوەی کورد بەگشتی ورەوتی زانستی وزانیاری لەکوردستاندا دەکەین. هەروەها سوپاسی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکەین کە یارمەتی دامەزراندنی کۆمەڵە وگۆڤارەکەی داوە. وەداواکارین لەپسپۆڕانی بواری مێژوو کە لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل وزانستی بۆ گۆڤارەکەمان بنێرن

# کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان و گۆڤاری مێژوو



د. سەلام حەسەن خۆشناو
ڕاگری کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەدین

مێژوو یادەوەری نەتەوەیە، ئەو نەتەوەی مێژووی نەبێ وەکو ئەوەیە یادەوەری لەدەست دابێت، بەڵام خۆ نەتەوەی بێ مێژوو(وەکو ڕووداوی مێژوویی) نییە، بەڵام کاتێك ئەو ڕووداوانە تۆمارنەکرێ وتوێژینەوەی لەسەر نەکرێ، نەتەوەی بێ مێژوو یان بەشێوەیەکی تر مێژوویییەکی هەژاری(بەشێوەی نووسراو لەبەردەستی) دەبێت.

بۆیە کۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژوویی کوردستان پێداویستیەکی مێژوویی بوو، کە لەلایەن کۆمەڵێك پسپۆڕانی بواری مێژوو لەمامۆستایان وباریدەدرانی توێژەر لەزانکۆ وهەلگرانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس لەمێژوو، لەدەرەوەی زانکۆ لە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ دامەزرا، بۆ ئەوەی ڕۆشنبیری مێژوویی بەشێوەیەکی زانستیانە لەلایەن کەسانی ئەکادیمیەوە بەشێوازی جۆربەجۆر

بەخەڵکی کوردستان بگەیەندرێ لەم ڕووەوەش هەموو چین وتوێژەکانی کوردستانمان بەمنداڵ وگەنج وپیر وخوێندەوار ونەخوێندەوار وکەسانی حیزبی وبێلایەنی خستۆتە چوارچێوەی بەرنامەی کار لەسەر کردنی خۆمان، ئەمەش لەسەرەتادا ولەهەنگاوی یەکەم لەڕێگای گۆڤاری مێژووەوە پیادە دەکەین، کە گۆڤارێك دەبێت گرنگی بەبواری مێژوو بەگشتی ومێژووی کوردستان بەشێوەیەکی تایبەتی دەدات. بەلاّم نەك لەبەرئەوەی گۆڤارەکە لەلایەن کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەردەچێ ولەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە سەرپەرشتی دەکرێ، بابەتەکانی بەشێوەیەکی وانوسرابن کە خەڵکانی دەرەوەی زانکۆ بڵێن زمانەکەی ئەوەندە قورسە لێی تێناگەین، بەڵکو بابەتەکانی بەشێوەیەکی زانستیانە بەلاّم بەزمانێکی سادە وساکار بۆ هەموو خەڵکی خوێندەوار دەنوسرێ وبابەتەکانی دابەش دەبنە سەر توێژینەوە ونوسین ووەرگێڕان ودۆکۆمێنت ووێنەی مێژوویی.

ئەم هەنگاوەی یەکەم بەپێشتیوانی خودا وهەموو لایەك هەنگاوی تری گرنگتری بەدوادێت وەکو بەرهەمهێنانی فیلمی دۆکۆمێنتی دەربارەی مێژووی کورد بەتایبەتی زیاترین ژمارە لەپسپۆڕانی مێژووی کورد، ئەگەر لە دام ودەزگایەکدا کۆببنەوە ئەوە هەر لەکۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان کە هەڵگرانی بڕوانامەی بەکالوریۆس وماستەر ودکتۆرا لەزانکۆکانی سەلاحەددین وسلێمانی ودهۆك وکۆیە وتەنانەت زانکۆی بەغداشی تێدا کۆبۆتەوە، بۆیە کارێکی مێژوویی نەتەوەیی کورد دەبێ، دەکرێ دواتر ئەم فیلمە دۆکۆمێنتانە کە هەندێك بەزمانی کوردی وهەندێکی تر بەزمانی عەرەبی بەرهەم دەهێنرێن، وەربگێڕدرێنەر سەر چەندین زمانی جیهانی، بەمەش

خزمەتێکی زۆر بەمێژووی کورد دەکرێ کە لەوانەیە نوسین ووتار وکتێب لەبواری مێژوویی خوێنەریان زۆر کەمتربێ لەبینەرانی ئەو فیلمانە، لەهەمان کاتیشدا کۆمەڵەکەمان دەست پێشخەر دەبێ لەوەی ببێتە کۆمەڵەیەکی بەرهەمهێنەر ورۆژ بەرۆژ بواری کارە بەرهەمهاتووە داهێنەرەکانی پترتر دەبێ وکۆمەڵە وسەنتەرەکانی تری کوردستانیش لەسەر رەوتی ئەو دەرۆن لەوەی ببنە کۆمەڵ وسەنتەری بەرهەم هێنەر، نەك هەر پشت بەیارمەتی حکومەت ببەستن، بەمەش کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان بەشدارییەکی چالاك لەپتەوکردنی کۆمەڵگای مەدەنی کوردستان دەکات.

لەماوەی چەند مانگی تەمەنی ئەم کۆمەڵەیە دەستەیەکی کارگێری لەپێنج کەسی هەمیشەیی ودووکەسی یەدەگ هەڵبژێردراون بۆ ئەوەی کاروبارەکان بەرێوەببەن، ئەوپەری دیموکراتی لەهەڵبژاردن وبەرێوبردنی کارەکان دەبینرێ وهەموو بەگیانی بەرپرسیاریەتی وبرایەتی وهاوکاری یەکتریکردن کاردەکەن وهەموو ئەندامێك لەکۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان خۆی بەبەرپرس دەزانێ لەسەرکەوتنی ئامانجەکانی ئاماژە بۆکراو، هەموو هەر خزمەتکاری ئامانجە نەتەوەییەکانی کوردین.

ئەگەر تاکو ئێستاش کورد لەتۆمارکردن وتوێژینەوەکردن لەمێژوودا لەنەتەوەکانی تر دواکەوتووتربێ، ئەوە ئەمرۆ دەبێ چەندین کەرەت پتر لەنەتەوەکانی تر کاربکەین بۆ ئەوەی مێژووکەمان بەو شێوەیە خزمەت بکەین کە شایستەیەتی.



# دەخوازین گۆڤاری میژوو، قەڵەمێکی زانستیی میژوویی کوردبێ..!!

✍ مومتاز حەیدەری

گـەورە نوسـەر ورۆژنامـەنوسی عـەرەب محەمـەد حەسنـێن هـەیکـەل دەبێژێ: (( گرنگی دان بـەسیاسـەت لـەڕوانگـەی فیکر وکردەوەدا، دەبـێ یـەکـەمجار مێژوو بخوێنـدرێتەوە، چونـکە ئـەوانـەی بـەر لـەدایك بونییـان، نەزانن چی ڕوویداوە، ئەوا، بەوە –حوکم– کراون، کە بەدرێژایی تەمەنییان هەر بەمنداڵی بمێنێنەوە..!))

کە دەگوترێ: ((مێژوو))، یان مێژوو وەك زاراوەیـەکی زانستیی سـەربەخۆ، واتـا ((مێـژوو)) خـۆی لەخۆیـدا، زانـستێکی سـەربەخۆیی فرەلایەنـە. بگـرە، سەرچاوەی تێکڕای زانستەکانی دیکەیە، واتا باس لەهەر شتێ، هەر دیاردەیێ، هەر زانستێ هەر ڕووداوێ، دەگرێ، ئەوا (( مێژووە))کی خۆی هەیە، واتا لەبەر ڕۆشنایی زانـستی مێـژوودا، ژیـانی مرۆڤایـەتی لەسـەرجەم بوارەکانـدا، لێـی دەکۆڵرێتەوە وبەوردی ساغ دەکرێتەوە،.. بۆیـە کـە مرۆڤایـەتیی پێشکەوتوو، زۆر گرنگـی بەمەسـەلەی گـەورەیی مێـژوو، وەك زانـستێکی سـەربەخۆ وکلیلـە زێڕینەکانی سەرجەم دەرگا داخراوەکان دەدەن بەرامبەر بەوە، ئێمـەی کـورد، جـارێ، لـەڕۆژی بوونمـان لەسـەر خـاکی نەتەوەییمانـدا، بەگـشتی، مێـژووی

نەتەوەیی– کۆمەڵایەتی –مان تا بڵێی شێواندراوە، لەلایەکی دیکەوە، بەپێی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کوردەوە، بەتایبەتی دواکەوتوویی – عەقڵی–کلتوری وکۆمەڵناسی، لەوەش وردتر لەمەیدانی زانستی مرۆڤ ( ئەنثرۆپۆلۆژیا) زێدە هەژارین، هەردوو زارەوە وچەمکی (زەمەن– مێژوو) شوێنەکەیان لەعەقڵی کلتوری سیاسی بەتاڵە..!! زێدە بەکورتی، ئێمە نە مێژوو دەخوێنینەوە، نە دەی نوسینەوە، بگرە ڕێزیشی ناگرین، بۆیە کوێرین..(!) (؟).

بەهەر حاڵ، لەم دەرفەتە زێدە کورتەدا، بە بۆنەی ئەو دەستپێشخەریە هۆشیارانەی کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان، بەدەرکردنی گۆڤارێکی تایبەت لەمەیدانەکانی لێکۆڵینەوە وزانستی مێژوودا، لەوەش ڕۆشنتر لەمەیدانی زێدە هەژارەکەی مێژووی کورد دا، ئەوەندە دەڵێم: کارێکی کلتوری چاکە، هیوادارین، گۆڤاری مێژوو، ئامرازێکی زانستی لێکۆڵینەوە ونوسینی نەتەوەیی هاوچەرخانەی مێژووی ڕەسەنی تێکڕای بوارەکانی ژیانی کۆمەڵی کوردەواری بێت.

هەر لێرەوە، دووجار پیرۆزبایی لەم ژمارە مامۆستا دڵسۆزانە دەکەم، کە ئەو ڕێکخراوەیان دروستکردووە، وهاوکات– پێم وایە – یەکەم جارە، گۆڤارێکی پسپۆڕی بەدنیای زانستی مێژوو بەگشتی وکۆمەڵی کورد بەتایبەتی بەزمانی کوردی دەردەچی..بۆیە بەگەرمی دەست خۆشییان لێ دەکەم. خوێندنەوەیەکی زانستی ونەتەوەییانەی مێژوو، چرای ڕۆشنی دوا ڕۆژە....

# مێژونووس و دەمارگیری



د. حەکیم ئەحمەد خۆشناو

دیارە نووسینی مێژوو کارێکی وا ئاسان نییە، هەرکەسێك بیەوێت خۆی لەقەرەی بدات وخۆشی بەمێژوونووس لەقەڵەم بدات، چونکە ئەم کارە بەر لەهەموو شتێك بەرپرسیاریەتیەکی ڕەوشتییە کە پەیوەستە لەگەڵ ناخ ویژدانی مرۆڤەکە، کە بێگومان ئەو کەسانەی دەرك بەوە دەکەن کەمن وئەگەر نەڵێین دەگمەنن.

لەم پێودانگەوە هەر کەسێك چەند کتێبێکی مێژوویی خوێندبێتەوە وچەند بابەتێکی مێژوویی نوسیبێت بەهۆی خولیای بەمێژوو وڕووداوەکانی ئەوا ناکرێت پێ بوترێت مێژوونووس هەرچەندە خۆی واحیساب بکات چونکە بانگەشەکردن شتێکی جیایە لەگەڵ واقیع.

لێرەدا دەمەوێ تیشك بخەمە سەر لایەنێکی زێدە گرنگ لەبواری نووسینی مێـژوودا، ئـەویش پەیوەنـدی نێـوان مێـژوونووس ودەمارگیرییـە. دیـارە زۆر بەکورتی ئامانجی مێژوونووس لەهـەر کـارێکی زانستیدا هەوڵدانـە بـۆ گەیشتن بەنزیکترین خاڵ لەڕاستی مێژوویی، ئەم پرۆسەیەش پێویستی بەخستنەگەڕی هزر وعەقڵ هەیە بەر لەهەموو شتێك. وەپێویستی بەئاسۆیەکی هـزری فـراوان هەیـە کـە توانـای خوێندنـەوە ولێکدانـەوەی سـەرجەم ئـەو ڕەگـەزە دیـار ونادیارانەی هەبێت کە بەشێوەیەك لەشێوەکان، ڕاستەوخۆ یان ناڕاسـتەوخۆ، دوور یا نزیك کاریگـەریان هـەبووە، یـاخود لەوانەیـە کاریگـەریان هـەبوو بێت لەسەر ڕووداوە مێژووییەکە، هەر لەهەلومەرجی پێش دروست بوونیـەوە تـاکو دەگاتە کۆتایی وئەنجامەکانی.

هەرچـی دەمارگیرییـە، ئـەوا حاڵـەتێکی دەروونـی قێـزەون ونـەخوازراوە، بەڵکو نەخۆشیەکی دەرونی– دەماری کوشندەیە، کە بەهۆیـەوە بیرومێشکی مرۆڤ تووشی جامکردن دەبێت وبەهیچ شێوەیەك ناتوانێت پـێش هـات وپـاش هاتەکانی ڕووداوەکان بخوێنێتەوە هۆکار وئەنجامەکانی زانستیانە ولۆجیکانـە دەستنیشان بکات وبچێتە ناو شیکاری ڕووداوەکان. بەم پێیە جگە لەوەی کە لەناو مێشکیدا هەیە وچەقیوە بەهۆی دەمارگیرییەکەیەوە هـیچی تـر نابینێت وناخوێنێتـەوە وغـەیری ڕاوبۆچـوونی خۆشـی بەهەڵـە ونادروسـت دەزانێـت، هەرچـەندە ئەگـەر خـاوەنی ڕای بەرامبـەر بەبەڵگـە ودیکۆمێنتـەوەش پـشت ئەستور بێـت.

کەواتە ئەم پێداگرتنە لەسەر بۆچوونێکی مێژوویی هەڵە دەگەڕێتەوە بۆ (( تێڕوانینێکی پێشوەختە)) کە لەفەلسەفەی مێژوودا بەهیچ شێوەیەك خـوازراو

نیه ورەت دەکرێتەوە وناکرێت یەکێك تێڕوانینێکی پێشوەختانەی لا دروست بێت بەهۆی دەمارگیری بۆ ئینتمایەکی هزری، یاخود فەلسەفی، یاخود نەتەوەیی، یاخود ئاینی، یاخود مەزهەبی، یاخود ناوچەیی..هتد، لەبەرئەوە ئەم جۆرە حاڵەتە مرۆڤ تووشی چاوبەستەیی وگرێ کوێرەیی دەکات کە بەربەستن لەبەردەم گەیشتن بەڕاستییە مێژووییەکان، یاخود نزیك بوونەوەی لێیان. ئەوەش زاڵ بوونی لایەنی سۆز وعاتیفەیە بەسەر عەقڵ ومەنتیق لەنووسینی مێژوودا کە بەشێوەیەکی بەرچاو لەواقیعی ئەمڕۆی نووسینی مێژوودا ونووسینی مێژووی کورد هەستی پێ دەکرێت بەتایبەتی لەو کتێبە مێژووییانەی کە لەدەرەوەی ناوەندە زانستیە ئەکادیمیەکانەوە دەردەچن، هەرچەندە ئەمەش مانای ئەوە نییە کە هەرچی نووسین وتوێژینەوەیەك لەم نێوەندانە دەرچوبێت ئەوا تەواو ئەکادیمیی وبێ خەوشە.

زانایان وپسپۆڕان هەر لەکۆنەوە دەرکیان بەمەترسی دەرماگیری لەنووسینی مێژوودا کردووە وهانی ئەو کەسانەیان داوە کە خۆیان لەقەرەی نووسینی مێژوو دەدەن خۆیان بپارێزن لەم حاڵەتە، بۆ نموونە مێژوونوسی یۆنانی بەناوبانگ پۆلۆبیوس کە لەسەردەمی دووەمی پێش زاین ژیاوە، دەڵێت: پێویستە لەسەر ئەو کەسەی مێژوو دەنوسێت هەموو ئیعتبارو ئینتما وتایبەتمەندییەکانی خۆی لەلاوە دابنێت ئەگەرنا لەڕاستی لادەدات وپێی ناگات کە ئەمەش ئامانجی مێژووە ومێژوویی دوور لەڕاستی وەکو مرۆڤێکە چاوی لەدەست دابێت وایە ومێژووش گرنگیەکەی خۆی لەدەست دەدات وجگە لەچیرۆك وگێڕانەوەی ڕۆژەتیڤانە کە تام وچێژی خۆی هەیە چیتری لێنامێنێتەوە.

لەکۆتاییـــدا دەڵـێم ئەگــەر دەمــارگیری لەهــەر مرۆڤێکــی ئاســایی مەترسیداربێت ئەوا لەمرۆڤی مێژوونوس مەترسیدارترە ودەبێتەهۆی لەڕاستی لادان وچەواشـەکردن وچەسپاندنی هەڵە لـەبیر ومێشکی ئـەو کەسانەی کە نوسینی مێژوویی دەمارگیرکراوەکان دەخوێنەوە، جا ئایا؟ هەستی پێبکەین، یاخود نا. وە بێگومـان هـەرگیز مرۆڤـی دەمـارگیر نابێتـە(مێـژوونووس)ی پـڕ بـەمانای خـۆی، هەرچـەندە وا لـەخۆی تـێ بگـات وکەسـانێکیش هـەبن کـە لەفەلەکی ئەو بخوێنەوە وشایەتی زۆری مێژوونووسی بۆ بدەن.



# کۆمەڵەی رۆشنبریی مێژوویی کوردستان پردێك لەنێوان زانکۆ و دەسەلات و کۆمەڵگادا

م. فارس قادر فەقێ عەبدوڵلا

کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان هەنگاوێکە بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی کوردی، ئەگەر گلەیی لەوە دەکرا کە جۆرە درزێك کەوتۆتە نێوان زانکۆ وکۆمەڵگا و داوای نزیکبوونەوەی پتری نێوان دەسەلات وکۆمەڵگا دەکرا، ئەوە یەکێك لەهۆیەکانی دامەزراندنی کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان بریتییە لەوەی کە کەسانی ئەکادیمی بەزمانێکی سادە وساکار دیالۆگ لەگەڵ کۆمەڵگادا بکەن ومێژوو بەشێوە زانستی و ڕاستەقینەکەی بخەنە خزمەت سیاسەتمەداران و دەسەلات و بەم شێوەیەش کۆمەڵەکە ببێتە پردێك لەنێوان هەر سێ لایەنەکە، پسپۆڕانی بواری مێژوو لەزانکۆ خۆیان بەبەرپرسی بلاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی مێژوویی لە کوردستان بزانن و لەم پێناوەشدا هاوکارین لەگەڵ نووسەران و خەڵکانی مێژوودۆست تەنانەت ئەگەر نەخوێندەواریش بن، کۆمەڵگاش خۆی بە خاوەنی زانکۆ بزانێ و سەرکەوتنی خۆی لە سەرکەوتنی زانکۆ ببینێتەوە وخاڵی لاوازی زانکۆ بەکەم وکورییەکانی خۆی بزانێ وهەوڵی چارەسەرکردنی بدات، نەك وەکو ئێستا لەدەزگاکانی ڕاگەیاندن هەستی پێدەکرێ بەبەردەوامی هێرش بکرێتەسەر زانکۆ، پێویستە دەسەلاتیش پتر گوێی لەپسپۆڕانی مێژوو بگرێ وسوود وپەند لەوانەکانی

مێژوو وەربگرێ ولەڕاستیشدا سەرکەوتنی هەر سێ لایەنەکەش تاڕادەییەکی زۆر پەیوەستە، بەڕۆیشتن لەسەر ئەم ڕاستەڕێگایە، چونکە ئەگەر زانکۆ بە تەواوی لەکۆمەڵگا دابڕێ وخوێندن وتوێژینەوەکانی هیچ پەیوەندی بەکۆمەڵگاوە نەبێ و بەچاوێکی نزم سەیری کۆمەڵگا بکا وکۆمەڵگاش زانکۆ بە گەورەترین پرۆژە دانەنێ ویارمەتی مەعنەوی ماددی پێشکەش نەکا ودەسەڵاتیش باشترین توانا بۆ زانکۆ وزیاترین کات بۆ تێگەیشتن لەکۆمەڵگا وداواکارییەکانی تەرخان نەکات ئەوە دواکەتوویی زەقترین ئەنجامی بەدەستهاتوو دەبێ، بۆیە هیوادارین کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان ماڵی هەموو کوردبێ ودەسەڵاتی کوردی باشترین گرنگی بەم کۆمەڵەیە بدات وپێداویستیەکانی بۆ دابین بکات وڕاوێژی پێ بکات ویارمەتی دەربێ بۆ ئەوەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو فراوان بوون بچێ و لەم ڕێگایەشەوە سامانی نەتەوەیی مێژووی کورد لەناوەوەی کوردستان و دەرەوەی بپارێزێت و ببێتە بنکەیەك بۆ توێژینەوە لەبارودۆخی رابردووی کورد بۆ تێگەیشتن لە ئێستاو لەسەر ئەم بنەمایە بکرێت بەشێوەیەکی تەندروست مامەلە لەگەڵ هێزە هەرێمایەتی و نێودەولەتیەکان بکەین باشترین دەسکەوت بۆ نەتەوەکەمان بەدیبهێنن، تاوەکو هەموولایەکمان بەویژدانێکی ئاسودەبچینە بەردەم دادگای مێژوو ئەو دادگایەی حوکم بەسەر هەموو کەسێك دەدا و ئێمەش یەکەم کەس نین دەڵێین مێژوو بەزەیی بەکەس دانایەتەوە.

گوتاری

# ناسیۆنالیستی کوردی

م.سەلام ناوخۆش

## ١- ناسیۆنالیستی کوردی وژیانی حیزبایەتی

دەگوترێ کەناسیۆنالیستی دەرهاوێشتەی شۆڕشی فەرەنسی وئینگلیزی بێت، مارکسیەتیش گوتەنی ئەومەسەلەیە بزاڤێکی پاشکەوتووی سەرمایەدارییە، بەو واتایە ناسیۆنالیستی نەك هەر لەناو کورد بەڵکو لەجیهانی بەناو ئیسلامیش فۆرمی دروستی خۆی نیە. جارێ سەبارەت بەکوردەوە خودی مەسەلەکە زیاتر کاردانەوە بووە نەك کردار. هەتا تورك وعەرەب وفارس لەئیسلام هەڵنەگەڕانەوە لەبریتی دین پەسەندی کەلتوری دۆزی نەتەوەی خۆیان نەکرد کورد هەر باوەڕی بە" برایەتی" هەبوو. هەر لەسەدەی هەژدەهەمەوە ڕوناکبیرێکی وەك مەلا ئەحمەدی خانی دەرکی بەوە کردووە کە ئەو نەتەوە هاوسێیانە لەگەڵ کورد ڕاست نین . لەسەدەی نۆزدەهەمیش ڕوناکبیرێکی تر وەك حاجی قادری کۆیی هەمان بانگەوازی کوردانە " ئاڕاستەی میرانی کورد کردووە، بەڵام چەند دەسەڵاتی ئەو نەتەوانە لەگەڵی ڕاست نەبوونە ئەوەندەش (بەڵکو زیاتریش !) دەسەڵاتی خێڵەکی کوردی کەخۆی لەدام دەزگای میر وئاغا وشێخ دەنواند، لەگەڵ میللەتی خۆیان ڕاست نەبوینە. عەقڵی ئەوان تەنیا بەقەد قەڵەمڕەوییەکەی خۆیان بووە هەتا ناونیشانی میرنشینەکانیشیان تەواو دەلالەت لەو واقیعە دەکات: میرنشینی سۆران، میرنشینی بابان، میرنشینی بەهدینان، میرنشینی

ئەردڵان. ئەو میرنشینانە نەك هەر لەسەر بنەمای نەتەوەیی دانەمەزرا بوون، بەڵکو ڕێگریش بوون لەسەر پرۆژەی نەتەوەیی. چۆن ئێستا ئەو هەموو دەوڵەتە عەرەبییە نەتەوەیی نین، بەڵکو ڕێگرن لەسەر" یەکێتی عەرەب ".

لەو دوو سەدەیەدا ئاغاو بەگ ومیر وشێخی کوردی نەك هەر نەیانتوانیوە "کوردایەتی" لەناو کوردان بلاْوبکەنەوە، بەڵکو ململانێی خێڵەکی ئەو میرانە هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆش ڕەنگدانەوەیەکی نێگەتیڤی لەبیرکردنەوەی تاکی کورددا دروست کردووە.

هەرچەندە هەندێ لەڕوناکبیرانی کورد وەك ئیسحاق سکوتی وعەبدوڵلا جودت بەدامەزرێنەری کۆمەڵەی ئیتحاد وتەرەقی دادەنرێن، بەلاْم بەحوکمی ئەوەی ئەو حزبە کوردی نەبووە، بۆیە دامەزراندنی ئەو حیزبە بەدەستپێکی حزبی کوردی دانانرێ. هەندێ توێژینەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە یەکەم حزبی کوردی لەبەرایی سەدەی بیستەم دامەزراوە، حزبەکەش ناوی " عەزمی قەومی " بووە لەپاش ئەو حزبە لەگەڵ دەستپێکی سەرکەوتنی ئینقیلابی ١٩٠٨ هەندێ ڕۆشنبیری کورد وەك ئەمین عالی بەدرخان، عبدلقادر شەمزینی وخەلیل خەیالی وکەسانی دی چەندەها کۆمەڵە وحزبی کوردیان دامەزراندوە. کۆمەڵەی ( تەعاون وتەرقی کورد ) و(هێڤی ) و(پارتی دیموکراتی کورد ) بەدەستپێکی ژیانی حزبی کوردی دادەنرێت ئەو حزبانە ڕۆژ نامە وگۆڤاری زمانحاڵی خۆیان هەبووە بۆ ئەوەی " کوردایەتی" لەناو کۆمەڵەی کوردەواری بلاْوبکەنەوە. لەپاش ئەمانە چەندەها کۆمەڵە وحزب لەبەشەکانی کوردستان دروست بوون وەك کۆمەڵەی دارکەر، برایەتی، هیوا، شۆڕش، ڕزگاری، یەکێتی تێکۆشین، سەربەخۆی کوردستان لەباشوروباکور، خۆیبون، ژیانەوەی کوردستان ( ژ.ێکاف)، حزبی دیموکراتی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستان، کۆمەڵە، کۆمەڵەی مارکسی — لینینی، بزوتنەوەی سۆشیالیستی، پاسۆك، پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان،

یەکگرتن.

ئەو جۆرە حزبانە سەرپەرشتی چەندەها راپەرین وشۆرشی کوردیان کردووە لەوانە :

١- راپەرینەکانی شێخ محمود ١٩١٩ -١٩٣٢.
٢- راپەرینەکانی بارزان یەك ، دوو، سێ.
٣- راپەرینەکانی سمکۆی شکاك وسەید تەها.
٤- راپەرینی شێخ سەعیدی پیران ١٩٢٥.
٥- راپەرینی ئارارات ١٩٢٧ -١٩٣١.
٦- راپەرینی دەرسیم ١٩٣٦ - ١٩٣٨.
٧- راپەرینی دیموکراتی ئێران ١٩٤٥ -١٩٤٧.
٨- شۆرشی ئەیلول ١٩٦١ -١٩٧٥.
٩- شۆرشی گولان ١٩٧٦ - ١٩٨٨.
١٠- شۆرشی گەلی کوردستان ١٩٧٦ -١٩٨٨.
١١- راپەرینەکانی پ.ك .ك ١٩٧٨ .....؟

بێگومان هەرەس وپاشاگەردانی ونیسکۆ بەشی هەموو ئەو راپەرین وشۆرشانە بووە. هۆکارەکانی ئەو شکستانە لەهەموو قۆناغەکاندا بەزۆری هەروەك یەك بووە ئەوەتا شۆرشەکەی شێخ عوبەیدوللای نەهری لە١٨٨٠ بەهۆی کۆمەڵێك فاکتەری ناوەخۆ وتەبایی داگیرکەران (عوسمانی و ئێران ) وئیمپریالیزمی بەریتانی وروسیایی قەیسەری بووە، دوا شۆرشی کوردیش بووە قوربانی هەرسێ فاکتەری ناوەخۆ ( ململانێی حزبەکان ) وبوونی زیاتر لەسێ سەد فەوجی بەرگری نیشتیمانی (جاش ) تەبایی داگیرکەران لەسەرلێدانی بزاڤی کوردی، هەروەها دەسخەرۆکردن وپشت تێکردنی ئەمریکا وسۆڤیەت لەبزاڤی کوردیدا .

## ٢- قۆناغەکانی ناسیۆنالیزمی کوردی:

وەك ناسیۆنالیزم بەواتا ڕۆژئاواییەکەی هێشتا لەناو کورددا سەریهەڵنەداوە. دوو هۆکاری سەرەکی ئەگەری ئەم دیاردەن:

یەکەم : لەکوردستاندا هەرگیز ڕیفۆرمی دینی وەك بزوتنەوەییەکی سۆسیۆدینی سەریهەڵنەداوە، هەتا ئەو بزاڤە مارکسی وشیوعەیەتەی کەلەسەدەی ڕابردوودا بەشێکی زۆری وڵاتی گرتبووە، هەر لەچوار چێوەی حزب وڕوناکبیراندابووە نەك وەك سیستەم وبونیکی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی.

دووەم : بەحوکمی ئەوەی کوردستان وولاتێکی کۆلۆنیاکراو بووە، بۆیە ئیستعماری ناوەخۆ وایکردووە کوردستان وەك هەرێمێك لەچاو بەشەکانی دی عێراق، ئێران، تورکیا، سوریا پاشەکەوتووتر بێت وبەگۆڕانی کۆمەڵایەتی سروشتی تێپەڕنەبێت.

جا ئەوەی پێی دەوترێ " ناسیۆ نالیزمی کوردی " بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، دەکرێ ئەوبزاڤە لەچەند قۆناغێك کورت بکەینەوە:

١- قۆناغی ڕوناکبیری کوردی: ئەم قۆناغە مەلا ئەحمەدی خانی ١٦٥٠ - ١٧٠٧ سەرقافلەیەتی وحاجی قادری کۆیی ١٨١٧ - ١٨٩٧ تەواوکەری ئەو بزاڤەیە. مەسعود محەمەد وجەمال نەبەز وئەمیری حەسەن پور وهەژاری موکریانی، ئەو ڕوناکبیریەیی خانی وکۆیی بەدەستپێکی ناسیۆنالیزمی کوردی دادەنێن .

٢- سەرهەڵدانی بنەماڵەکان وەك بنەماڵەی بەدرخانیەکان وبنەماڵەی شێخ عوبەیدڵلا شەمزینی .

٣- بزافی مەشرووتیەی ئێران ومەشروتیەی تورکیا. ئەو دوو بزاڤە دەرفەتێکی چاکیان بۆ کورد ڕێکخست کەروناکبیرانی کورد وەك فارس وتورکەکان "حزبی کوردی "دابمەزرێنێت. ئەو قۆناغە، قۆناغی حزب

دروستکردن، بۆتە دەستپێکێك بۆ قۆناغی ئایندەی کورد. لەو قۆناغەش ڕوناکبیرانی هەردوو بنەماڵەی بەدرخان وشەمزینی دەورێکی سەرەکیان بینیوە لەدروست کردنی ڕێکخراو وحزب وکۆمەڵەی ڕۆشنبیری ودەرکردنی ڕۆژنامە وگۆڤار.

٤- حوکمداریەتی شێخ محمود.

٥- سەرهەڵدانی مارکسیەت هەرچەندە هەرزوو ئەو تەرزە فیکرە لەگەڵ عەبدوڵڵا جودت هاتۆتە ناو بزاڤی کوردییەوە بەلام وەك بەرنامە لەعێراق وباشوری کوردستان دروستبوونی حزبی شیوعی بەپلە یەك و"ڕزگاری " و" شۆڕشی " "هیوا " بەپلە دوو گۆڕانێکی لەچەمکی ناسیۆنالیزمی کوردیدا دروست کردووە .

٦- دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران وپارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق.

٧- هەرەسی ئەزمونی تاك حزبی (پارتی ) لەباشور و(دیموکرات ) لەڕۆژهەلات دامەزراندنی پ.ك.ك لەباکور. لەو قۆناغەدا چەندەها حزبی مارکسی،قەومی، ئیسلامی دروست بوون، بەلام ئەو ئەزموونەش لەگەڵ ڕاوەستانی شەڕی کەنداوی یەکەم ناسراو بەشەڕی عێراق وئێران لەساڵی ١٩٨٨ دووچاری هەرەسێکی جوزئی بوو.

لەو حەوت قۆناغەدا ناسیۆنالیزمی کوردی زۆری هەر لەقۆناغی " ڕزگاری نیشتیمانی " دابووە، هەرچی قۆناغی هەشتەمە، قۆناغی پەرلەمان وحکومەتی دەستوری کوردییە. هەندێ نوسەر لەژێر کاریگەری حزبی ئەم قۆناغەش بەدرێژەپێدەری قۆناغی شەش وحەوت دادەنێن، بەلام لەڕاستیدا ئەم قۆناغە. تەحصیلی حاسیلی هەندێ گۆڕانکاری نێونەتەوەیی وەك ڕوخانی مارکسیەت وبلۆکی ڕۆژ هەلاتی کۆمۆنیستی، گۆڕانکاری هەرێمی وەك ئاکامەکانی شەڕی کەنداوی یەکەم لەسەر عێراق وهەرەسی عێراق لەشەڕی

کەنداوی دووەمدا ڕزگارکردنی بەشێکی باشوری کوردستان ودروست بوونی بۆشایی سیاسییە لەهەرێم.

## ٢- ناسیۆنالیستەکانی هاوسێ وناسیۆنالیزمی کوردی

### ١/ ناسیۆنالیزمی تورکی:

لەدوای بزاڤی دەستوورخوازی عوسمانی ١٩٠٨، باڵی پان – تورکیزم کەپێکهاتبوو لە( ئەحمەد ڕەزا، تەلعەت پاشا، ئەنوەر پاشا، جەمال پاشا، دەستی لەباڵی – عوسمانیزم ستاند ئەو باڵەی تەرەقی تەنیا پەسەندی ڕەگەزی تورکیان دەکرد وبانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە زوو تورکەکان خۆیان لەعەرەب جودابکەنەوە. لەژێر کاریگەری جولەکەی وەك لۆملی وبرنارد لویس ودەیڤد گۆهێن، تورکەکان وەهمێکیان بۆخۆیان دروستکردبوو وەك "ڕەگەزی تورك لەڕەگەزی هەموو گەلانی تری ڕۆژئاوایی چاکتر وپاکترە".

لەسەردەمی کەمالیەکاندا، کە لوتکەی ناسیۆنالیستی تورکی بوون، تاك وولاتی تورکیایان لەمێژووی پێنج سەد ساڵەی موسڵمانێتی دابڕی. ئەمەش لەو گروپە چاوەڕێ دەکرا چونکە ئەو بزاڤە لەکۆمەڵگەیەکی نائیسلامی لەدایك ببوو زێدی دەرەوەی بزاڤەکە فەرەنسا بوو لەناوەوەشی ناوچەی سلانیکی جولەکەنشین بوو. تورکەکان زۆر باوەڕیان بەنموونی ناسیۆنالیزمی فەرەنسی وئیتاڵی وئەڵمانی هەبوو. ئەو بزاڤانەش تەواو دژە دین بوون. هەر لەو ڕوانگەوە مەرجی سەرەکی بەریتانیا وفەرەنسا هەڵوەشاندنەوەی "خەلافەتی ئیسلامی" بوو. لەئاکام ساڵی ١٩٢٣ کەمالیەکان یەکەم دەوڵەتی قەومی عەلمانیان لەتورکیا دامەزراند. لەساڵی ١٩٢٤ خەلافەتی ئیسلامیان هەڵوەشاندەوە وئەلف بای عەرەبیان ڕەتکردەوە وئەلف بای لاتینیان سەپاند.

ناسیۆنالیزمی تورکی هەتا دەرکەوتنی حزبی ڕەفا تەواو دژە ئیسلام بوو.

ئەو ئەزموونەی تورکیا هەتا کۆتایی ساڵانی هەشتا وبەراییەکانی نەوەد درێژەی کێشا، ئەویش هەروەك چۆن " ناسیۆنالیزمی ستالین بەپەیڕەوی مارکسیەت " هەرەسی هێنا ئەویش هەرەسی هێنا، بەڵام لەحزبی ڕەفاوە هەتا حزبەکەی ئەردۆگان تورکەکان جارێکی تر ناچاربوون ئاوڕ لەئیسلام بدەنەوە بەو ئەزموونەش دووسێ جار توانیان دەسەڵاتی حکومەت لەناسیۆنالیزمی قەومی بستێنن. ئەو بیرۆکە ناسیۆنالستی ئیمپریالییە چونکە لەسەر بنەمایەکی ڕەگەزی دامەزراوە هەر بەڕووخانی ڕیفۆرم دەکرێ نەك بەتەعدیلکردنی ڕواڵەتی. سەبارەت بەکوردی باکور هیچ گۆڕانێکی نەوعی لەدەسەڵاتی (قەومی عەلمانی )، ( قەومی ئیسلامی ) ڕووی نەداوە ڕووش نادات چونکە ئەو تەرزە بیرە لەڕاژەی مرۆڤایەتی مرۆڤدا نییە.

**٢- ناسیۆنالیزمی عەرەب:**

هیچ نەتەوەیەك بەقەد عەرەب سودی لەئیسلام وەرنەگرتووە. لەڕووی شارستانیەوە نەتەوە نەبووە بەقەد عەرەب دواکەوتوبوون، بەڵام بەم ئیسلام بوونە باشترین نەتەوە نەك لەڕووی ڕەگەزەوە، بەڵکو لەڕووی ئینسانیەوە. بەڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عەباسی عەرەب توشی چەندەها پاشاگەردانی سیاسی وکۆمەڵایەتی وروشنبیری بوون. ئەو هەموو پاشاگەردانیەش ژێدەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەڵگەڕانەوەی دەسەڵاتی عەرەبی لەئیسلام وخودانە عەرەب پەسەندی ودنیاویستی سەرانی عەرەب.

بەلاوازی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش، ڕۆژهەلاتناس ومسیۆنێرەکان هەروەك چۆن تورکەکانیان هاندا پەیڕەوی ناسیۆنالیزم بکەن بەهەمان شێوەش عەرەبەکانیان هاندا کە لەدژی دەسەڵاتی عوسمانی شۆڕش بەرپا بکەن. کەسانی وەك لۆرانس وژەنەڕاڵ لۆرد ئەلنبی دەوری سەرەکیان بینی لەوروژاندنی هەستی عەرەبێتی وهاندانی سەرانی عەرەب لەدژی خەلافەتی

ئیسلامی. لۆرد ئەلنبی خۆی دەنوسی: ئەگەر یارمەتی سوپایی عەرەب وکرێکارە عەرەبەکان نەبووایە، نەماندەتوانی سەرکەوتن بەسەر دەوڵەتی عوسمانی بەدەست بێنن "بەحوکمی ئەوەی عەرەب خۆیان (بەزەنی خۆیان) بەمیراتگری ڕەسەنی ئیسلام دەزانن، بۆیە هەتا بڕاقی ئیسلامی غەیرە عەرەبیشیان زۆر پێ قەبوڵ نییە. سەبارەت بەسیاسەتکردنی عەرەبێەتیش ئەوە عەرەبە نەسرانیەکانی سوریا ولوبنان لەلایەك وئەو عەرەبانەی کە لەزانکۆی ئەمەریکی لەبەیروت دەیانخوێند، هەروەها ئەو عەرەبانەی لەقوتابخانە تەبشیرییەکانی سوریا ولوبنان ومیسر پێگەیشت بوون بزوێنەری ناسیۆنالیزمی عەرەبی بوون. لێرەدا بەپێچەوانەی تورکەکان، عەرەبەکان زیاتر پەسەندی ناسیۆنالیزمێکی ڕووکەشکراو بەئیسلامیان پەسندکرد. ئەمەش پەیوەست بوو بەو کەلتورە پڕ سەروەریەی عەرەب لەمێژووی ئیسلامدا هەروەها لەنیشتمانی عەرەبیدا سێ شوێنی زۆر پیرۆز هەن وەك مەککە ومەدینە وقودس. لەوپێوەندگەوە گوتاری ناسیۆنالیستی عەرەبی لە"شەریف حوسێنەوە" تاکو "سەدام حوسێن" گوتارێکی "نیفاقی دینی" پێوەیە. هەرچەندە ئەو گروپە ناسیۆنالیستە تەواو دژ بەدینن. سەدام حوسێن زۆربەی سەرانی ئیخوانی موسلمین – عێراقی لەناو برد، یان زیندان کرد، ئەسەد ئەوەی لەدەستی هات دژی موسڵمانەکانی سوریا بەکاریهێنا. لەمیسریش دەسەڵاتی عەرەبی هەردوو ڕوناکبیری عەرەبی" حەسەن بەننا " و "سەید قوتب" یان کوشت. ناسیۆنالیستی عەرەبی ئەوە هەڵوێستی بوو لەبەرامبەر" موعارەزەی عەرەبی" ئەدی لەنیشتمانی عەرەبی ئەو زومرەیە توندترین سیاسەتیان لەبەرامبەر" موعارەزەی غەیرە عەرەبی" بەکارهێناوە: کورد، ئەمازیغی وقیبتی بەشی هەرە زۆریان لەو ستەمە قەومی ودینی یە بەرکەوتووە.

**٢- ناسیۆنالیزمی فارسی:**

فارسەکان لەدوای ڕووخاندنی ئیمپراتوریەتی میدی – کوردی خۆیان بەخاوەنی یەکەمی هەر شارستانیەکی (ئاریان ) دادەنێن. چۆن عەرەب بەئاسانی نەبوونە موسڵمان هەتا هەرسیێ شەڕە دێرینەکەیان: (بەدر)و (ئوحد) و(خەندەق) یان( ئەحزاب)یان لەگەڵ ئیسلام نەکرد، فارسەکانیش هەتا شەڕی (نەهاوەند) و(مدائین) و(قادسیە) ...هتد، لەگەڵ ئیسلام نەکرد نەبوونە موسڵمان. چونکە ئەو شەڕانە لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب بوون، بۆیە کە بوونە موسڵمانیش مەزهەبێکیان هەڵبژارد کە لەمێژوودا ناسراوە بە(شیعە) ئەوشیعانەش بوونە دوژمنی سەرسەختی عومەر هەتا عومەریشیان شەهیدکرد. ئەو کەلتور ومێژوو وشارستانیەی ئێران، فارسەکانی ئێران هەردەم خۆیان بەساحێب دادەنێن. لەهەموو قۆناغەکانی دەسەڵاتی فارسی (سەفەوی) و(قاجاری) و(پادشایی) و(ئیسلامی) مەزهەبیەت ڕواڵەتێکی سەرەکی ئەو دەسەڵاتە بووە. هەندێ باوەڕیان وایە کەفارسەکان لەسەردەمی ڕەزا شای پەهلەوی بەدروستی لەساڵی ١٩٢٥ دەوڵەتێکی قەومییان دامەزراندووە، بەڵام لەڕاستیدا سەفەوییەکانیش هەر ناسیۆنالیست ومەزهەبی بوون، شەڕی چالدێرانیش هەر تەنها شەڕێکی مەزهەبی نەبووە، بەڵکو شەڕێکی قەومیش بوو. هەر لەدوای ئەو شەڕەش ڕۆژهەڵاتی کوردستانیان بەیەکجاری کەوتە ژێر دەسەڵاتی سەفەوییەکان.

ووشەی "ئێران" سەبارەت بەدەسەڵاتی فارسیەوە، ووشەیەکی هەڵخەڵەتێنەرە. لەنەزەری خۆیان(ئێران) واتە: ووڵاتی(فارسەکان) چونکە هیچ غەیرە فارسێك لەئێران بەقەد فارسێك مافی نییە. هەرچی کورد وبلوج وتورکمان وعەجەم هەیە لەدەستوری دەوڵەتی ئێستاش وەك نەتەوەیەکی جیا لەفارس پێناسەیەکیان بۆ نەکراوە، بەڵکو هەریەکە بە(هاوڵاتییەکی) ئێرانی دانراون. ڕەگەزنامەی ئێرانی –ش بەواتای ڕەگەزنامەی فارس دێ

بۆیە ئەگەر کچێکی فارسی شوو بەغەیرە ئێرانیەك بکات هەتا لەئێرانیش دابنیشێ قەت ڕەگەزنامەی ئێرانی نادەنە پیاوەکە بەڵکو هەر حسێبی (غەوارە)ی بۆدەکەن!

ئەم جۆرە ناسیۆنالیزمە کە ناسیۆنالیزمێکی مەزهەبیشە لەگەڵ هەردوو ناسیۆنالیزمی تورکی وعەرەبی، ناسیۆنالیزمی ناسروشتین. سەرانی ئەو سێ ناسیۆنالیزمە لەسەر بنەمایەکی کۆلۆنیالیستی دامەزراون وهیچ ڕەگێکی مەدەنی وئینسانی لەو سێ ناسیۆنالیزمە داین هەتا ئێستاش لەقەڵەمڕەوی دەسەڵاتیاندا نەتەوەی خۆیان بەباڵادەست وزۆر بەرزوو پیرۆز دادەنێن هەرچی نەتەوەکانی تری وڵاتەکەن بەهاوڵاتی پلەدوو وسێ دادەنێن، هەربۆیە د. اسماعیل بێشکچی دەنووسێ ئەوانەی دوژمنکارن وسروشتی بزوتنەوەکانیان ناوەڕۆکێکی ئیمپریالیستی ئیستعمارییان هەیە.

**٤- ناسیۆنالیزمی جولەکە:**

هەرچەندە جولەکە هاوسێی کورد نین، بەڵام لەمێژوودا ماوەییەکی زۆر لەکوردستان وتورکیا وئێران ژیاون. ئەو ناسیۆنالیزمە ڕواڵەت وئەدگارێکی تایبەتی هەیە. لەگەڵ هی ناسیۆنالیزمێکی تردا بەراورد ناکرێ. ئەو ناسیۆنالیزمە زیاتر لەسەر بنەمای دین دامەزراوە نەك نەتەوەیی. ڕاستە ئیسرائیل دەوڵەتێکی قەومی – دینییە، بەڵام ڕەگەزی جولەکە فرەڕەگەزە. جولەکە هەیە کوردە، عەرەبە، ڕووسییە، پۆلەندیە، مەغریبیە، ئینگلیزییە، فەرەنسییە. ئەمانە ئەوەی کۆیان دەکاتەوە دینە نەك تەنها نەتەوە. نەتەوە لەنەزەر ئەوان " ئومەیە" خۆشیان وەك لەقورئاندا هاتووە بە" شعب الله المختار " دادەنێن.

ناسیۆنالیزمی جولەکە لەوە بەناسیۆنالیزمی عەرەب وتورکی وفارس دەچێ کە بنەمایەکی ئیمپریالیستی ئیستعماری هەیە. بەڵام ئەوان بەوە

لەدەسەلاتی ناسیۆنالیستی عەرەب وتورکی، فارس جیا دەکرێتەوە (قەوم ) و( دین )ی خۆیان بەسەر کەس داناسەپێنن. هەروەها شەڕی ئەوان لەگەڵ عەرەب شەڕێکی دینی یە نەك قەومی. بەواتای کە ئەوان بانگەشەی(دین) دەکەن، ئیشیش بە(دین ) دەکەن هەرچی هەرسێ ناسیۆنالیزمەکەی ترن نە ئیسلامینە، نە عەلمانینە. کورد واتەنی لەسەر هیچ دینێك نین! !

## ٥- ناسیۆنالیزمی کوردی:

ناتوانین ناسیۆنالیزمی کوردی بەپێوەری هیچ کام لەناسیۆنالیزمانە شرۆڤە بکەین چونکە ئەم ناسیۆنالیزمە نەتەواو ناسیۆنالیزمەکەی نەتەوەیی وەنە ناسیۆنالیزمێکی دینی، یاخود مەزهەبییە. لەسەردەمی ڕوناکبیرانی وەك (خانی ) و(حاجی قادری کۆیە) فۆرم وناوەڕۆکی ئەم ناسیۆنالیزمە ڕوحێکی دین ئاراستەی دەکرد. ڕاپەرینەکانی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری وشێخ محمود وشێخ سەعید وبارزان بە ڕێژەییەکی زۆر لەسەر ئەم شێوازە بووە. ڕاپەرینەکەی دەرسیم ١٩٣٦ –١٩٣٨ وێرای مەسەلە قەومیەکە، ئەگەر وفاکتەری مەزهەبی (عەلەوی) یش لەپشت ئەو ڕاپەرینەوە بوو. ئەو جۆرە ناسیۆنالیزمە پەیوەست بەعەقلیەت وبزوێنەری سەرکردەکانی ئەو ڕاپەرینە بووە کە زۆربەی هەرە زۆری سەید شێخ یان مەلا بوونە وزۆربەی کۆمەڵی کوردەواریش ئەوسا گوێڕایەڵی ئەو زاتە شۆڕشگێڕانە بوون.

لەقۆناغی دەسەلاتی تاکلایەنی پارتیش ١٩٥٨-١٩٧٥ بەحوکمی ئەوەی سەرکردایەتی لەدەست مەلا مستەفای بارزانی بوو، هەرچەندە زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی مارکسیش بوون، بەلام خەڵك زیاتر لەگەڵ بەرەی مەلا مستەفا دابوون نەك هیچ بەرەی تر ... بەواتای خەڵك زیاتر "مەلایی" بوونە نەك "حزبی" هەرچەندە لەو زەمەنە جەماعەتی"کاژیك " هەبوون بانگاشەی "سەربەخۆیی" و"دەوڵەتی کورد"یان دەکرد، بەلام

کاریگەری ئەوانە لەناو خەڵك زۆر سنورداربوو. لەدوای هەرەسی ١٩٧٥ هەموو حزبە کوردییەکان تێڕوانینی تریان بۆ ناسیۆنالیزم ودین هەبوو. حزب نەبوو لەبەرنامەیاندا بەندێك لەسەر (مارکسیزم) ولینزم " ی تێدا نەبێ تەنیا پارتی سۆشیالیستی کورد نەبێ ئەوانە تارادەییەکی زۆر زیندووکەرەوەی بەرنامەی (کاژیك) بوون. لەقۆناغی ١٩٧٦ -١٩٨٦ حزبەکان ئەوەندە خەریکی (جیابوونەوە) و( شەڕی یەکتر ) بوون نیو ئەوەندە خەریکی پرۆژە قەومیەکەی کورد نەبوون، بەڵام خۆیان لەهەمان گێژەنی ١٩٧٥ دۆزییەوە، بەڵکو زیاتریش. ئەو "ناسیۆنالیزمە" "ناسیۆنالیزمێکی ستالینی " بوو بەهیچ جۆرێ دین لەبەرنامەکەیدا جێی نەدەبۆوە. لەدوای پاشاگەردانیەکەی گەورەترین کارەساتی لەدوای خۆی بەجێهێشت لەسەردەمی دەسەڵاتی پەرلەمان و حکومەتیش ١٩٩١-٢٠٠٦ ناسیۆنالیزمی کورد دەسەڵاتدار فۆتۆکۆپیەکی دروستی ناسیۆنالیزمی تورکی وعەرەبییە. عەرەبەکان ئەوە سەدەیەك زیاترە نەوە لەدوای نەوە بە"عروبە" فرچك دەدەن کەچی تاکی عەرەب ئەوەندە لەدەسەڵاتی عەرەبی بێزارە(چونکە هیچی نییە) لەگێژەیەك دەژی هەر پێڵاوەکەی بەووڵاتەکەیەوە دەیبەستێتەوە. ئەمڕۆ سەدەیەك زیاترە شتێك نییە پێ بوەترێ (بەرهەمی عروبە !) غەیرە ماڵوێرانی قەومی، دینی، کەلتوری وڕۆشنبیری وئابوری! تورکەکانیش ئەوە سەدەیەکە خۆیان لەئیسلام دابڕیوە وهەموو خەمیان ئەوەیە " لەبازاڕی یەکێتی ئەورووپی " وەربگیرێن. ئەو تورکیایەی بەشێکی ئەورووپای لەژێر دەست بوو ئەمڕۆ لەئەورووپا حسێبی دەوڵەتێکی بچووکی ئەورووپی بۆناکەن !!!

ناسیۆنالیزمی نوێی کوردیش خۆی لەحکومەتێکی حزبیدا مۆڵداوە ناوێرێت خەون بەدەوڵەتێکی بچوکی کوردیش تەنیا لەباشوری ووڵاتەوە ببینێت! ئەگەر مەسەلە دەوڵەت بێت ئەوە عەرەب زیاتر لەبیست دەوڵەتیان هەیە کەچی ڕوناکبیری عەرەبی یان لەهەندەران لەکەلتورێکی دوورە کەلتوری خۆی

ژیان دەگۆزەرێنی یان ئەوەتە لەزیندانە...

ئەوەی تر کە لەوولات دەژین ئەوە "ڕووناکبیری حزبن نەک وولات ومیللەت" ئەو تورکیایەیی کەبانگەشەی دیموکراسیەت دەکات هەموو لیبرالیەکەی بەرگەی ڕاپیەکانی بێشکچی ناگرێ! ناسیۆنالیزمی کوردیش هێشتا نەیتوانیوە لەچوار چێوەی ئەزموونی عەقلیەتی ناسیۆنالیستی عەرەبی وتورکی دەربچێ. گەورەترین نەهامەتی ئەو ناسیۆنالیزمە (بێ بەرنامەیی) (بێ پرۆژەیی)"یە.

ئەو ئەزمونە فۆتۆکۆپیە گوتارەکەشی هەر لەگوتارەکەی ناسیۆنالیزمی عەرەب وتورکی دەچێت، ئاگای لەوە نییە زەمەنی ئەوە بەسەر چوو هەرچی (حزب) پێبڵێ ڕاست بێ وبێ بیرکردنەوە وتێڕامان خەڵك وەریگرێ. ئەو نەوەیەی ئێستا ئەوەندە قێزی لەو گوتارە دەبێتەوە کە ئیرادەی دەدزێ ومێشکی لەقالب دەدا، بۆیە دەیەوێ لە"تەلیسمی تەلقین"دەربچێ ومتەلەقیەکی ئاکتیف بێ وتواناى خودی هەبێ ڕەخنە لەهەموو شتێ بگرێ. ئەو نەوەیەش هەر حزب بەئەزموونی تاڵی خۆی دروستی کرد، حزب دەزانێ "هێشتا ساواین "و" چوار دەورەمان دوژمنە " هێشتا کاری خۆی دەکات !! ئەو گوتارە وەهمیە هەر خۆی خۆی هەڵوەشاندەوە هەروەك چۆن لەعەرەبستان وتورکیا وهەڵوەشایەوە!

## ٢- ڕیفۆرمی ناسیۆنالیسزمی کوردی:

لەمێژوودا هیچ ناسیۆنالیزمێك لەغەیری نەهامەتی وکارەسات هیچی تری بۆ نەتەوە وولاتەکەی نەهێناوە، هەروەها ئەو بزاڤە بۆتە کارەسات بەسەر هاوسێکانیشیدا. ئەوەتا ناسیۆنالیزمی ئەڵمانی کەخۆی لە" نازیەت " و عەقڵی هیتلەر " دا دەدیت، چ کارەساتێکی بەسەر ئەڵمانیا وبەشێکی زۆری ئەورۆپا ودەوروبەری ئەورۆپا هێناوە. بەهەمان شێوە ناسیۆنالیزمی ئیتاڵی

فاشیەت ومۆسۆلۆنی چ نەگبەتیەك وپاشەگەردانیەكی دووچاری ئیتالْیا كرد.

لەمەدا دەردەكەویٚ كەناسیۆنالیزم واتای " خۆشەویستن ودابینكردنی خۆشگوزەرانی نەتەوە ناگەیەنیٚ وەك سەرانی بانگەشەی بۆدەكەن ، بەلْكو لەخشتەبردنی تاكەكانی نەتەوەیە. هەروەها ناسیۆنالیزم نەك بزاڤێكی ئینسانی نییە، بەلْكو لەكەدار كردن وپێشێلكردنی حورمەت وریٚز ومافی هەر مرۆڤێكە. لەهەمووش گرنگتر، ناسیۆنالیزم بەربەستێكە لەبەرامبەر هەر پێشكەوتن وڤەژینێكی شارستانی وژیاری!

ویٚرای ئەمانەش ناسیۆنالیزم پالْنەریٚكی سەرەكی ئیمپریالیزمە ئەوەتا ئەوروپییەكان چیان بەسەر گەلانی ئاسیا وئەفەریقیا هیٚنا. هەندیٚ " جاش قەلەم " ئەو هەموو داگیركردنانە بەپێویسیەكی میٚژوویی دادەنیٚن وهەروەها بانگاشەی ئەوە دەكەن كە داگیركردنی میسر وجەزائیر مەغریب ولیبیا لەلایەن ئینگلیز وفەرەنسا كاریگەریٚكی پۆزەتیڤی لەسەر ڕەوشی سیاسی وكۆمەلاْیەتی شارەكانی عەرەب وعەقلْیەتی ڕوناكبیری عەرەب هەبووە !!

لەڕاستیدا ئەو داگیركاریانە بیٚجگە لەدروستكردنی هەندیٚ عەرەبی عەقلْ ئیستعماری وویٚرانكردنی هەموو تایبەتمەندییەكی كلتوری ئەو ولاْتانە هیچی تری لیٚنەكەوتەوە.

ئەوروپییەكان لەژیٚر كاریگەری مرۆڤسالاری دەستبەرداری ئەو بیرە نامۆیە بوونە مەگەر لەچەند وولاتێكی ئەلْمانی وفەرەنسی وئینگلیزی نەبیٚ !! ئەوانە كەخۆیان لەو عەقلْیەتە ڕزگاركرد توانیان ڕووی ڕەشی باپیرانیان بەچەندەها پرۆژەی ئینسانی سپی بكەنەوە !

لەسایەی " توركایەتی " چ میللەتێك بەقەد تورك پاشكەوتوە؟ كەمالیەكان ئەوە سەدەیەكە وایان لەتاكی تورك كردووە كە جگە لەتوركی گرنگی بەچیتر نەدەن. هەموو شتیٚ لەتوركیا بەتوركییە! هەموو فیلمەكان دەبلەجەی توركی دەكریٚ، بۆیە هیچ كەنالیٚك بۆ فیٚربوونی زمانێكی غەیرە

تورکی لەتورکیا دانیە لەنێران وتورکیا هەتا پسپۆڕەکانی بواری پزیشکی ئینگلیزی باش نازانن. ئەوانە چونکە خویان بەو خۆپەسەندییە گرتووە، بۆیە هەتا ئەیارە ئیسلامیە دەسەلاتدارەکەی، کەخۆی لەحزبەکەی ئەردۆگان دەنوێنێ ناتوانێ وەك ئیسلامیەکی تەواو مامەلە لەگەلّ کورد بکات. ئەوان خۆیان بەریفۆرمێکی ناسیۆنالیزمی دادەنێن، بەلام جگە لەرووکەشکردنی تورکایەتی بەئیسلام چیتر نییە. ئەگەر پاساوی ئەوان بۆ( PPK ) مارکسیەتەکەیەتی ئەوا خۆشی بەشی خەلکی باکوری کوردستان تەواو پەیڕەوی ئیسلام دەکەن؟! خودی مەسەلەکە ئەوەیە تورکەکان ناتوانن خۆیان لەدێوەزمەی تورکایەتی رزگار بکەن. هەر ئەو خۆرزگار نەکردنەیە بۆتە هۆکار وپاساوێك بۆ ئەوروپیەکان کەتورکیا لەیەکێتی ئەوروپا وەرنەگرن!

هەتا دەسەلاتی تورك بەو عەقلّیەتە بیربکاتەوە ئەوە سەدەییەکی تریش لەبازنەی بۆش دەسوڕێتەوە. ئاکامیش مەرگەسات بەشی تاکی تورك وکورد دەبێت. ناسیۆنالیزمی عەرەب هەتا ئەو سەرکردانەی لەدەسەلات بن، چاوەڕێی هیچ ریفۆرمێکی جدی لێناکرێ چونکە دەسەلات وعروبە بۆتە عەقلّیەت، عەقلّیەتیش بەئاسانی ناگۆڕدرێ. سەرانی ناسیۆنالیستی عەرەب لە٩٩,٩٩٪ کەمتر رازی نین. سەیر لەوە دایە جاش قەلەمەکانی نیشتمانی عەرەب ئەمە بەخۆشەویستی خەلك بۆ دەسەلات لێکدەدەنەوە، نازانن ئەوە هەر دەسەلات خۆیەتی ئەو ژمارەیە بۆ سەرۆکەکەی دادەنێ. جا ئەگەر ئەمە فێرعەونیەت نەبێ چییە، چونکە هیچ پێغەمبەرێك لەناو گەلەکەیدا هەرگیز ئەو رێژەیەی نەهێناوە! هەروەك بەناو زیاتر ملیارێك " موسلّمان " هەیە ئایا خوای گەورە ودادوەر وکاربەجێ لەو ملیار " موسلّمانە " چەند دەنگ دەهێنێ ؟! باوەڕ ناکەم نیو ملیار موسلّمان لەخوا رازی بێت! ئەگەر رازی بێ دەبێ بەرنامەی خوا بالا دەست بێ، ئەمڕۆ لەچەند وولاتێکی عەرەب

بەرنامەی خوا کاری پێدەکرێ ؟! ئایا تەنیا نوسینی برگەی " ئیسلام ئاینی ڕەسمی دەوڵەتە " یان " ئیسلام سەرچاوەیەکی سەرەکی تەشریعی وڵاتە " یان " ئیسلام یەکێ لەژێدەرە سەرەکییەکانی یاسای وڵاتە " ئەمانە جگە لەخەفڵاندنی خەڵکی سادە هیچی تر نییە !

دەسەڵاتی ناسیۆنالیزمی عەرەبی بانگەشەی " ئیسلامەتی " خۆی دەکات، بەڵام هەر کۆمەڵە وتاکێکی ئیسلامی تەواو پەیڕەوی ئیسلام بکا وهەوڵبدا خەڵك بانگ بکا بۆ ئیسلامەتی ئەو دەسەڵاتە ئەگەر نەیکوژێ لەزیندان هەموو گیانی دەرزێنێ! وەك وتمان، عەرەبایەتی ڕەگێکی لەفیرعەونیەتە جگە لەخۆی کەسی تر نابینێ. لەقەڵەمڕەوییەکەیدا شتێك نییە بەناوی " ئەویتر ! " ئەفسوس بەشێك لەو ڕەوتە ئیسلامیەی عەرەبی چونکە هێشتا خۆی ڕزگارنەکردووە لەخێوی " عروبە "، بۆیە لەبەرامبەر مافەکانی کورد زۆر بیرتەسکانە گوتار ورەفتار دەکەن. دەبێ نەزانن کە لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا هەرگیز شتێك بوونی نییە بەناوی " گەلی سەردەستە " وگەلی ژێر دەستە " هەروەها دەبێ چاك نەزانن کەئەوەی بۆ عەرەبێکی موسڵمان هەیە دەبێ هەمان شتیش بێ جیاوازی گەردێك بۆ کوردی موسڵمانیش هەیە. وەبزانم ئەوان هێشتا دەرك بەماهیەتی ئیسلام ناکەن، بەڵکو زیاتر گرنگی بەهەندێ ئەزمونی تاڵی بەناو ئیسلام لەمێژوودا دەدەن، بۆیە واچەقبەستوون وئەو سەری تونێلەکە بەڕوونی نابینن !!!

هەرچی ناسیۆنالیزمی کوردییە بەشێکی بەناوی " کوردایەتی " کورد نەماوە گێژو وکاسی نەکەن. چۆن جاران هونەر بۆهونەر هەبووە ئەوانەش کوردایەتی لەپێناو کوردایەتی دەکەن نەك پرۆژەییەکی نەتەوەیی ستراتیژیان بۆکورد پێبێت! باوەڕ ناکەم کەس بەقەد کورد خوێنی لەپێناو " کوردایەتی " دابێ، کەچی هەر لەمیر بەدرخانەوە بگرە هەتا ڕاپەرینی ١٩٩١ بەشی کورد هەرپاشا گەردانی بووە. هۆکارەکانی پاشگەردانی زۆر ڕوونن : ڕۆژئاوا +

داگیرکاران + دەسەڵاتی کوردی خۆی!

لەدوای ڕاپەڕین ئومێدێکی زۆر لای تاکی کورد دروست بوو بەوەی حکومەتێکی مەدەنی کوردی دامەزرا! بەڵام بەحوکمی ئەوەی ئەوانەی حکومیەتیان بەڕێوەدەبرد هەر بەعەقڵی چیا مامەڵەیان لەگەڵ ئەو دەزگا مەدەنییەکرد بۆیە نسکۆ لەدوای نسکۆ وبێ ئومێدی ڕووی لەتاکی کورد کرد. دەسەڵاتی قۆرخ کرا بۆ بابای حزبی ناشایستە زۆربەی شوێنە شیاوەکانی دەسەڵاتی مەدەنی لەپەرلەمان وحکومەت وزانکۆ بەکەسانی حزبی پڕکرانەوە، خەریکە دام ودەزگاکانمان بەدەردی دام ودەزگاکانی سەردەمی ڕژێم دەچن. گەنجێکی زۆر ئەوە پازدە ساڵە بەرەو ڕووی مەرگی حەتمی دەبێتەوە بۆ ئەوەی بەس ڕزگاری بێ لەفەزای دەسەڵاتی ناسیۆنالیزمی کوردی!!

ئایا دەسەڵاتی کوردیش دەتوانن وەك ڕۆژئاواییەکان ڕزگار یان بێت لەخێوی "ناسیۆنالیزمی " وپرۆژەیەکی حەزاری ئینسانی پێشکەش بەکورد بکەن یان هەروەك عەرەب وتورك وهەر لەبازنەی بۆش دەسوڕێنەوە ؟! ئەوە باخۆیان بەکردەوە نەك بەقسە بەوەلام بێن !

بەکورتی خۆم هەمان ڕای مەلا سەعیدی کوردی کەناسراوە بەشێخ سەعیدی نەورەسیم هەیە کە دەڵێ :" نزیکەی پازدە ساڵە من دەیهێنم ودەیبەم و بیرم لای ئەم مەسەلەیە وگەیشتوومەتە دووئامانجی گرنگ، لام وایە تەنیا دوو شت چارەنوسی کوردستان دیاری دەکەن ، یەکێتی نەتەوەیی وهۆشیاری ئاینی .... د.جەبار قادر چەند بابەتێکی کوردناسی _ ل١٤

ئەوە ڕای شێخ سەعید بووە بۆ بەرایی سەدەی بیستەم بەتایبەتی بۆ قۆناغی دوای مەشرووتیەتی تورکیا ١٩٠٨. لەخوێندنەوەی خۆشم بێجگە لەپەسەندکردنی ڕای شێخ، ئێمەش لەپاش ڕاپەڕین ئەوە پازدە ساڵە کورد باجی ئەو دووشتە سەرەکییە دەدات کار بۆ یەکێتی نەتەوەیی ناکات...

ئەوەی بەو ناوە دەکرا هەر کوردایەتی بۆ کوردایەتییە نەک بۆکورد هەرچی هۆشیاری ئاینییەکەیە. لەوەشدا زۆر کلۆلین هەرگیز لەمێژوودا نەمانتوانیووە سوود لە ڕوحی ئیسلام وەربگرین. دین ئەوەی هەبووە تەنیا وەک عادات وعیبادەت وەرمان گرتووە، لایەنە سەرەکیەکەمان فەرامۆشکردووە.

# رۆڵـــی
# (ولي الدين ابو احمد زرعة بن عبدالرحمن بن حسين) ی
# کوردی لە زانست و قەزادا
## (٧٦٢ك-٨٢٦ك)

پ.د. ارسن موسى رشيد
د. محەمەد عەبدوڵلا کاکە سوور

## پێشەکـــی:

ســـەردەمی مێـــژووی کـــوردی ئیـــسلامی بـــە یـــەکێك لەســـەردەمە دەوڵەمەندەکانی مێژووی کوردی دادەنرێ. جا ئەگـەر بەشـی زۆری مێـژووی کوردی ئیسلامی لە دوو توێی نامەی ماستەر و دکتۆرا لێکۆڵینـەوەی لەسـەر کرابێ، ئەوە هێشتا هەندێ لایەنی گرنگی مێژوویی کوردی ئیسلامی پێویستی بـە لێکۆڵینـــەوە هەیـــە، بەتایبـــەتی بـــە دیارخـــستنی ڕۆڵـــی کەســـایەتیە بەناوبانگەکانی کورد کە ڕۆڵیان هەبووە لە مێژووی ئیسلامیدا.

بەشێك لەگرنگی هەر بابەتێکی لێکۆڵینەوە لەوەدایە کە بابەتەکە نوێ بێت لە بارەی لێکۆڵینەوە لەپێشتردا گرنگی پێویستی پـێ نـەدرابێ، یـەکێك لـەو خاڵانەش کە لەکاتی باسکردنی مێژووی کـورد زۆرجـار دەخرێتـەڕوو بریتییـە لەوەی کە کورد بەشێوەیەکی گشتی کەم گرنگی بـە تۆمـارکردنی مێـژوو داوە، هەر بۆیە ئەومێژونوسانەی لەنێوکورددا دەرکەوتوون جێگای گرنگـی و بایـەخ پێدانن.

هەر لەم ڕووەوە " ئیبن خەلەکان" وەك زانا ومێژونوسـێکی کـورد کـە لـە سەردەمەکانی دوایی دەوڵەتی عەباسی ژیاوە ومێژووی نوسیوە ناوبانگێکی

زۆری پەیداکردووە، هەر بۆیە لەلایەن ئەو کوردانەی کەلەسەدەی بیستەم تایبەت بەمێژووی کوردیان نوسیوە بەیەکەم دانراوە لەناو کورد دا مێژووی نوسیبێ و بەرهەمەکانی لەبەردەست دابێت.

بەلاّم لە ئەنجامی گەڕان بەدوای سەرچاوە مێژووییەکان بۆمان دەردەکەوێت کە ولی الدین احمد بن عبدالرحیم کە ئەویش کوردە و خەڵکی "کوردستانی عێراق"ە، ناسناوی بە (( ئبین لعێراقی)) هاتووە وەك " ئیبن خەلەکان" کە کورد بووە خەڵکی هەولێر " کوردستانی عێراق" بووە، تەنانەت مێژوونووس و قازیش بووە تەنانەت (قاضی القضاة) واتە قازی قازیان بووە. بەلاّم جیاوازی لەوەدایە کە ئیبن خەلەکان لەسەدەی شەشەمی کۆچی مردووە، بەلاّم ئەم مێژونووسەی باسی لێوەدەکەین لەسەدەی نۆی کۆچی مردووە. هەروەها لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆر نووسینی لەدوا بەجێ ماوە بە پێویستمان زانی بیکەینە بابەتی لێکۆڵینەوە بۆ ڕوونکردنەوەی لایەنێکی گرنگ لە مێژووی کورد ئەویش گرنگی دانی کوردە بەمێژوو. بەتایبەتی کە ئەم بابەتە لەلایەن کوردەوە فەرامۆش کراوە یاخود لێکۆڵینەوە سەبارەت بەم مێژوونووس و قازی یە بەناوبانگە، گرنگی پێ نەدراوە. تەنانەت ئەو نووسەرە عەرەبانەی کەباسیشیان لێوەکردووە وبەرهەمەکانیان خستوتەڕوو زیاتر وەکو کەسایەتێکی "عێراقی" نەك کورد، خستویەتیانە ڕوو.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە زیاتر و بەپلەی یەکەم سوود وەرگیراوە لە کتێبی " الذیل العبر فی خبر من عبر" کە لەلایەن (صالح مهدی عباس) پێداچوونەوە ولێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. نووسەر لە پێشەکی کتێبەکەدا بە باشی لەسەر

ژیانی ((ولی الدین))ی نووسیوە، سەرەڕای هەندێ سەرچاوەی تر کە لە لیستی سەرچاوەکان ڕێکخراون.

لە کاتی نووسینی ئەم باسە تووشی گیروگرفتی کەمی سەرچاوە بەشێوەیەکی گشتی بووین، بەڵام پاش هەوڵ و کۆشش وماندوو بوون توانرا کە سەرچاوەی پێویست بەپێی توانا دابین بکرێ، گیروگرفتێکی تر بریتی بوو لەوەی لە کاتی نووسینی باسەکە بەزمانی کوردی چۆنیەتی نووسینی ناوەکان و هەندێ پلە وپایە دەهاتە ئاراوە، بەڵام ئێمە بەباشمان زانی ناوەکان بەشێوەی عەرەبیەکەی نەك کوردییەکەی بنوسین، هەروەها زۆربەی جار پلەوپایەکانیش هەر بەشێوازی دەربڕینی لە زمانی عەرەبی تۆمار کراون تاکو ڕوون و ئاشکرا تر بێت، بەتایبەتی کە لە زمانی کوردیدا هەندێ لەو پلە وپایانە ووشەی کوردی بەرامبەر پڕ بەپێستیان بۆ نەدۆزراوەتەوە.

لە کۆتایی دا هیواردارین کەتوانیبێتمان لایەنێکی بەسودی مێژووی کورد بخەینەڕوو کەئەویش بەشداریکردنی کەسایەتیەکی کوردە لەبورای مێژوونوسی وشارستانیەتی ئیسلامی، هەرچەندە هەموو کارێکیش بە تەواوی لە کەم وکوڕی بەدەر نابێ، بەڵام هیوادارین کە بەچاوێکی زانستی و ئەکادیمیانە سەیر بکرێ، تەواویش هەر بۆ خودای گەروە و میهرەبانە.

## ژیان و ڕەچەڵەکی:

ناوی (ولی الدین ابو زرعه)[1] احمد کوڕی عبدالرحیم کوڕی حسین ی کوڕی عبدالرحمن))ە کە لە ولاتی میسر بە (ابن عیّراقی) بەناوبانگ بووە[2]. بەڵام ڕەچەڵەکی کوردی یەولەعەشیرەتی مەهرانی[*] کوردی بەناوبانگە[3]،

ئەوەی بەدیاردەکەوێ کە کوردبوونی هیچ گومان نیە، بەڵگەش گەڕانەویەتی بۆ سەر ئەم عەشیرەتە کوردییە بەناوبانگە، تەنانەت مێژوونوسیکی ئیسلامی بەناوبانگ ((مقریزی)) [4] مەهرانی بە عەشیرەتێکی کوردی بەناوبانگی سەردەمی خۆی داناوە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە بەڕوونی دیار نەخراوە کە سەر بەچ ناوچەیەکی عێراق بووە.

بەڵام دەکرێ مەزەندە بکەین کە مەهرانی لە ناوچەکانی سەرەوەی هەولێر بوونە، کەچی ئەو زانا ومێژوونوسەی باسی لێوەدەکەین خۆی ولەپێشتریش باوکی لە قاهیرە نیشتەجێ بوونە، هەر لە قاهیرەش لەڕۆژی دووشەممە یەکی ذوالحجەی سالی ٧٦٢ک لە دایك بووە. مێژوونووسەکان باس لەوەدەکەن کە بنەماڵەکەیان بە زانست وزانیاری بەناوبانگ بوونە، واتە لە باوك وباپیریەوە خۆشەویستی وویل بوون بەدوای زانستی بۆ ماوەتەوە لەم رووەوەش سەبارەت بەگرنگی دانی بنەماڵەکەی بە زانست ((ئبن عماد الحنبلی)) باسی باپیری دەکا و دەڵێ حافیزی کوڕی شێخ الاسلامی کوڕی شێخ الاسلام بووە، هەروەها بەردەوام دەبێ و دەڵێ کە ئیمامی کوڕی ئیمام بووە [5] کە ئەمەش بە دیاری دەخات چەندە ناوبانگی زانست و زانیاریان گەورە بووە.

سەبارەت بە دایکیشی؛ عائیشەی کچی طغای دایکی ولی الدین ابو زرعە بووە کە وەکو باس دەکرێ ژنێکی زۆر باش و خێرکەر بووە و حەزی لە زانست کردووە، بۆیە گوێبیستی زۆر لە زانایان بووە و زانستی لێ وەرگرتوون لەگەڵ مێردی چووەتە مەککەومەدینە ولەوێش خەریکی زانست وەرگرتن بوونە، لە دوای گەڕانەوەشی لەساڵی ٧٨٣ک مردووە. ئەمەش وای لە نووسەری لێکۆڵەرەوەی کتێبی (الذیل) کردووە بڵێ کە بنەماڵەی ئەم زانا و

مێژوونووسە خەریکی زانست وزانیاری بوونە ولەڕووی زانستەوە پلەوپایەکی بڵندی هەبووە، وهەر لە منداڵیەوە لەسەردەستی باوکی کە یەکەم مامۆستای بووە دەستی بەخوێندن وزانست وەرگرتن کردووە. هەروەها لەسەر دەستی چەندین شێخی بەناوبانگ زانستی وەرگرتووە، کە گرنگترینیان (ابو الحرم القرامیس) (المحب ابة الغباس الخلاطی)یە، کەوا پێ دەچێت ئەمەی دواییان زانا و شێخێکی کورد بێت بەتایبەتی کە خەلآت ناوچەیەکی کوردی یە لە کوردستانی تورکیای ئێستا، لە مامۆستاکانی تری شهاب کوڕی عطار، العز بن جماعە، ابن نباتە[6] ناویان دێ.

ئەوەی جێگای سەرەنجە ئەم کەسایەتیە کوردییە هەر لەمنداڵیەوە لەگەڵ باوکی بەرەو شام کۆچی کردووە بۆ ئەوەی لەسەردەستی زاناکانی شام بخوێنێ و ئیجازە وەربگرێ، هەروەها چۆتە، (بیت المقدس) لەو زانایە بەناوبانگانەی کە لە وولآتی شام دەرسیان پێگووتوە (علاء الدین العرضی ابن الجوخی، وابن شیخ الدولة) ناویان هاتووە، هەر لە تەمەنێکی بچوکیشەوە قورئانی پیرۆزی ئەزبەرکردووە. هەر لە منداڵیشەوە حەزی لە پرسیارکردن لە زانا و شێخەکانی مامۆستای کردووە بەمەبەستی فەتوا دەرکردن، ئەوەی جێگای سەرەنج و گرنگی خۆشی هەیە کە ئەم زانایە و مێژوونوسە سودی لە مامۆستایەکی کوردی تر وەرگرتووە کە ئەویش (ناصر الدین محمد کوڕی علی کوڕی یوسف کوردی)یە کە لەساڵی ٧٨١ك مردووە[7].

هەر لە منداڵیشەوە لەگەڵ باوکی چۆتە مەککە ومەدینە ولەدوای هاتنەوەشی هەر بەردەوام بووە لەزانست وزانیاری وەرگرتن ساڵی ٨٢٢ك جارێکی تر چۆوەتەوە مەککە بەمەبەستی حەج کردن، سەفەری ئەم جارەی

ئـەنجام داوە. و خـەریکی مـەجالیس و دەرس (وانـە) ووتنـەوە بـووە[8]. شێخەکانی و قوتابیەکانی زۆر بە باشی باسیان کردووە و ووتویانـە کـە حـافز بووە و زانا بووە و( ابن تغری بردی) دەڵێ: کە ئیمام فقیە زانابووە. هەروەها زۆر زیرەك و زۆرشتی تر ئەزبەر کردووە، سەخاوی لە کتێبی (الـضوء اللامع) باسی دەکا کە زۆر قسە ڕەوان بووەو، وتاربێژێکی زۆر گەورەش بووە.

## قوتابیەکانی:

لەوانەی کە قوتابی ئەم زانا کوردە بوونە لـەدوایی بوونەتـە زانـای ئـابینی گەورە، صالح مهدی عبـاس نـاوی ٢٢ زانـای گـەورەی هێنـاوە و باسـی لێوە کردوون، ئەم قوتابیانەشـی لـە ناوچـەی ئیسلامی جیاجیـاوە هـاتوون وەکـو مغـرب وشـام و قـاهیرە وفەڵەسـتین و بەغـداد[9]. واتـە تایبـەت نەبوونـە بـە ناوچەیەکی دیاریکراوەوە.

## پلەو پایەی خوێندنی:

ئـەم زانـا کـوردە لەسـەرەتا دەسـتی کـردووە بـە دەرس ووتنـەوە لـە قوتابخانـەکانی قـاهیرە، تـاکو مـابوو لـەم قوتابخانـە دەرسـی وتۆتـەوە (قوتابخانـەی ظاهریـة، قوتابخانـەی قانبیهیـە، قوتابخانـەی القراسـنقریە، قوتابخانەی جمالیە، قوتابخانەی فاضلیة) لە مزگەوتی ابن طولونیش دەرسـی وتۆتەوە، سەرەڕای دەرس ووتنەوە لە هەندێ قوتابخانەی تریش[10].

## پلەوپایەی قەزایی:

وەلی الدین ابو زرعە احمد ئەو زانا کوردە وەکو ئیبن خەلەکان پلەوپایـەی قەزایی وەرگرتووە، لەسەرەتادا لە ساڵی ٧٩٣ك بووەتە جێگری قـازی (عمـاد الدین احمد بن عیسی)[11]، پاشان هەر لەمیسر بووەتە قازی ناوچـەی منـوف،

بەڵام گەورەترین وەزیفەی قەزایی لە ساڵی ٨٢٤ك وەرگرتووە کاتێك کە شا (ظاهر ططر) خۆیی هەڵبژاردووە ببێتە قازی قازیانی هەموو وڵاتی میسر[١٢]، وە لەو پایەدا مایەوە تا ماوەیەکی باش، بەڵام دوای دەرچوونی لەم پایەدا بە ماوەیەکی کەم مرد، هەروەها سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کە ئەم زانایە ببوو بە شێخی شێخانی تەسەوف لە قوتابخانەی جمالیەدا[١٣].

## چۆنیەتی بوونی بە قازی قازیان لە وڵاتی میسر:

پێشتر باسمان کرد کە ئەو زانایە کوردە ناوبانگێکی باشی هەبوو، ئەمە و داوێن پاکی و ڕاستگۆیی و ڕووخۆشیو باسکردنی بە (باشترین خەڵکی سەردەمی خۆی)[١٤] و شارەزایی زۆری لە بواری قەزادا بە ڕادەیەك بوو کە ناو وناوبانگی لەسەر زاری خەڵکی دابووە، بۆیە سوڵتانی مملوکی (کۆیلەمەند) شا ظاهر زۆر زۆر ئارەزووی لەوەبوو کە وەلی الدین ابو زرعە احمد بکرێ بە قازی قازیانی وڵاتی میسر[١٥]. لە ساڵی ٨٢٤ك پاش مردنی (جلال الدین عبدالرحمن) قازی قازیانی پێشووتری وڵاتی میسر سوڵتانی مملوکی دەنێرێ بە دوای ئەم زانا کوردە وداوای لێ دەکات کە ئەم پایە وەربگرێ کە پایەی لەلایەن کەسایەتیەکی وا گەورەوە دەخرێتە بەردەم ئەم زانایە گەورە داوێن پاکە بەبێ ترس بە سوڵتان ڕادەگەیەنێ کە ئەو مەرجی خۆی هەیە بۆ ئەوەی بە وەرگرتنی ئەم پایە گرنگ وهەستیارە ڕازی بێ، کاتێکیش سوڵتان داوای لێ دەکات مەرجی خۆی بخاتە ڕوو، دەڵێ: (مەرجەکە ئەوەیە کە هیچ لە گەورە پیاوانی میسر بە هیچ جۆرێك و بەهەربیانوو و مەبەستێك دەست لە کاروباری قەزا وەرنەدەن وداوا وئارەزووی خۆیان بەسەر قەزادا نەسەپێنێن، سوڵتانیش ئەم مەرجەی قبوڵ دەکا و بەقازی قازیانی هەموو وڵاتی میسری دادەنێ[١٦]،

دیارە ئەم مەرجەی ئەم زانایەش دایناوە بە دیاری دەخا کە تا چ ڕادەیەك دەست پاك وچاو نەترس بووە وچاوی لە ماڵی دنیا نەبووە وهەق و دادگەری لە پلەوپایە ومال و سامان زۆر بەرزتر داناوە تەنانەت ئامادە نەبووە پایەیەکی گرنگ وەربگرێ ئەگەر لە پێشتردا بەڵێنی دەست لە کار وەرنەدانی پێ نەدەن.

کاتێکیش کە ئەم گرنگە وەردەگرێ زۆر توندوتیژ وهەق پەروەر بووە بەرامبەر بە هەرکەسێك، هەر چەندە خاوەن دەسەلات وسامان و دەستڕۆیشتووش بێ، بەتایبەتی میرەکانی مەمالیك (کۆیلەمەندەکان) کە بەدەست وەردان لەکاروباری قەزا ڕاهاتبوون. بەلام وەکو سەرچاوەکان باسی دەکەن کە زۆر لە گەورە پیاوان و دەسەلاتدارانی میسر دلگران بوون بەوەی کە گوێ بە هەوڵەکانیان بۆ دەست لە کاروباری قەزا وەرنەدەدرا بۆیە کارەکانی قازی قازیانی میسریان بە باش ناوەزەند نەدەکرد، کاتێکیش بەم هەلوێستەی ئەوانی زانی دەستی لەکارکێشایەوە، بەلام کاتێك شا ظاهر ططر بەمەی زانی تکای لێکرد بگەڕێتەوە سەر کارەکەی خۆی و ئەویش تا شا ظاهر لەژیان دابوو لەسەر کاری قازی قازیان بەردەوام بوو، هەر کە شا ظاهریش لە مانگی ذوالحجەی ساڵی ٨٢٤ك کۆچی دوایی کرد[١٧]. و لەدوای ئەو سوڵتان شا (شرف برسبای) هاتە سەرحوکم لەسەرتادا بەردەوام بوو لە کاری خۆی، بەلام میرەکانی دەوڵەتی مملوکی هەوڵی دەست تێوەردانی بەردەوامیان هەبوو لەکاروباری قەزادا و ڕێگای لێگیرانیان بەهۆی ئەم زانایە زۆر پێی ناخۆش بوو، بۆیە دەستیان کرد بەنانەوەی چەندین پلان وبەهۆی هەوڵ وتەقەلای زۆریانەوە لەلای سوڵتان توانیان لەساڵی ٨٢٥ك لە پایەی

قازی قازیان دەرپەڕێنن[١٨].

**مـــــــــردنی:**

پاش دەرهێنـانی لە قـەزادا ئـەو زانا کوردە بـە تـەواوی لـە دەسـەڵات و پلەوپایـە دوورکەوتـەوە، چونکە زۆر لای گران بـوو کـە بـە زۆری ولەڕێگـەی پلانـەوە دەرهێنـرا لـەم ڕووەوە (ابـن عمـاد الحنبلـی) دەڵـێ: ئـەم زانایـە بـەردەوامی دلگرانـی خـۆی دەردەبـڕێ کـە قوتابیـەکانی ببوونـە هۆیـەك بـۆ دەرهێنـانی لـە قـەزادا و دەیگـووت خۆزگـە لـە ڕێگـەی هـەر کەسـێکەوە دەربهاتمایە، بەڵام لە ڕێگەی قوتابیەکانمەوە نەبووایە و ئەوکاتە ئەوەندە پێم ناخۆش نەدەبوو ئەوەندەش دلگران نـەدەبووم و ئەوکەسانەی کە لـە کـاری قەزادا دەریانهێنابوو بەنەزانی دەزانین، کە ئەمەش مایـەی زیاتر ناخۆشی و دلگرانی بوون[١٩].

پاش دەرهاتنیشی گەڕاوەتەوە سەر نووسین وتاکو مردنی نووسینی زۆری نووسیوە، سەبارەت بەمردنیشی صالح مهدی عباس لـە کتێبـی (الـذیل) ١٧ی شەعبانی ساڵی ٨٢٦ك بە ڕۆژی مردنی دادەنێ، کە دەشمرێ لەلای باوکی لـە قـاهیرە دەنێـژرێ، لـەکاتی ناشتنیشی خـەڵکێکی زۆر لـە پیـاوە گـەورەکانی دەوڵـەت لـە قـازی وزانـا وقوتابیـەکانی وخـەڵکانی تـر لەگـەڵ تەرمەکـەی ڕۆیشتوون تا ناشتنی لە گۆڕستانی تەشتەر قاهیرە[٢٠].

**نووسینەکانی:**

ئەگـەر بێـت و سـووکە بـەراوردێکی نێـوان ئـەو زانـا و مێژوونوسـە وئـیبن خەلەکان بکەین بۆمان دەردەکەوێ لەڕووی مێژوونوسیەوە ئیبن خەلەکان بە کتێبی (وفیات الاعیان) ناوبانگی دەرکردووە، بەڵام وەلی الدین ابو زرعە احمد

بە کتێبی مێژوویی (الذیل علی العبر فی خبر من عبر) ناسراوە. دیارە ئەم کتێبەش هەر لەسەر مێژووی ئیسلامیەوە باسی زانایانی پێش خۆی دەکا هەروەها نووسەر چەندین کتێبی تری داناوە. (صالح مهدی عباس) لە پێداچوونەوەی کتێبەکەی ناوی ٤٧ کتێبی نووسیوە هەندێکی چاپ کراون و هەندێکیشی بەدەستنووس ماوەتەوە، ئێمەش لێرەدا ناوی هەندێکیان دەخەینە ڕوو بۆ ئەوەی پێشانی بدەین کە زانایەکی چەند گەورەیە و چەندین کتێبی لە دوا بەجێماون و وەك گەواهیەکی چەسپێنراویش دەیانخەینە بەرچاو لەوانە:

١- الاجوبة المرضية عن الاسئلة المكية

٢- اخبار المدلسين.

٣- تحرير الفتاوى على التنبية والمنهاج والحاوى.

٤- تراجم رجال منهاج الاصول.

٥- حل الرموز وكشف الكنوز.

٦- شرح سنن ابى داود.

٧- كتاب ما ضعف من احاديث الصحيحين.

٨- كتاب في الاحكام.

٩- مختصر الكشاف للزمخشري.

١٠- الحكم بالصحة والحكم بالموجب.

١١- تذكرة المفيدة (کە چەند بەرگێکە).

١٢- الدليل القويم على صحة جمع التقديم.

١٣- النكت على الايضاح في المناسك للنووي[٣١].

**دەرئەنجام:**

لە دوایی لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە بۆمان دەرکەوت:

١- (ولی الدین ابو زرعە احمد) بنەچەکەی کوردە و عەشیرەتەکەشی مەهرانی یەك لە عەشیرەتە گەورەکانی کوردە، واشپێدەچێ کە هەر لە مێژەوە ناوچەی خۆیان جێهێشتووەو لە قاهیرە(میسر) نیشتەجێ بوونە.

٢- ئەم زانایە لە خێزانێکی ئایینی گەورە بووە، ئەو خێزانەش خزمەتێکی زۆری پێشکەش بە زانست کردووە و بۆیە نازناوی گەورەی وایان هەبووە کە بە هەموو کەسێك ناوترێ.

٣- ئەم زانایە شارەزایەکی زۆری لە بواری قەزادا هەبوو، خزمەتێکی زۆری ئەم بوارەی کردووە، هەر بۆیەش پایەی (قازی قازیان)ی هەموو ولاتی میسری وەرگرتووە.

٤- ئەم زانایە زۆر چاو نەترس بووە بەڕادەیەك کە سوڵتانی مملوکی کاتێك داوای لێدەکات ببێتە قازی قازیانی میسر ئەو مەرجی خۆی دەخاتە ڕوو بۆ وەرگرتنی ئەم کارە.

٥- هەر چەندە ژمارەیەکی زۆر قوتابی پێگەیاندووە، کە هەندێکیان پلەو پایەی گرنگیان گرتۆتە ئەستۆ و خزمەتی گرنگی ئایینی زانستیان کردووە، بەلام ئەوەی جێگای داخیشە هەندێ لە قوتابیەکانی دەستیان هەبووە لە دەرکردنی لە پایەی (قازی قازیان)ی میسر.

## پەراوێزەکان:

(1) عبدالكريم محمد المدرس، علماءنا في خدمة العلم والدين، ط1، بغداد، 1983، ص41.

(*) فائزه محمد عزەت بە مارانی ناویان دەهێنێ کە دەڵێ لە خوارەوەی موسڵ واتە سەروەی هەولێر هەبوونە. فائزه محمد عزەت، الكرد في اقليم الجزيرة وشهرزور في صدر الاسلام، رسالة ماجستير غيرة منشور، مقدمة الى كلية الاداب جامعة صلاح الدين، ص35؛ د.ارسن موسى رشيد، الهذبانيون ودورهم السياسى والعسكرى في القرن الخامس الهجرى، مجلة متين، العدد(64)، 1997، ص114.

(2) ابن عماد الحنبلي، شذرات الذهب في اخبار من ذهب، بيروت، لا.س، ج7، 173 ؛ ولى الدين احمد ابن عبدالرحيم الكردي، الذيل على العبر في خبر من عبر، تحقيق وتعليق:صالح مهدي عباس، بيروت، 1989، ج1، ص7 ؛ ابن تغردي بردي، النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، ج14، ص ص204-205.

(3) ولى الدين ابو زرعة احمد، المصدر السابق، ج1، ص7.

(4) المقريزي، السلوك الدول والملوك، القاهرة، 1934، ج1، قسم1، ص3.

(5) شذرات الذهب، ج7، ص173.

(6) ولى الدين ابو زرعة احمد، المصدر السابق، ج1، ص9.

(7) المصدر نفسه، ج1، ص12.

(8) المصدر نفسه، ج1، ص14.

(9) المصدر نفسه، ج1، ص ص25-28.

(10) ابن عماد الحنبلي، المصدر السابق، ج7، ص173 ؛ ولى الدين ابو زرعة احمد، المصدر السابق، ج1، ص19-23.

(11) ابن عماد الحنبلي، المصدر السابق، ج7، ص173 ؛ السخاوي، الضوء اللامع لاهل القرن التاسع، ج1، ص342.

(12) ولى الدين ابو زرعة احمد، المصدر السابق، ج1، ص25 ؛ ابن عماد الحنبلي، المصدر السابق، ج7، ص173.

(13) ولى الدين ابو زرعة احمد، المصدر السابق، ج1، ص25 ؛ السخاوي، المصدر السابق، ج1، ص339.

(14) ابن عماد الحنبلي، المصدر السابق، ج7، ص173.

(١٥) ابن تغردي بردي، المصدر السابق، ج١٤، ص ص١٩٨-٢١٠.

(١٦) ولى الدين ابو زرعة احمد، المصدر السابق، ج١، ص٢٨.

(١٧) ابن تغردي بردي، المصدر السابق، ج١٤، ص ص١٩٨-٢١٠ ؛ ابن عماد الحنبلي، المصدر السابق، ج٧، ص١٦٦.

(١٨) ولى الدين ابو زرعة احمد، المصدر السابق، ج١، ص٢٩.

(١٩) المصدر السابق، ج٧، ص١٧٣.

(٢٠) المصدر السابق، ج٧، ص١٧٣ ؛ ولى الدين ابو زرعة احمد، المصدر السابق، ج١، ص٣٠.

(٢١) ولى الدين ابو زرعة احمد، المصدر السابق، ج١، ص ص٣١-٣٢.

## سەرچاوەکان:

١- ابن تغردي بردي، النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، القاهرة، ١٩٦٣.

٢- ابن خلكان، وفيات الاعيان، تحقيق: دكتور احسان عباس، بيروت، ١٩٧٧.

٣- ابن عماد الحنبلي، شذرات الذهب في اخبار من ذهب، بيروت، لا،س.

٤- السخاوي، الضوء اللامع لاهل القرن التاسع، القاهرة، ١٩٣٤.

٥- المقريزي، السلوك لمعرفة الدول و الملوك، القاهرة، ١٩٣٤م.

٦- ولي الدين ابو زرعة احمد، الذيل على العبر في خبر من عبر، تحقيق وتعليق: صالح مهدي عباس، بيروت، ١٩٨٩.

## سەرچاوە نوێیەکان:

١- عبدالكريم محمد المدرس، علماءنا في خدمة العلم والدين، ط١، بغداد، ١٩٨٣.

## گۆڤار:

١- د.ارسن موسى رشيد، الهذبانيون ودورهم السياسى والعسكرى في القرن الخامس الهجرى، مجلة متين، العدد(٦٤)، ١٩٩٧.

**الخلاصة:**

يتناول هذا البحث شخصية كوردية بارزة في التاريخ الاسلامي وهو (ولى الدين ابو زرعة احمد بن عبدالرحيم بن حسين الكردي (٧٦٢-٨٢٦هـ) الذي خلف آثارا علمية ضخمة اهمها (مؤلفه في التاريخ).

وقد تطرق هذا البحث الى حياته وبين انه ينتمي الى اسرة من "كوردستان العراق" بيد انه سكن مع ابيه مصر، وتتلمذ على نخبة من العلماء المسلمين الكبار من بينهم مجموعة من العلماء الكورد، واخذ عنه طائفة من التلاميذ العلوم والمعارف بحيث اصبح بعضهم فيما بعد علماء كبارا.

ولم تقتصر اهتماماته على عملية التأليف فحسب بل كان له دور كبير في مجال القضاء، اذ قلد منصب قاضي قضاة مصر في فترة زمنية معينة، وكان معروفاً بالنزاهة والعفة والعدل، إلا ان مجموعة من تلاميذته اشتركوا في مؤامرة خطط لها امراء المماليك في مصر وتم على اثرها عزله عن منصب قاضي قضاة مصر مما كان له اثر كبير في استيائه لانه عزل من منصبه بوساطة بعض تلاميذته وبعض الجهلاء وبسبب التزامه بالعدل واستقلاله في الحكم وعدم سماحه للامراء بالتدخل في شؤون القضاء.

**Abstract**

This research is about (Wali Aldin Abu Zura Ahmad bin Rahim bin Hussyn Alkurdy) he was a famous in Islamic history in the period ٦٦٢-٨٢٦H. He left a Hague scientific traces as (Mualfa fi Al Tarikh).

This research penetrates in to his live and proved that he was from a Kurdish Family in Iraq Kurdistan but he lived in Egypt with his father. He took his studies from the great scientist among them were serial kurdis scientist. Some of studies got science and education from him and later they become important Scholar His interest's doesn't restricted in the mechanism of Editing Operation he played a big role in the field of Justice. So he was appointed as (Kadi Kudhat) of Egypt in a specific period of time, In his position he was Know as a descent, pure and justice but a group of his student participated in a polt planed by the princess of (Almamaleek) in Egypt so he was deprived from his position as Kadi Kudhat in Egypt. This Conspiracy had great effect on his, because of his deprived from his position by some of his student and his independence and did not allowed the princess interfere in juridical affairs.



# ڕۆڵی کورد
# لەبزووتنەوەی خەواریج لەسەردەمی دەوڵەتی ئومەویی دا (٤١ ك-١٣٢ك)

نەهرۆ اسماعیل زەندی

## پێشەکی :

خەواریج یەکەم گروپە لەمێژووی ئیسلامدا بەدەرکەوتوونە، ئەوانە لەسەرەتایی سەرهەڵدانیان وەکو گروپێکی ڕادیکالی دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی تەحکیم چونکە هەمووکاروچالاکیەکانیان لەوسەردەمەدا دەستی پێکردووە، ئەگەر ئەمانە بگەڕێنێنەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەر (د.خ) ئەی پێغەمبەر بۆهەوڵی چارەسەرکردنی بۆ نەداوە..؟؟

بەمجۆرە پەیدابوونی ئەم گروپە، وەکو یەکەم گروپی ڕادیکالی بۆ شەڕی صەفەینی (صفین) نێوان سوپای عەلی وسوپای ئومەویەکان دەگەڕێتەوە، کە تێیدا ئەندامانی ئەم گروپە ووتوێژیان ڕەتکردەوە، بەڵام خەباتی سەرەکیان بەبەردەوامی لەدژی ئومەوییەکان بەڕێوە دەچوو، بیانووی راستەوخۆی جیابوونەوەشیان لە سوپای ئیمام عەلی ڕەتکردنەوەی ووتوێژ بوو لەگەڵ ئومەوییەکاندا، ئەوەش دوایی ئەوەی لە دەقەپیرۆزەکان تیۆری تەکفیریان دارشت، بەم جۆرە جیابوونەوەیان لە عەلی بریارێکی شیاو بوو بۆیان، پێداچوونەوە ولێ پەشیمانبوونەوەی نییە. بەوردبوونەوە لەتیۆرەکەیان کە

داوای حاکمیەتی خوادەکەن، دەتوانین بڵێین ئەوان هەموو دەسەڵاتێ، با دەسەڵاتی ئایینیش بێت رەتدەکەنەوە، ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەست کردن بەژیانی بیابانشین وهەژاری بەبەراورد لەگەڵ خەڵکی شار، ئەمەش وای کرد هیچ جۆرە ملکەچ کردنێکی ئارەزوومەندانە بۆ دەسەڵاتی گشتی نەبێت، لە تەکفیرکردنی خەڵك بەتایبەتی دوایی توندبوونی ململانێی نێوان عەلی وسەرانی ئومەویی گەیشتە لوتکە، هەر لەسایەی خولقێنی تیۆری تەکفیر توانیان عەلی تیرۆربکەن.

لە لایەکی ترەوە ئەو بانگەشە دیموکراتی وکۆمارەیەی خەواریج دەیکرد، بۆ بەدیهێنانی یەکسانی دادپەروەری، ڕەتکردنەوەی ئەو بۆچوونانەی دەبێ بنەماڵەی قورەیش نەوە لەدوای نەوە دەسەڵات بگرنەدەست، سەرەڕای ئەو باق وبریقەی کە تیۆرەکەی خەواریج هەیەتی، تیۆرەکەی هەمیشە کرج وکاڵ وبەلێڵی مایەوە، چونکە خەواریجەکان وردو درشتی تیۆرەکەیان ڕوون نەکردۆتەوە تاوەکو ئێستاش زۆر لایەنی بەروونی دیار نییە، وەکو شێوەی هەڵبژاردنی دەسەڵاتدار وماوەی حوکم. بەشێوەیەکی گشتی فەلسەفەی ئەو تیۆرەی خەواریجەکانە دایانڕشتبوو کە زۆربەی گروپەکانی خەواریج لەسەری کۆك بوون، لەگەڵ بوونی جیاوازی ئایدۆلۆژیا لە نێوان گروپەکانی خەواریج کە هەندێکیان توندرەوبوون، هەندێکی تریان میانڕەوبوون. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا مێژوونووسە ئیسلامییەکان مافی تەواویان پێ نەداوە زۆرجار زیادەڕۆیان لەسەرکردوونە.

سەبارەت بە ڕۆڵی کوردیش لەبزووتنەوەکانی خەواریجدا، ئەوا کوردیش وەکو نەتەوەکانی تر کە لەژێر سایەی خەلافەتی ئومەوییدا دەژیان، نزیك

بوونە لەو ڕووداوانەی لەدەوڵەتی ئومەویی ڕوویدەدا، بۆیە زۆرجار لەم ڕووداوانە تەنیاسەیرکەر نەبوونە، بەڵکو زۆرجار بەشداریشیان تێداکردوە لەوانەش بزووتنەوەی خەواریج.. بزووتنەوەی شیعە، بزووتنەوەی موختاری سەقەفی ...تد، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستە لە توێژینەوەکەمان ئەویش ڕۆڵی کوردە لە بزووتنەوەی خەواریج، کورد بەشێکی گرنگی بزووتنەوەی خەواریجی پێك دەهێنا، چ لەرووی مادەو یان داڵدەدان یا مرۆیەوە بێت، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت لەدەست هەندێ دەسەڵاتدارنی ئومەویی چونکە هەندێ لە دەسەڵاتدارانی ئومەویی هەڵسوکەوتی زۆر ڕەقیان هەبوو لەگەڵ ژێردەستەکانیان لەوانەش کورد، ئەمەش وای لە کورد کردوە بەلای بیری خەواریجدا بچێت، چونکە خەواریج بانگەشەی یەکسانی ودادپەروەریان لەنێوان چینەکانی کۆمەڵدا دەکرد، بەمەش ئەو بیروباوەڕەی هەیانبوو کاریگەریان لەسەر کوردەکان دروست کرد.

لەگەڵ ئەو بزووتنەوە زۆرانەی لەناوچە کوردییەکان پەیدابووە، بەڵام هیچ کاتێ کوردەکان سەرکردایەتی بزووتنەوەی خەواریجەکانیان نەکردووە، بەڵکو زۆربەی کات وەکو سەرباز بەشداریان کردوە یان لە ناوچەکانی خۆیان داڵدەیانداون، لەگەڵ ئەو هەستەی کورد بۆ خەواریجەکان هەیبوو، بەڵام لە هەمانکاتدا دژی هەندێ لە بزووتنەوەی خەواریج جەنگاون، بەتایبەتی کاتێ زانیویەتی ئەگەر یارمەتی ئەو بزووتنەوانە بدات توشی تۆڵە دەبێتەوە لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئومەیەوە ...



خەواریج کۆنترین (فرقە)گروپی ئیسلامیە[1]، بەیەکەم دەرچوون لە ئیسلامدا دادەنرێت[2]، وەیەکەم گروپی سیاسی ئایینییە لە سەرەتایی چەرخی یەکەمی کۆچی پەیدابوون[3]. ئەوانە، لەگەڵ عەلی کوری ئەبوتالب دابوون[4]، دوایی مەسەلەی تەحکیم هاتە پێشەوە کە عەلی بە تەحکیم رازیی بوو وازیان لەویش هێنا، ئەمانە وەکو خەواریجیان پێدەڵێن[5]، خەواریجەکانیش بۆ چەند گروپێك جیابوونەوە، هەریەك لەم گروپانە بیروباوەڕی ئایینی و رامیاری تایبەت بە خۆیان هەبوو هەندێکیان توندڕەو هەندێکی تریان میانڕەو بوونە[6]. بەڵام سەبارەت بەچەندایەتی ژمارەی گروپەکانی خەواریج ئەوا جیاوازی هەیە لەنێوان سەرچاوەکانی مێژوو، هەندێ لەمێژوونووسان بەبیست گروپی دادەنێن[7]، هەندێکی تر بەچوار گروپی دادەنێن[8]، بەڵام شهرستانی ئاماژە بەوە دەکات گروپە گەورەکانی خەواریج شەش گروپی سەرەکین[9]. بەهەرحال دەتوانین بڵێین گروپەکانی خەواریج ئەمانەن (( الازارقە، النجدیە، البیهسیە، الصفریە، الاباضیة ..... ))[10]. لەگەڵ چەند گروپێکی تری لاوەکی[11]. ئەوناوانەش کە پێ ناسرابوون ((الخواریج، الحوریە، المارقە، المحکمە، الشراە، النواصب))[12]، بەڵام ((الخواریج)) بەناوبانگترین ناوە پێی ناسراون، تابووە جیاکارێك توێژەران و خەڵك بەکاریان دەهێنا[13].

سەبارەت بەوشەی خەواریجیش ئەوا ((خەواریج)) کۆی فرمانی ( خرج) هیە واتا(دەرچوون)[14]، بەهۆی دەرچوونیانەوە پێیان ووتراوە[15]. گوایە ئەوانە لەپێناوی خودا دەرچوونە، ئەوەشیان لەو ئایەتە وەرگرتووە((ومن یخرج من بیته مهاجرا الی الله ورسوله ثم یدرکه الموت فقد

وقــع اجــره علــى الله وكــان الله غفــورا رحيمــا))[١٦]، ئــەو نــاوەش لــەلای خەواریجەکان جێگای ڕەزامەندیە، چونکە ئەوان وایان دانابوو لەپێناوی خـوا دەرچـوونە[١٧]، یـان ئەواتـەی لایـەنی ئـەو ئیمامـە ڕەوایـەیان نەگرتایـە کـە کۆمەلەکە لەسـەری ڕێکـەوتوون هەڵیانبـژاردووە پێیـان ئـەووتن خـەواریج[١٨]، هــەروەها بــەو کەسانەشـیان ئـەووت خـەواریج کـە ملیـان بـۆ کاربەدەسـت ودەسـەڵاتدارانەی ئـەو دەم کـەچ نـەدەکرد[١٩][٢٠]، خـەواریج بەوکەسـانەش ناسرابوون لەجەنگی صەفین دا لەسەر ئەوەی ڕایان وابوو تـەحکیم هــەر بۆ خوایـە لـەعــەلی کـوڕی ابـو تالیـب جیابوونـەوە[٢١]، وەکـو کـەرتێکی خاوەن بیروباوڕ وبەرنامەی سیاسی دیموکراتی ناسراون لەلای مێژوونوسانی نوێ[٢٢].

بـەلام سـەبارەت بـە بنجـەی بیروبـاوەڕی خەواریجـەکان ئەگەڕێتـەوە بـۆ سەردەمی زۆر پیش جەنگی صەفین وتەحکیمی نێوان عەلی و معاویەی کوڕی ئەبوسفیان[٢٣]. دەستنیشانکردنی ئەمەش لەو بەرەنگار وەستان و کردارانـەی دەردەکـەوێت، کـە لەسـەردەمی پێغەمبـەر(د.خ) و سـەردەمی خەلیفـەکان بوویانە، لە سەردەمی عوسمانیش بە تەواوەتی شێوەی شۆڕشی وەرگرت بە کوشتنی عوسمان کۆتایی پێ هات[٢٤].

بەلام دروست بوونی خەواریج لایەنی عەقیدە وشێوازی تێگەیشتنیان بۆ ئـایین دەگەڕێتـەوە بـۆ دابەشـکردنی دەسـکەوتی خەیبـەر لـەو کاتـەی (ذولخویصر) پیاوێکی بەنی تەمیم بوو هاتە لای پێغەمبەر (د.خ) ووتی (ئەمڕۆ دادوەر نـەبووی ؟؟) پێغەمبـەریش ووتـی :(مـن دادوەر نـەبم کـێ دادوەرە؟؟)[٢٥]، لـەم بارەیـەوە پێغەمبـەر دەفـەرمووێت ((لەپشتی ئـەوەوە

کەسانێك پەیدا ئەبن، چۆن تیرێك لە کەوان دەردەچێت، ئەوانەش وا لە دین دەردەچن[٢٦]، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموویت ((ئەمانە بەقسە هەقیان پێیە بەڵام لەگەروویان دەرناچێت ))[٢٧][٢٨].

ئەگەر هەندێ هۆکاری ئابوری و کومەلایەتی وادابنێین لە بەدەرکەوتنی خەواریج وەکو شۆڕشێك لە دژی ئەو عەرەبانەی خەلکی شار بوون[٢٩]، بەتایبەتی ئەو عەرەبانەی نیشتەجێ بوون لە کوفە وبەسرا، دوای فەتحی یەکەم ئەوانە ژیانیان خۆشبوو، دەوڵەمەند بوون، بەلام عەرەبەکانی ئەم ناوچەیە بەتایبەتی هۆزی تەمیم کە هەر لەزووەوە لەوێ نیشتەجێ بوون ئەمانە بەهەژاری مانەوە[٣٠]. بۆیە هۆزی تەمیم ویستیان لە دەسەلاتی خەلافەت دەربچن[٣١]، هەروەها جگە لەلایەنی ئابوری بەلکو بۆچوونی سیاسیان و هۆزگەرایەتی (عصبیە قەبلیە) ڕۆلی هەبووە لەسەر بەدەرکەوتنیان[٣٢]، کە ئیرەیی وحەسودیان بە خەلکی نیشتەجێی شار دەبرد[٣٣]. ڕەمزیە عبدالوهاب دەلێ: خەواریجەکان لەگەلێك هۆز وتیرە پەیدابوونە یەك مەبەست یەك خواستیان هەبوو ئەو خواست مەبەستەش گۆڕان بوو لە قەوارەی دەولەت، تاوەکو لەلایەن کەسانی دڵسۆزەوە بەڕێوەبچێت کاری ڕەواو دادوەرانە بێت ئەگەرنا دەبێت شۆڕشی لەدژ بەرپا بکرێت[٣٤].

دەبێ بە مبدئی (الحکم الا اللە) بجولێنەوە[٣٥]. ئەمانە لەگەڵ ئەوەشدا بیروباوەڕێکی وایان هەبوو دەبێ شورا لەنێوان موسڵمانەکان بکرێت دەبێ خەلیفە بەئازادی هەڵبژێردرێت، ئەو کەسەش دەبێتە خەلیفە قورەیشیش نەبێت هەر دەبێت[٣٦]. ئەمەش تیۆرێکی سیاسییە کەخەواریجەکان مەنتقیانە

دایانڕشتبوو، بەڵام لێرەدا سەرنجی ئەوەدەدرێت ئەو تیۆرە هێندە گوزارشت لە دوژمنایەتی کردنی دەسەڵاتی ئومەوییەکان دەکات، هێندە گوزارشت لەبۆچونی سیاسیان ناکات[٣٧]. زۆریش سووربونە لەسەر ئەو بیروباوڕەی هەیان بووە، زۆرجاریش زیادە ڕەویان تێدا کردوە ئەمەش دەرئەنجامی خراپی لێکەوتەوە[٣٨]، چونکە ئەوانە بیروباوەڕێکی چەسپاوی ئەوتۆیان هەبوو هیچ دەربەست نەبوو لەڕێگەی دا قوربانی بدات[٣٩]. دورشمەکەشیان گیانی جۆشدان و ئاینی و دەست بەسەراگرتن بوون[٤٠].

خەواریج هەرچەندە لەسەرتایی بەدەرکەوتنیان بیروباوەڕیکی تایبەتیان نەبووە[٤١]، بەڵام کۆك بوونە لەشتە سەرەکییەکان لە هەندێ شتی لاوەکی جیاوازیان هەبووە[٤٢]، لە نێوان گروپە خەواریجەکانی تر، تارادەی ئەوەی شەڕو ناکۆکی لەنێوانیان ڕوبدات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵکردنی مامەڵەی سیاسیان بە ئموری شەرعیەوە[٤٣]. ناکۆکی سەرکردەکانی خەواریج لەسەر دەسەڵات ئەوەش لەوەدا دەردەکەوێت زۆربەی گروپەکانی خەواریج بەناوی سەرکردەکانیانەوە بوو[٤٤].

سەرئەنجام بووە هۆی سەر دەرهێنانی دیدێکی سیاسی نوێ، تەواو جیاواز لەو بۆچوونەی کە گوایە دەبێ بنەماڵەی قوریش نەوە لەدوای نەوە دەسەڵات بگرنە دەست، بەگوێرەی ئەم بۆچوونە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی گوزارشتی لە هەڵوەشانەوەی پاشایەتی دەکرد پشتیوانی لە هاتنە سەرکاری رژێمکی کۆماری دەکرد[٤٥].

وادیارە ئەم داوا دیموکراتیەیی خەواریجەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد، بۆ بەدیهێنانی یەکسانی دادوەری لەنێوان هەموو چینەکانی کۆمەڵ،

لەنێوانیشیاندا سەرنج ڕاکێشانی نەتەوەکانی غەیرە عەرەب وەکو ( کورد و فارس رۆم...تد) کە بەمەوالی دانرابوون. وادیارە پەیدابوونی خەواریجیش دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ هۆکاری ئابوری کۆمەلآیەتی لەئەنجامی ئەو نا یەکسانیەی لەکۆمەلگەی ئیسلامدا کێشەی زۆریان نایەوە[٤٦]. بەتایبەتی لەنێوان شارنشین وگوندنشینەکان[٤٧]. هەندێ لە مێژوونووسان دەرکەوتنی خەواریج دەگەڕێنەوە بۆ هۆزەکانی عەرەب جگە لەقورەیش ئارەزووی گرتنەدەستی دەسەلآتداریان هەبوو[٤٨].

جا لێرەدا خەواریج وەکو یەکەم پارتی سیاسی ئاینی[٤٩]، وە یەکەم گروپی ڕادیکالی[٥٠]، ئاوێتەی بیری دیموکراتی و کۆماری دەرکەوتن[٥١][٥٢]، چونکە ئەوان ڕازینە ئەگەر عەبدێکی رەش فەرمانڕوایەتی بکات با قورەیشیش نەبێت، بەلآم موسلمان بێت توانایی بەڕێوەبردنی هەبێت[٥٣]. ئەمەش پێچەوانەی مەرجەکانی خەلیفەیە کەدەبێت قورەیش بێت[٥٤][٥٥]، ئەمەش هۆکارێك بووە بۆ نزیك بونەوەی نەتەوەو هۆزەکانی غەیرە عەرەب. جا کوردیش وەکو نەتەوەکانی غەیرە عەرەب بەمەوالی دانراوە، وە یەکێك بووە لە نەتەوە گرنگەکان لەچەند هەرێمێکی دیاریکراو لە ژێر سایەی خەلافەتی ئیسلام ( ئومەوی) دا ژیاوە. خەلافەتیش ڕووبەڕووی زۆرێك لەشۆڕش ڕاپەڕین هەلگەڕانەوە بۆتەوە[٥٦]. کوردیش نزیك بووە لەم ڕووداوانە بگرە بەشداریشی تێداکردووە لەوانە بزووتنەوەی خەواریج کە کورد ڕۆلی چالاکی تێدا هەبووە.

## - سەرەتای پەیوەنـــدی نێوان کورد وخـــەواریج :

سەرەتای پەیوەندی کوردیش بەخەواریجەکانەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی هلال بن عقلە لەسالی (٣٨ك) نەهرەوانی جێهێشت ڕووی کردە

ماسەبزان[٥٧]، کە سەر بەهەرێمی چیایە، یەعقوبی دەڵێت: دانیشتوانەکەی تێکەڵن لەکورد وفارس وعەرەب[٥٨]. بەلام الاصطخری دەڵێ:(ماسبزان لەوشارانەیە کە کوردی تێدا دەژی)[٥٩]، هلال دووسەد کەسی لەلایەنگرانی لەم شارەدا مانەوە، بەڵام زۆری نەخایەند(عەلی کوڕی ئەبو تالب) سوپایەکی بۆ ناردن، کۆمەڵێك لایەنگرانی کوشت وبزووتنەوەکەی کۆتایی پێ هات[٦٠].

دوای ئەمەش بزووتنەوەیەکی تر بەدەرکەوت بەسەرکردایەتی (ئەبو مریم سعدی التمیمی) ڕووی کردە شارەزوور. ئەمەش لەساڵی (٣٨ ك) دابوو زۆربەی لایەنگرانی مەوالی بوونە، تەنانەت دەڵێن هیچ عەرەبیان لەگەڵدا نەبوو تەنها چواریان نەبێت کە خۆی یەکێك بووە لەوان[٦١]. ئەم بزووتنەوەش ژمارەیەك لە کوردەکان هاتونەتە پاڵی[٦٢]. ئەمەش یەکەم بەشداری بەکردەوەی کوردە لەبزووتنەوەی خەواریجدا، دوایی ئەم بزوتنەوەیە لەلایەن عەلی کوڕی ئەبوتالب کۆتایی پێ هات[٦٣]. لەسەردەمی خەلافەتی ئومەویی کۆمەڵێك بزووتنەوەی خەواریج سەری هەڵدەدەن، کوردەکان ڕۆڵی بەرچاویان دەبێت لەدالدەدان بەشداری کردنیان. دیارە ئەمەش هۆکاری خۆی هەیە، بۆ ئەوەی خەواریجەکان چالاکیەکانیان بگوازنەوە بۆ ناوچە کوردییەکان.

## - هۆکارەکانی گواستنەوەی چالاکی خەواریج بۆ ناوچە کوردنشینەکان :

١- دووری هەندێك لەناوچە کوردییەکان لەبنکەی خەلافەت کە(دیمەشق) شام بوو، وەکو شارەزوور هەرێمی چیا[٦٤]. بۆ ئەو مەبەستەش خەواریجەکان بە ئاسانی کاریان دەکرد بۆ بلاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانیان لە ناوچە

کوردنشینەکان بەتایبەتی ئەو ناوچانەی سەرەتا بوون لەهاتنە ناو ئیسلام. بە ئاسانی بیروباوەڕەکانیان قبوڵ دەکرد ودەهاتنە ڕیزی بزووتنەوەکانیان.

٢- شوێنی جوگرافیایی ناوچەکوردییەکان ئەویش بەهۆی ئەوەی ناوچەیەکی سەخت چڕی شاخاویە[٦٥]، بە ئاسانی ئومەوییەکان دەستیان پێ ناگات. هەروەها دەوڵەمەندی وبەپیت وبەرەکەتی ئاووهەوای خۆش وسازگار بەبەراورد بەناوچە بیابانئشینەکان، ئەمەش کاریگەری خۆی هەبووە، لە گواستنەوەی چالاکی خەواریج بۆ ناوچە کوردییەکان، وەکو بزووتنەوەکەی (ئەبو مریم سعد تمیم و فروەی کوڕی نەوفل لە شارەزوور ...) چونکە شارەزوور ناوچەیەکی سەخت ودژواربوو، بۆیە ئەوانە ویستویانە بەسەری دا زاڵ بن، هەردەم بەدەست کوردەکانەوە بوو، هیچ میرو خەلیفەیەك نەی توانیوە حوکمی شارەزوور بکات[٦٦].

پەیوەندی کورد بەخەواریجەکانەوە لەم هەرێمەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی خەواریجەکان دەرچوون بۆ شارەزوور لەساڵی(٣٨ك) بەسەرکردایەتی (ابی مریم سعد التمیمی)[٦٧] ئەوانەی لەگەڵی بوون زۆربەی مەوالی بوون، تەنیا شەش کەسیان نەبێت، عەرەب بوون خۆی یەکێك بوو لەوان[٦٨]. دوایی ئەویش(فروەی کوڕی نوفل) ڕووی تێکرد[٦٩]. شارەزوور بووە شوێنگەی هەموو کۆچەر وبێ داڵدە وهەڵهاتووەیەك[٧٠]. لەم بارەیەوە مسعودی دەڵێت : شارەزوور بووە شوێنی نیشتەجێ بوونی خەواریج لەسەردەمی ئومەوییدا[٧١].

٣- ئەوچاکسازیەی لەسەردەمی خەلافەتی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان کردبووی بۆ سەقامگیربوونی دەسەڵاتی ئومەویەکان[٧٢]، ئەویش

ئاراستەکردنی دەوڵـەت بـەرەو مەرکەزیـەت[٧٣]، دەیویـست واتـا وچـەمکی دەوڵـەت لەلایـەی هۆزکانـەوە بـچەسپێنی[٧٤]، جـا لێـرەدا ئـەو پێکهاتـە هۆزایەتیـەی لەکۆمـەڵگای کوردیـدا هـەبوو بـەخاڵێك دادەنرێـت بـۆ لێـك نزیکبوونـەی کـورد وخـەواریج چـونکە هـەردوو لایـان ئـەو هەستەیان هـەبوو لەنەچوونە ژێر باڵی خەلافەت[٧٥].

٤- دەگەڕێتـەوە بـۆ زوڵـم و زۆرداری سیاسـەتی نـا عادیلانـەی هەنـدێ لـە دەسـەڵاتدارانی ئومـەویی، بەرامبـەر بەنەتـەوەکانی ژێردەسـتیان[٧٦] لەوانـە کورد. وە دانانیان بە مـەوالی وهـاوڵاتی پلـە دوو وسـی[٧٧]، وەسـەپاندنی بـاج وسەرانە تەنانەت دوایی موسڵمان بوونیشیان.

٥- ئـەو بانگەشـە دیمـوکراتی و کۆماریـەی خەواریجـەکان دەیـانکرد[٧٨]، وە بەهێزیی شێوازی هونەری ووتاربێژیان[٧٩]. ئەمەش وایی لەکوردەکان کـردووە بەلایی بیری خـەواریج دا بـچێت، پەیوەنـدی لـە نێوانیـان دروسـت بێـت بێنـە ناوچە کوردییەکانەوە .

## ئەو هـەرێم و ناوچـە کوردنـشینانەی خەواریجـەکان چـالاکیان تێـدا ئەنجام داوە:

### ١- شــــارەزوور:

پەیوەندی کورد بە خەواریجەکان لەم هەرێمـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەوکاتـەی خەواریجـەکان دەرچـوون بـۆ شـارەزوور بەسـەرکردایەتی ئـەبو مـریم سـعد التميمی ئەمەش لە سالی (٣٨ك ) دابوو[٨٠]، ئەوانەی لەگـەڵی دابـوون زۆریـەی مەوالی بوون تەنیا شەش کەسیان نەبێت عەرەب بوون، خۆشی یـەکێك بـووە لەوان[٨١]. دوای ئەوەش فروەی کوڕی نەوفل ئەشجعی بەخۆی پێنج کـەس لـە

لایەنگرانی ڕووی کردە ئەم هەرێمە[٨٢]. ڕووتێکردنی خەواریجەکان بۆ ئەم هەرێمە لەسەرەتای بەدەرکەوتیان دەگەڕێتەوە بۆ سەخت ودژواری و دووری هەرێمەکە[٨٣]، لە بنکەی خەلافەت بەراورد بەناوچەکانی تر، وە بوونی مەوالی لە ناوچەکە[٨٤]، بەم شێوە شارەزوور بووە شوێنگەی هەموو بێ داڵدەو کۆچەر و هەڵهاتویەك[٨٥]، لەم بارەیەوە مسعودی دەڵێ: شارەزوور بووە شوێنی نیشتەجێ بوونی خەواریج لەسەردەمی ئومەوییدا[٨٦].

## ٢- هەرێمی جەزیرە:

هەرێمی جەزیرە هەرێمێکی تایبەتە لەڕووی پێکهاتەی کۆمەلایەتی کەوا دانیشتوانەکەی لە کورد و عەرەب و ئەرمەن و رۆم و فارس پێکهاتووە، بۆیە ئاساییە بارودۆخێکی شەلژاو و بەریەرەکانی دروست بکات بەجۆرێك زەمینە خۆش بکات بۆ خەواریج هەر بانگەوازێك بۆ هەلگەڕانەوە بکرێت دژی رژێمی هەر حوکمێك کە فەرمانڕەوایەتی دەکات[٨٦]، ئەم بارودۆخە شەلژاوەش وایکرد چەندین بزووتنەوەی خەواریج ڕوو بکەنە ئەم هەرێمە ببێتە مەلبەندی بزووتنەوەی خەواریج، هەروەکو ابن عبد ربە دەڵێت: جەزیرە هەمووی خەواریجە[٨٧].

## ٢-هەرێمی چیـــــا:

وادیارە ئەم هەرێمەش بیروباوەڕی خەواریجی تێدا بلاوبۆتەوە، بەلام بەو ڕادەیە نەبوو، وەکو هەرێمەکانی تر( جەزیرە وشارەزوور) لەمبارەیەوە مسعودی دەڵێت: بیروباوەڕی کورد لەم هەرێمە وەکو بیروباوەڕی خەواریجە[٨٨]، هەروەها ابن حوقل ئاماژە بەوە دەکات دانیشتوانی (سهرورد)

کوردبوونە، لەسەر بیروباوەڕی خەواریج بوون[٨٩]، چەندین بزووتنەوە لەم هەرێمە چالاکی ئەنجام داوە لایەنگری پەیدا کردوە بۆ خۆیان.

**٤- هەرێمی ئازەربێجان:**

ئەم هەرێمەش خەواریجەکان چالاکیان تێدا ئەنجام داوە، بەڵام بیروباوەڕی خەواریجەکان بەئەندازەیەکی زۆر لەم هەرێمە بڵاونەبۆتەوە، بەبەراورد بەدەڤەرەکانی تر کە پێشتر باسمان کرد، بۆنمونە لیسترنج ناوی دەریاچەی (ارمیە) ورمێ بە دەریاچەی شوراتەکان ناودەبا لە بەربوونی خەواریج لەسەر کەنارەکانی[٩٠].

**٥- موسڵ:**

بەپێگەی یەکەمی جەزیرە دادەنرێت[٩١]، چەندین قەڵاوشورای تێدایە[٩٢]، شاری موسڵ چەندین گوند پەیوەندیان پێوە بوو وەك تیرهان، السن،حدیسە، باجلی، باهزران، حبتون (هەفتوون)، حەززە[٩٣]، وە کورد لەم هەرێمە هەر لەکۆنەوە نیشتەجێ بوونە[٩٤]، هەرچی عەرەبە دوایی فتوحات تەعریبیان کردووە لە دەڤەری موسڵ نیشتەجێ بوونە[٩٥]، وەچەندین هۆز لەم شارە ژیاوە گەڕەکی تایبەت بەخۆیان هەبووە[٩٦]، پەیوەندی خەواریجەکانیش بە شاری موسڵ و دەوروبەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی ساڵح کوڕی مسرح لەساڵی (٧٦ك) ڕووی کردە موسڵ چالاکی تێدا ئەنجام دەدا و تێدا دەمایەوە[٩٧].

## رۆلی کورد لەبزوتنەوەکانی خەواریج دژ بەخەلافەتی ئومەویەکان:

### ١- بزووتنەوەی فروەی کوری نوفل الاشجعی (٣٨ ك):

پاش ئەوەی ئیمامەتی بەبەرژەوەندی (معاویەی کوری سوفیان) تەواو بوو ئەوا فروەی کوری نەوفلی الاشجعی بە پێنج سەد کەسەوە علی وحەسەنی بەجێهێشت رووی کردە شارەزوور[٩٨]، لە سەرەتادا بەرەو بندنجین (مەندەلی)[٩٩]، کەوتەرێ دواتر لەوێوە چووە( دسکرە)[١٠٠]، پاشان رووی کردە حەلوان داگیرکرد دەستی کرد بەکۆکردنەوەی باج و پیتاك لە خەلکەکەی بەسەر هاولاتی خۆی دابەشکرد[١٠١]، دواتر لە شارەزوور نیشتەجێ بوو[١٠٢].

پاش ئەوەی حەسەنی کوری عەلی وازی لەخەلافەت هێنا بۆ معاویەی کوری ئەبوسفیان[١٠٣]، لەو کاتەدا فروەی کوری نەوفل بەلایەنگرانی خۆی ووت:( قدجاء الان مالاشك فیه، فیسرو الی معاویة فجاهدوه)[١٠٤]، دوای ئەوە فروە بەهێزێکی ١٥٠٠ کەسی رووی لەنخیلەی نزیك کوفە کرد[١٠٥].

وادیارە ژمارەیەکی زۆر لەکوردەکان بەشداریان لەبزووتنەوەکەی فروە کردوە چونکە بەر لەهاتنی بۆ شارەزوور ژمارەیان پێنج سەد کەس بوو، بەلام لەکاتی هاتنی بۆ کوفە ژمارەیان گەیشتۆتە هەزارو پێنج سەد کەس، ئەمەش بەلگەیە لەسەر بەشداری کردنی کوردەکان لەبزووتنەوەکەی فروە کوری نوفل.

دوایی ئەوە فروە کۆمەلەکەی لە نوخیلە دابەزین، ئەوا لەو کاتە معاویە لەکوفە بوو[١٠٦]، داوایی لەحەسەنی کوری عەلی کرد کوشتاری خەواریجەکان

بگرێتە ئەستۆی خۆی، بەڵام حەسەن وەڵامی دایەوە گوتی:(( لو اترکت ان قاتل احدا من اصلاح اهل قبیله لبدا بقتالك فان ترکتك احد من اصلاح الامە وحقی دمائها...))[١٠٧]، ئەوەبوو معاویە سوپایەکی لەخەڵکی شام نارد بۆ شەڕکردن لەگەڵ فروەی کوڕی نوفل شکان[١٠٨]، دوایی معاویە داوایی لە خەڵکی کوفە کرد بۆ کوشتاری خەواریجەکان ووتی:(( لا امان لکم عندی ولارزق او تکفون امرهم )) ئەوە بوو خەڵکی کوفە دەرچوون بۆ شەڕکردن بە سەرکردایەتی خالدی کوڕی عروفطة العذری، بەڵام فروە گووتی: ئایا ؟ معاویە دوژمنی ئێمەو ئێوە نییە؟ داوامان لێ بکەن هەتا بیکوژین، ئەگەر توانیمان ئەوا دوژمنەکانمان لەکۆڵکردونەتەوە ئەگەریش نەمانتوانی ئەوا ئێمە لەکۆڵ ئێوە بوینەتەوە[١٠٩]، بەڵام خەڵکی کوفە وازیان نەهێنا لە ترسی معاویە شەڕیان لەگەڵ کردن، لە ئەنجامدا هێزەکەی فروە گەڕایەوە بۆ شارەزوور، سوپای ئومەوی بەدوای کەوتن لەوێ لەشارەزوور کوشتیان[١١٠]. بەمەش بزووتنەوەکەی فروە کوڕی نوفل کۆتایی پێ هات.

**٢- بزووتنەوەی زیاد کوڕی فراش العجلی الخارجی ( ٥٢ك ):**

زیاد کوڕی فراش سەرکردایەتی کۆمەڵەیەکی بچوکی خەواریجی دەکرد[١١١]، لە ساڵی(٥٢ك) لەهەرێمی عێراق دەرچوو، زیاد بن ابی سوپایەکی بۆ نارد بەسەرکردایەتی سعید کوڕی حذیفەی یەمانی ، توانی ژمارەیەك لە هاوڵاتی زیاد بن فراش بکوژێت، دوایی زیاد ناوچەکانی عێراقی بەجێهێشت ڕووی کردە( ماه)[١١٢]. بەڵام سەرچاوەکان ئاماژەی تەواو نادەن ئایا؟ ئەو ماه چ شارێکە ماه سبزان، ماه البصریە یان ماه کوفە یان ماه دینوەرە[١١٣]، دیارە لەم بزوتنەوەیەدا کوردەکان وەڵامدانەوەیان نەبووە، چونکە

بزووتنەوەکە لەلایەك بۆ ماویەکی کورت بوو لە لایەکی ترەوە نازانرێت بەتەواوەتی هاتۆتە ناوچە کوردییەکان یان نا.

٣- **بزووتنەوەی حیان کوڕی ضبیان سلمی ( ٥٨ ك ):**

حیان السلمی سەرکردایەتی کۆمەلێك لەخەواریجەکانی کرد، ( یەکێك بوو لەوانەی لەنەهروان لە دژی عەلی جەنگاو دوایی عەلی لێی خۆش بوو)[١١٤]. لەسەرەتادا هاتە رەی* تا کوژرانی عەلی هەر لە رەی مایەوە دوایی گەڕایەوە بۆ کوفە[١١٥]، لەساڵی (٥٨ك) سەرکردایەتی کۆمەڵێك لەخەواریجەکانی کوفەی کرد لەدەسەڵاتی خەلافەتی ئومەویی دەرچوو بوون[١١٦]، داوای لەهاوڵەکانی کرد فەرمان بەچاکە بکەن ودوورکەونەوە لەخراپە[١١٧]، لەسەرەتا ڕووی کردە حەلوان لەوێ مایەوە[١١٨]، هەندێکی تر ئاماژە بەوە دەکەن حیان وکۆمەڵەکەی ڕوویان کردۆتە (بانقیا)[١١٩]. لەوانەیە لەکاتی گەڕانەوەی بۆ کوفە ڕووی کردبێتەی ئەم شارە چونکە بانقیا شارێکە لە دەوروبەری کوفە[١٢٠]، دوای گەڕانەوەی حیان بۆ شاری کوفە هەر لەوێش(٥٩ك) کوژراو کۆتایی بەبزووتنەوەکەی هاتووە[١٢١]. پێ دەچێت کوردەکان بەشداریان لەم بزووتنەوەیە نەکردبێت چونکە هیچ ئاماژەیەك نیە بۆ بەشداریکردنی کورد لەم بزووتنەوەیە تەنیا ئەوەندە هەیە ئەم بزووتنەوەیە هاتۆتە ناوچەیەکی کوردی بۆ ئەوەی لایەنگری پەیدا بکات.

٤- **بزووتنەوەی ساڵح کوڕی مسرح التمیمی ( ٧٦ك ):**

ساڵح کوڕی مسرح تەمیمی یەکێك بوو لەسەرکردەی خەواریجەکان لەساڵی (٧٦ك) لەدەسەڵاتی خەلافەت دەرچوو، لە دژی حجاجی کوڕی یوسف سەقەفی[١٢٢]، هەمان بیروباوەڕی صەفریەکانی* هەبوو، یەکەم کەس بووە لە

صـفریەکان دەرچـوو[١٢٣] ، وە ئـەمیری صـفریەکان بـوو[١٢٤] . لـە رۆژگـاری خەلافەتی عبدالملك کوری مەروان( ٦٥-٨٦ك) دەرچوو، چالاکی لەناوچەکانی دارا و موسڵ و جەزیرە ئـەنجام دەدا[١٢٥] . خـەڵکی بۆ بیروباوەڕەکـەی بـانگ دەکـرد، بانگەشـەی جیهـادی دەرکـرد بـۆ ڕووبەڕووبونـەوەی زوڵـم و زۆرداری ئومەویەکان[١٢٦] .

سـالح و هاوڵـەکانی بۆمـاوەی ١٣شـەو لـە دارا مانـەوە خەلکەکـەی ئـەوێ پـەنایان داون، بەهـەمان شـێوەش خـەڵکی ( نـصیبین و سـنجار ) داڵـدەیان داون، دوایی ئەوەی بۆ ئەوێ چوون ژمارەیان ١٢٠ کەس هەندێکی تـر دەڵـێن ١١٠ کەس دەبوو[١٢٧] ، لەو ماوەیـەدا مـەروانی کوڕی محمد والی جـەزیرە بـوو ترسی لێ نیشت بۆیە هەڵسا بەناردنی (عدی بن عدی بن عمره) بە ١٠٠٠هـەزار کەسەوە داوایی لێکرد ناوچـەکە بـەجێبهێڵن، بـەڵام سـالح و هاوڵـەکانی رازی نەبوون، لەئەنجام شەڕێك لەنێوانیان ڕوویدا، خەواریجەکان توانیان پاشەکشە بەهێزەکانی مەروان بکەن[١٢٨] ، ئەمەش یەکەم هێـزی ئومـەویی بـوو ناردرایـە سەر سالح کوری مسرح[١٢٩] .

بـەمجۆرە ناوچـە کـوردییـەکان ببـووە مـەیدانی ملـملانـێی سـەرەکـی نێـوان سـوپای ئـومەویی وخەواریجـەکان زۆربـەی جـاریش لـەو شـەڕانە کوردەکان تووشی زیانی مـادی ومرۆیـی بوونەتـەوە، چـونکە کوردەکـان وەك مەوالی بەشداریان لە پێك هاتەی سوپادا کردوە، لەلایەکی ترەوە ناوچەکانیان تووشی تالان بۆتەوە.

لەسالی(٧٦ك) مەروان کوڕی محەمەد هێزێکی هـەزار وپێـنج سـەد کەسـی بەسەرکردایەتی خالید جزء السلمی، وە هێزێکی تر هەزار وپێنج سـەد کەسـی

بەسەرکردایەتی (حارث بن جوعنه بن ربیعه ) واتا ژمارەی هێزەکە گەیشە سێ هەزار کەس، بەڵام ساڵح بەمەی زانی لەترسی ئەم هێزە ڕوویکرد (ئامد- دیاربکر) ، دیارە خەڵکەکەی ئەوێ کورد بوونە داڵدەی ساڵح کوڕی مەسرح وهاوڵانیان داوە، بەڵام هێزی مەروان هەر بەدوایانەوە بوون، لەئەنجام شەڕ وکوشتار لەنێوانیان ڕوویدا، نزیکەی ٣٠ کەس لە هاوڵاتی ساڵح کوڕی مەسرح کوژرا، ٧٠ کەسیش لە ئومەویەکان کوژرا[١٣٠]. دواتر ساڵح و هاوڵەکانی هەرێمی جەزیرە یان جێهشت ڕوویان کردە موسل، پاشانیش بەرەو دسکرە چوون، کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتە حجاجی کوڕی یوسف سەقەفی هێزێکی سێ سەد کەسی لە خەڵکی کوفە و خەڵکانی تر ئامادەکرد[١٣١]، لەوانەیە کوردەکان لەترسی حجاجی سەقەفی بەشداریان لەم هێزدا کردبێ، ئەم هێزەش بەسەرکردایەتی حارث بن عمر الهمدانی ڕووی بەڕووی هێزەکەی سالح بویەوە، بەڵام سالح وشوێنکەوتوانی نەیانتوانی خۆیان ڕابگرن بۆیە دەرچوون بەرەو جەلەولاوخانقین[١٣٢]، بەڵام هێزی ئومەویەکان بەدوایان کەوتن، تاوەکو دێیەك پێی دەڵێن (مدبج) دەکەوێتە سنوری موسڵەوە سالح لەم ڕۆژانەدا تەنیا نەوەدکەسی لەگەڵدا بوو[١٣٣]، ئەمەش تەنیا زیاتر ئەوانەی پێشوو بوونە، پێدەچێت کورد لەم بزووتنەوەیەدا تەنیا داڵدەی دابن ڕێگەیان داون لە ناوچە کوردەواریەکان بمێنێنەوە، بەمەش ناوچە کوردیەکان توشی زەروزیان هاتوون لەئەنجامی شەری بزووتنەوەکەلەگەڵ دەولەتی ئومەوی.

دواتر سالح و شوێن کەوتوانی لەقەلایەك گامەرۆدران سالح و ژمارەیەك لە شوێن کەوتوانی کوژران[١٣٤]. بەڵام بزووتنەوەکەی کۆتایی پێ نەهات، بەڵکو

شبیب کوری یەزید دوایی کوژرانی سالح سەرکردایەتی خەواریجەکانی کرد لاینگرانی سالح و ئەوانەی رزگاریان بوو بەیعەتیان پێدا[١٢٥].

## ٥- بزووتنەوەی شبیب کوری یەزید الشیبانی ( ٧٦ك ) :

شبیب کوری یەزید شیبانی بە ( اباالصخاری ) ناسراوە[١٣٦]، بزووتنەوەکەی شبیب بەدرێژکراوەی بزووتنەوەی سالح کوری مسرح دادەنرێت، چونکە دوایی کوژرانی سالح شوێن کەوتوانی بەیعەتیان بەشبیب دا[١٣٧]، شبیب لە ڕۆژگاری خەلافەتی عبدالملك کوری مەروان لەدەسەلاتی خەلافەت دەرچوو[١٣٨]، ئامادە نەبوو سەر بۆ حەجاج نەوی بکات[١٣٩]، ئەویش دوایی ئەوەی گەمارۆی سوپاکەی حەجاجی شکاند، لە دەوروبەری دێی ( مدبح ) لەگەڵ هاوەڵەکانی ڕووی کردە مەدائن[١٤٠]، بەڵام کاتێ بە موسڵدا تێپەری کۆمەڵێك لەخەڵکی ئەوێ هاتونەتە پاڵی، ویستی بچێت بەرەو هەرێمی ئازەربێجان[١٤١]، واتا شبیب کوری یەزید بەبەردەوامی هاتووچۆی دەکرد لەنێوان هەرێمی چیاو ورەشەخاك[١٤٢]، گەڕان و سوڕانی لەنێوان شارەکانی موسڵدا دەکرد هەرچەندە خەڵکی موسل لەگەڵ ئەو ناکۆك بوون، بەڵام شەڕیشیان بۆ دەکرد[١٤٣]، بزووتنەوەکەی شبیب لەناوچەکانی دسکرە و موسڵ و نەهروان و حلوان و سنجارو دارا و نصیبین وشارەکانی جەزیرە و ئامد چالاکی ئەنجام دەدا، وە خەڵکی کۆدەکردەوە لە دژی دەوڵەتی ئومەویی[١٤٤]، بۆ لە نێوبردنی ئەم بزووتنەوەیە حەجاجی یوسف سەقەفی سوپایەکی ئامادەکرد بەسەرکردایەتی حارث بن عمر وسفیان الحتمی بۆ ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ شبیب خارجی کە لەخانقین خۆی حەشاردابوو[١٤٥]. ئەوە بوو دوایی پێکدادانێکی زۆر، سوپای حجاج شکا[١٤٦]. لەوانەیە

کوردەکانی خانەقین یارمەتی شبیبی خارجیان دابێ چونکە ژمارەی خەواریجەکان کەم بووە لە چاو سوپایی حجاج بۆیە بەیارمەتی کوردەکان توانیویەتی سوپای حجاج بشکێنێت..

دوایی ماوەکی تر چەندین جار شەڕو پێکدادان لە نێوان شبیب و سوپای ئومەوییەکان ڕوویداوە، بەمەش حجاج مەترسی شبیبی بۆ دەرکەوتوە بۆیە زۆربە وردی چاودێری دەکرد[147]. لە هەولێکدا شبیب ویستی بچێتە ناو کوفە کاتێك حجاج بەمەی زانی سوپایەکی ٢ هەزار کەسی بۆنارد ڕێگەی پێگرت بۆیە ناچاربوو ڕووی کردە ( داقوقا )[148][149]*، هەروەها چوونەتە ناوچەی خانیجارو تێیدا ماوەتەوە[150]، دوایی ئەوەی حجاج عبدالملك کوڕی مەروانی لەم بارودۆخە ئاگادار کردۆتەوە ئەویش هێزێکی لە خەڵکی شام کۆکردۆتەوە بۆی نارد[151]. شبیب ڕووی کردە ئەهواز لە کرمان جێگر بوو[152]، وە هێزێکی تر بە ٤٠٠٠هەزار کەسەوە بەسەرکردایەتی (سفیان بن الابرد) نارد[153]، بەمەش شبیب وهاوەڵەکانی کەوتنە نێوان هێزی شام و عێراقەوە لەئەهواز شەڕ لەنێوانیان ڕوویدا، شبیب لەکاتی پەڕینەوەی لەپردی ئەهواز* ئەسپەکەی کەوتەخوارەوە خنکا[154]، چونکە چەك و تفاقی زۆری لە خۆی بەست بوو[155]، بەمەش بزووتنەوەکەی شبیب لەساڵی (٧٨ك) کۆتایی پێ هات[156]، لایەنگرانی هەڵاتن بۆ ناوچەکانی کرمان و ناوچەکانی تر[157].

**٦- بزووتنەوەی مترف کوڕی مغیرە کوڕی شعبە( ٧٧ك ) :**

بزووتنەوەیەکی تری خەواریجە لە ڕۆژگاری خەلافەتی عبدالملك کوڕی مەروان دەرچوون[158]، مترف لەسەرەتادا والی حجاج بوو لە مەدائن بەڵام پاشان پەیوەندی کرد بە شبیب خارجی تاوەکو دژی حجاج راوەستن[159]،

ئەوەبوو مترف کەس وکارو لایەنگرانی کۆکردەوە ڕووی کردە هەرێمی چیا بەتایبەتی حلوان[160]. حجاج سویدی کوڕی عبدالرحمانی سعدی لە ساڵی(77ك) کردبووە والی حەلوان[161]، سوید ویستی بە پشتیوانی کوردەکان ڕێی لێ بگرێت و ماوەی نەدا خۆی بکات بە حلوان[162]. ئەوەبوو سوید هێزێکی نارد بەسەرکردایەتی حجاج بن جاریە بۆ ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ مترف، بەڵام کاتێك زانی شەڕ دەکەن ئەوا نوێنەرێك دەنێرێتە لای بەناوی (رۆستەم) پێی دەڵێت: ئەگەر لە سنوری ئێمە دەربچێت شەڕتان لەگەڵ ناکەین، ئەگەر بمێنێنەوە ناچارین لە دژتان بجەنگین[163]، پێ دەچێت ناوی رۆستەم ناوێکی فارسیە لەهەمان کاتدا کوردیشە، کوردەکان زۆرجار ئەم ناوە لە خۆیان دەنێن[164]، مترف ناچار بوو شەڕ بەتاڵ بکات بەیارمەتی ئەو خەواریجانەی دابونە پاڵی لەڕاستی چەپی کلکەی شاخەکەی حەلوان پەلاماری کوردەکان بدات دوایی بەرەو هەمەدان پێشڕەوەی کردوە[165]، هەرچەندە برایەکی والی بووە لە هەمەدان، بەڵام لەترسی حەجاج نەیتوانیوە یارمەتی بدات، وە ڕێگەی پێنەداوە بمێنێتەوە[166]، پاشان مترف وهاوەڵەکانی چوون بۆ قم وقاسان وصهان[167]، دوایی ئەوە تەبەری دەڵێت :حەجاج لەشکرێکی شەش هەزار کەسی کە کوردیشی تێدابوو بۆ شەڕ ئامادەکرد[168]. ئەم لەشکرە بەهەزاران کوردی تێدابوو[169].

پاش ئەوەی شەڕێکی گەورە ڕوودەدا لە نێوان حەجاج و لایەنگرانی مترف لەم شەڕدا مترف وژمارەیەك لایەنگرانی دەکوژرێن وکۆتایی بەبزووتنەوەکەی مترف دێت[170]، ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە کوردەکان ئەم جارەیان پێچەوانەی بزووتنەوەکانی تر، دژی وەستاون ئەوەش لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ

ئەودڵ ڕەقی و بێ بەزەیەو توندوتیژیەیی حەجاج کە کوردەکانی ناچارکردوە بێنە ڕیزی سوپایی ئومەیەوە بۆ دژایەتی مترف..

**٧- بزووتنەوەی بهلول کوڕی بشیر الشیبانی (١١٩ك):**

بەهلول الشیبانی کەبە(کثارة)ناسراوە، لەسالی(١١٩ك)لەدێیەك لەدێیەکانی موسڵ دەرچوو لەدەسەلاتی خەلافەتی ئومەویی[١٧١]. لەسەرەتادا نزیکەی ٤٠کەسی لەگەڵدابوو[١٧٢]، هۆی دەرچوونەکەشی تەبەری دەڵێت کثارة لەسەرەتا بەنیازی حەجکردن دەرچوو بوو[١٧٣]، بەلام کاتێ لەیەکێك لەدێیەکانی(ڕەشەخاك) ، داوای لەنۆکەرەکەی دەکات، کەبچێ سرکەی بۆ بکڕێت، بەلام ئەو لەجیاتی سرکە ئارەقی بۆ دەهێنێت، داوای لێدەکات بیگەڕێنێتەوە، بەلام فرۆشیارەکە رازی نەبوو، بەڵکو سکالای لەلای بەرپرسی دێیەکە لێ کرد[١٧٤]، هەرچەندە لەخەلیفە هیشامی کوڕی عبدالملك نزیك بوو، بەلام گوێی پێنەدا دەرچوو دژ بەخەلافەت[١٧٥]، بەلام ڕوودوانێکی لەم شێوەیە وا لەپیاوێك ناکات بۆ ئەوەی دەربچێ(ئەوکاتە نابێتە بزوتنەوتنەوەیەکی خەواریجی) بەڵکو دەرچوونەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بەهلول (کثارة)، وا گومانی دەبرد کە( خالد بن عبدالله القسری) لەلایەن خەلیفە هیشامەوە ناردرابوو، بۆ ئەوەی ببێت بەحاکمی ئێراق کەمزگەوتی تێکدەداو یارمەتی مەجوسی وفارسەکانی دەدا، وە ڕیگەیدەدا مەسیحی وجولەکەکان ئافرەتی موسڵمان مارە بکەن[١٧٦]، چونکە دایکی خالد کوڕی عبدالله المصری)مەسیحی بوو[١٧٧]، پاش ئەوەی خالید بەچالاکی بەهلولی زانی سوپایەکی نارد بۆ ناوچەکانی جەزیرەی فوراتی، بەلام بەهلول ڕووبەڕوویان بۆتەوە وەسەرکەوت بەسەریاندا، لایەنگرانی بەدوایان کەوتن تاوەکو

کوفه[١٧٨]، دوای ئەوە بەهلول ڕوویکردە موسڵ لەوێ چەند کەسێ لەخەڵکی موسڵ وجەزیرە هاتنە پاڵی[١٧٩]، ژمارەی زیادی کرد بۆ٩٠کەس[١٨٠]، دوورنییە کوردەکانی دەوروبەری موسڵ جەزیرە هاتبنە پاڵ ئەم بزووتنەوەیە، لەهەمان کاتیشدا کوردەکانی جەزیرە یارمەتی ئومەوییەکانیانداوە بۆ لەنێوبردنی بزوتنەوکەی بەهلول[١٨٠]، لەموسڵ بەرپرسی شارەکە لێی ترسا بۆیە خەلیفەهیشامی لێ ئاگادارکردەوە، دوایارمەتی لێکرد بۆ شەڕکرد لەگەڵ بەهلول بەلام خەلیفە بەهلولی نەدەناسی تەنیا نازناوەکەی نەبێت، بۆیە بەرپرسی شارەکە ئەمجارە بۆی نووسیی (کثارة)ی ، خاریجی[١٨١] ئەوەبوو سوپایەکی٢٠هەزارکەسیان نارد لەخەڵکی عیراق وشام وجەزیرە پێك هاتبوو[١٨٢]، ئەوەبوو شەڕ لە نێوان موسڵ وجەزیرە لەناوچەیەك پێی دەووترێت (کحیل) بەیەکگەیشتن، بەلام خەواریجەکان نەیانتوانی خۆیان بەرامبەر ئەم سوپا زۆرە ڕابگرن، بەهلول لەم شەڕەدا کوژرا[١٨٣]، هاوڵەکان هەندێکیان کوژران ئەوانی تر ڕایان کرد[١٨٤]، لەوانەیە بۆ ناوچە کوردییەکان ڕایان کردبێت دوایی هاتونەتە ڕیزی بزووتنەوەکانی تر.

٨-**بزوتنەوە سعد کوڕی بهدل الشیبانی( ١٢٦ك ):**

سعدکوری بەهدل*[١٨٥] کوڕی قاسطة لەبنی شیبانه[١٨٦]، سەرکردایەتی بزوتنەوەیەکی خەواریجی کرد لەساڵی(١٢٦ك) ،لەوکاتەی بارودۆخی خەلافەت لە ئالۆزی دابوو(خەلیفە ولید کوڕی یەزید) کوژرابوو وەمەروانی کوڕی محمد بە کاروباری شامەوە خەریك بوو، ئەوا لەهەرێمی جەزیرەی فوراتی لەکەفرتوتا[١٨٧]، بە٢٠٠کەسەوە لەلایەنگرانی لەدەسەلاتی ئومەویی دەرچوون[١٨٨]، پاشان رووباری دیجلەیان بڕی چوون بۆ دێی باقردی[١٨٩]،

یـازده رۆژ تێیـدا ماونەتـەوە[190]، ئـەوەش دادەنرێـت بەیەکـەم دەرچـوونی بزووتنەوەی خەواریج لەسەردەمی خەلافەتی مـەروانی کوری محەمـەد(١٦٢-١٣٢)[191]. سعدکوری بحدل لەناوچەکانی موسڵ دەستی کردووە بەبانگەشە بۆ بزووتنەوەکەی[192]، دوای ئەوە لایەنگرانی (سەعدکوری بحدل) زیادیکردوە نزیکەی سێ سـەد کەسی تـر هاتونەتـە پـاڵی بـەوەش ژمـارەی هاوەڵـەکانی گەیشتە پێنچ سەد کـەس. چـەند رۆژێك لەدەوروبـەری موسـڵ مانـەوە، دوای ئەوە سـەعد کوڕی بحدل لەگـەڵ هاوەڵـەکانی بـەرەو شـارەزوور چـوون[193]، لەشـارەزوور ژمارەیـەکی زۆر لـەکوردەکانی ئـەم ناوچـەیە بوونەتـە لایـەنگری بزووتنەوەکە، بەم جۆرە ژمارەیان گەیشتۆتە چوار هەزار کەس. ابن کثیر لەم بارەیەوە دەڵێت: (لم یجتمع مثلها الخارجي)[194]، لێرەدا گومانی تێدا نـامێنێ ژمارەیـەکی زۆر لـەکوردەکانی شـارەزوور هاتونەتـە نـاو بزووتنەوەکـەی (سـەعدکوری بەحدل). چونکە پـێش هـاتنی بۆشـارەزوور ژمارەیـان لـەپێنچ سـەدکەس تێپـەری نـەدەکردوە[195]، ئـەوەش دەگەڕێتـەوە بۆئـەو شـێوازە نوێیـەی کـە پـەیڕەویان دەکـرد بـۆ بزووتنەوەکـە[196]، لەلایـەکی تـرەوە کوردەکان هاوکاری ابن بحدل یان کردوە دژ بە بزووتنەوەکەی بسطام کوری لیث، کە هەڵسابوو بەکوشتاری کوردەکان[197]، لەوانەیـە ئـەو هۆیـە بووبێـت، وای لـە سـعد کـوڕی بحـدل کردبـێ هێـرش بکاتـە سـەر بسطام کۆتـایی بـە بزووتنەوەکەی بهێنێ.. سەبارەت بە کۆتایی ابن بهدل ئـەوا توشـی نەخۆشـی تاعون هات لە ڕێگەی چوونی بۆ کوفە مرد[198]، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکی تـر دەڵێن لە سـاڵی (١٢٧ك) لـە شـارەزوور مـردوە[199]، لـە دوای خـۆی زوحـاکی

کوڕی قیس کردە جێنشینی خۆی درێژەی بەبزووتنەوکەدا لە شارەزوور وناوچەکانی تر[٢٠٠].

**٩-بزووتنەوەی بسطام کوڕی لیث الثعلبي ١٢٦ك :**

بسطام کوڕی لیث بیروباوەڕی بەیەسی هەبوو*، بلازەری دەڵێت: منداڵی دەکوشت[٢٠١] دەیگوت: ( اقتل المخلوق فالحقة بالحق )[٢٠٢]، لەساڵی (١٢٦ك) لە ئازەربێجان لە دەسەڵاتی خەلافەت دەرچوو.

بزوتنەوەکەی بسطام لەناوچەیەکی فراوان بڵاوبۆتەوە کە لە ڕۆژهەڵاتی ئازەربێجان دەست پێ دەکات تاوەکو ڕۆژئاوایی هەرێمی جەزیرە، ئەم بزووتنەوەیەش خەواریجەکان وئومەوییەکان لە دژی وەستان[٢٠٣].

بسطام کوری لیث ڕووی کردە جەزیرە ئەوە بوو توانی بچێتە ناو موسڵ بۆ ماوەیەك تێیدا مایەوە دوایی ڕووی کردە بلد، تێیدا نیشتەجێ بوو پاشان ڕووی کردە نصیبین ( المنادی کوڕی عەقەبە ) والی ئومەوییەکان بوو، خۆی دابەدەستەوە، پاشان بەرەو ناوچەی بازبدی بەرێکەوت[٢٠٤]، دواتر بەرەو باقردی دەرچوو، خەڵکەکەی ڕازیی بوون لەسەر ئەوەی بیکەنە والی خۆیان[٢٠٥]، لەوانەیە بەهۆی ترس بوو بێت ڕازی بوونە ببێتە والییان، چونکە هەرکەسێ دژیان بوایە دەیان کوشت هەر بۆیە هەر دوایی ئەوەی گەڕایەوە موسڵ سیاسەتی گۆڕی بۆ شەڕ وەچەندین هێرش وکوشتاریان لە دەوروبەری موسڵ ئەنجامدا[٢٠٦]، پاشانیش ڕووی کردە شارەزوور کە( جداری کوڕی قیس الشیباني) والی مەروانی کوڕی محەمەد بوو لە شارەزوور گەمارۆیدا، بەڵام نەیتوانی بچێتە ناوی، لەپاشان گەڕایەوە بۆ سواد لە ڕێگەدا توشی

هەندێك لەکوردەکان بووە شەڕی لەگەڵ کردوون[٢٠٧]، لەوانەیە بەهۆی ئەوە بوبێت لە شارەزوور دۆراندبێتی[٢٠٨].

ئەوەی شایەنی باسە ئەم بزووتنەوەیە پێچەوانەی بزووتنەوەکانی تر، کوردەکان دژی بوونەوە هیچ ئاماژەیەك نییە بۆ بەشداری کورد لەم بزووتنەوەیەدا، ئەمەش لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ سروشتی بزووتنەوەکە کە بڕوایی بە توندوتیژی هەبووە. سەبارەت بە کۆتایی بسطامیش ئەوا سعدی کوڕی بحدل سوپای ناردۆتە سەری لەو کاتەی بسطام لەرێگادا بووە لە شارەزوور بۆ عێراق ئەوەبوو ئەو سوپایە لە ساڵی(١٢٧ك) توانی بسطام هەندێك لە لایەنگرانی لەناوببات ئەوانی تریش پەرتەوازە بکات[٢٠٩].

**١٠- بزووتنەوەی زوحاك کوڕی قیس ( ١٢٧ك ):**

زوحاك کوڕی قیس کوڕی صحین عبدالله کنیەی (اباسعد)یە یەکێکە لە زانایانی خەواریج[٢١٠]، لەپاش مردنی سعدی کوڕی بهدل لەساڵی (١٢٧ك) سەرکردایەتی بزووتنەوەی خەواریجەکانی کرد[٢١١]، ئەم بزووتنەوەیەش مەترسیدارترین بزووتنەوەی خەواریج بوو، لە سەردەمی خەلافەتی مەروانی کوڕی محمد، بۆ سەر خەلافەتی ئومەویەکان[٢١٢]، ئەمەش دەرفەتێکی باشی بۆعەبباسیەکان رەخساند بۆ ئەنجامدانی کارو چالاکیەکانیان[٢١٣]، لەو ماویەدا بانگەوازی عەبباسیەکان ناوچە کوردنشینەکانی گرتبووە[٢١٤].

زوحاك کوڕی قیس پێچەوانەی سعدی کوڕی بحدل بوو، نەچوو بەرەو کوفە بەڵکو رووی کردە شام بۆ لەنێوبردنی مەرکەزی هێزی ئومەویەکان، بەڵام لایەنگرانی رازی نەبوون[٢١٥]، ژمارەیەکی زۆر لایەنگری پەیداکرد. لەم بارەیەوە تەبەری دەڵێت :( فلم يجتمع مثلهم الخارجي فقط قبلة )[٢١٦]،

ئەوانەی لەگەڵی دابوون زۆربەی لەگروپی صفریەکان بوون زوحاك کوڕی قیس شارەزووری کردە بنکەی خۆی بۆ پەرەپێدانی بزووتنەوەکەی[٢١٧]، ژمارەیەکی زۆر لەکوردەکانی ئەم هەرێمە هاتونەتە ڕیزی ئەم بزووتنەوەیە بەجۆرێك ژمارەیان گەیشتۆتە چوارهەزار کەس[٢١٨]، دوای ئەوەی زوحاك توانی دەست بەسەر شاری کوفە دابگرێت[٢١٩]، بەجۆرێك زوحاك دەسەلاتی بەسەر عێراقدا سەپاند هیچ کام لەخەواریجەکان نەیانتوانیوە وەکو ئەو بکەن، ئەمەش قۆناغێکی نوێ بوو لەبزووتنەوەی خەواریج[٢٢٠].

لەهەنگاوێکا زوحاك هەڵکشا بەرەو جەزیرە بۆ لێدانی هێزی ئومەوییەکان، ئەوەبوو لەشاری نصیبین بۆماوەی دوومانگ گەمارۆدران لە لایەن هێزێکی زۆر ئومەوییەکانەوە، ئەمەش لەساڵی( ١٢٦ك) بوو[٢٢١]، مەروان سەرقاڵی لەنێوبردنی یاخیبوانی (حمص ) بوو، بۆیە نەی دەتوانی یارمەتی عێراق بدات[٢٢٢]، هەرچەندە چەندجارێکش سوپایی ڕەوانەکرد بۆرووبەڕووبونەوەی زوحاك، لەلایەکی ترەوەخەڵکی ناوچەکە یارمەتی مادی مرۆیان دەدا ، بەتایبەتی کوردەکان لە پاش ئەوەی مەڕوانی کوڕی محمدی توانی کارو بارەکانی خۆی جێبەجێ بکا لەشام، ئنجا ڕووی کردە زوحاکی کوڕی قەیس، بۆ ئەوەی لەناوی ببات ئەوە بوو هەردوولا لە هەرێمی جزیرەی فوراتی لە ناوچەی کفرتوتا بەیەك گەیشتن ، شەڕێکی توند لەنێوان هەردوولادا ڕوویدا، لەئەنجام سوپای ئومەوییەکان توانی سەرکەوێت ئەوەش لە ساڵی( ١٢٩ك) زوحاکی کوڕی قەیس لەو شەڕەدا کوژرا[٢٢٣]، تەرمەکەیان بەشارەکانی جزیرەدا گێرا[٢٢٤]، ئەمەش لەوانەیە بۆ چاوترساندنی کوردەکانی هەرێمی جزیرە بێت چونکە ژمارەیەکی زۆرلە کوردەکانی ئەو هەرێمە هاتوونەتە ڕیزی

بزوتنەوەکەی زوحاکی کوڕی قەیس بە کوژرانی زوحاک گاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە سەرخەواریجەکان دوای ئەوە شەیبان کوڕی عبدالعزیز پێش نوێژی بۆیان کرد درێژەی بە بزوتنەوەکەدا[٢٢٥].

١١- **بزووتنەوەکەی شەیبان کوڕی عبدالعزیز الیشکری** (١٢٩ک):

شەیبانی کوڕی عبدالعزیز لە ساڵی ١٢٩ک سەرکردایەتی بزووتنەوەی خەواریجی کرد لەسەرەتای چالاکی یەکانی دا ڕووی لە شاری موسل کرد و چووە ناوییەوە[٢٢٦]، مەڕوانی کوڕی محەمەد دواهەمین خەلیفەی ئومەوییەکان زۆر بەوردی چاودێری دەکردن[٢٢٧]. لەناوچەکانی کەناری دیجلە مەڕوان بۆ ماوەی شەش مانگ گەمارۆی خستە سەریان[٢٢٨]. خەڵکی موسڵ لەگەڵ خەواریجەکان بوونە، دژ بەئومەوییەکان جەنگاون[٢٢٩]، ئەمەش بۆتە بێزاری مەروان لە خەڵکی موسل ئەم تورەبوونەی مەڕوان دنیهاتەکوردەکانی دەوروبەری موسلی گرتەوە، ئیتر بەم شێوەیەشەڕکردن لەنێوان هەردوولادا بەردەوام بوو، بەڵام مەروان نەیتوانی خەواریجەکان لەناوبەرێت بۆیەفەرمانی بەیەیزیدی کوڕی عمری هەبیرە کرد، کەوالی عێراق بوو لەگەڵ خەواریجەکان بجەنگێت. لە ئاکامدا ناوچەکانی السن[*٢٣٠]، بەیەك گەیشتن ئەوەبوو سوپای ئومەوییەکان توانی سەرکەوێت بەسەر خەواریجەکان[٢٣١]. ئنجا دوای ئەم سەرکەوتنە یەزید کوڕی عمر داوای یارمەتی لە خەلیفە مەڕوان کرد کە هێزێکی زیاتری بۆ بنێرێت بۆ ئەوەی یەکجاری خەوارجەکان بنبڕ بکات[٢٣٢]. لەوکاتەدا خەواریجەکان بەمەیانزانی بۆیە لە موسڵەوە دەرچوون بۆ حەلوان[٢٣٣]، پاشان لەوێشەوە چوون بۆ شارەزوور[٢٣٤]، دوای ئەوەش بۆ هەرێمی کرمان[٢٣٥]، وادیارە کوردەکانی ئەم ناوچانە داڵدەیان داون و

هاوسۆزییان بۆ بزووتنەوەکە دەربڕیوە بەڵام لەترسی دەسەڵاتداراتی ئومەویی نەیانتوانیوە بەئاشکرا یارمەتیان بدەن.

پاشان شەیبان و شوێن کەوتواتی نەیانتوانی خۆیان بەرامبەر هێزی ئومەویەکان رابگرن بۆیە ناچار بوون ڕوویان لە ناوچەکانی عەمان کرد، هەرلەوێش لە سالی( ١٢٩ك) کوژرا[٢٣٦]، بە کوژرانی شەیبان کۆتایی بە بزووتنەوەی خەواریجەکان هات[٢٣٧]، دوایی ئەوە لەسەردەمی عەبباسەکان چەندین بزووتنەوەی تر خەواریج سەریان هەڵدا.......

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:

[١] دائـرة المعـارف الاسـلامية،مـادة الخوارج ترجمة ابراهيم زكي،القاهرة ،١٩٦٩،ج ٨،ل ٤٦٩.

[٢] اخرجة مسلم(١٧٧١)في باب الزكات ،والبخاري(٦٤١٨)،في المرتـدين وقتـل الخوارج.

[٣] نـايف محمـود معـروف،الخـوارج في الـعصر الامـوي،نـشأتهم،تـاريخهم عقاءدهم،ادبهم،ط١،بيروت،١٩٧٧،ل٤٧.

[٤] القلقشندي،صبح الاعشى في صناعة والانـشاء ،تحقيـق محمـد حـسين سيف الدين،تيروت،١٩٦٣،ج ١٣،٢٢٥.

[٥] مـصلح جلالـي ، شـوراته كان،ط١،بغداد،١٩٨٦،ل ٣٧.

[٦] خالد عبدالمنعم العاتي، موسوعة العراق الحديث،مجلدا،ط١،بغداد،١٩٧٧،ل ١٢٧.

[٧] البغدادي ، الفرق بين الفرق ، تحقيق الجي منعم ، القاهرة ، دت ، ل ٢٦١.

[٨] المبرد ، الكامل في اللغة والادب ، ، تحقيق محمد الو الفغل ابراهيم ، السيد سماه ، القاهرة ، ١٩٩٩ ، ج٢ ، ٥٩٣ ، ابن عبدربه ، العقد الفريد ، تحقيق مجمد سعيد العريان ، بيروت ، ج٢ ، ل ٢٣٤.

[٩] الملل والنحل، تحقيق الشيخ فهمي محمد ، القاهرة ، دت ، ج ٢٢ ، ل ١٥٧.

(١٠) نایف محمود ، الخوارج في العصر الاموي ، ل ٢١٩.

(١١) هەمان سەرچاوە ،ل ٢٢٠

(١٢) الاشعري ، مقالات الاسلامين ، تصحيح هلمون ريزفيسبادن ١٩٦٣ ، ج١ ، پەراوێزی(١) ، ل ١٦٧ ، البغدادي ، الفرق بين الفرق ، ل ٥٦

(١٣) نايف محمود ، الخوارج في العصر الاموي ، ل ١٩٣

(١٤) د.م.ا ، مادة الخوارج ،٨ ، ل ٤٦٩

(١٥) البغدادي ، الفرق بين الفرق ، ل ٤٦١

(١٦) سورة (النساء) ، ئايە تي(١٠٠)

(١٧) نايف محمود ، لخوارج في العصر الاموي ، ل١٩٤.

(١٨) مصلح جلالی ، شوراتە کان ، ل ٦٤.

(١٩) فەرید ئەسەسەرد ، ریشەکای تکفیر لای خەواریج ...، ل ٣٣

(٢٠) زۆرجار خەواریجەکان لە مێژوو بە شوراتەکان ناویانگن ، ئەمەش نازناوێکی گشتیە بەسەر خۆیان دا سەپاندووە ئەو ناوەشیان لەسەردەمی دروست بوونیان لە خۆیان ناوە گوایە خۆیان فرۆشتووە بە خوا ئەوەشیان لە ئایەتە وەرگرتووە ( ان الله اشترى المؤمنين انفسهم واموالهم بأن لهم جنه )) سورتی توبە ئایەتی ١١١ ، الخربوطلی ، ثورات فی الاسلام ، بیروت ١٩٧٨ ،ل٥٠.

(٢١) شهرستاني، الملل والحل ، ل ١٥٧.

(٢٢) مصلح جلالی، شوراتەکان ، ل ٩.

(٢٣) ابن قتيبة ،الامام والسياسة ، ط٣ ، البال ، ١٩٦٩ ،ل١٤١.

(٢٤) مصلح جەلالی،شوراتەکان ،ل ٢٩.

(٢٥) المبرد ، الكامل فی اللغةوالادب ،ابن کثیر، البدايةوالنهاية ، مجلد٣ ، ج٦،ل ٢١٦.

(٢٦) حسن المطفوي ، الحقائق في تاريخ الاسلام والفتن والاحداث، ط٢ ، د ، ١٤١٠ ،ل٣٩٠ ،بۆ زیاتری ریوایەتەکە بڕوانە www.islamicweb...

(٢٧) الذهبي ، تاريخ الاسلام وطبقات المشاهير والاعلام ، القاهره ، ١٣٦٧ه ،ج٢ ، ل١٨٤ ، سەیری زۆرترینی فەرموودە بکەبەچەند گێرانەوەیەك کە ابن کثير البدايه والنهايه ،ج٧ ، لە لاپەرەکانی ٢٩٠ تا ٢٧٠ هێناویەتی .

(٢٨) پێغەمبەر(د.خ)دەفەرموێت (يخرج امتي قوم يسئون الاعمال يقراون القران لايجاوز حناجرهم..)اخرجه احمد ،

ئەنتەرنێت ، www.islamicweb...

(٢٩) ئەنتەرنێت ، google...www.islamicweb

(٣٠) محمود اسماعيل ،قضايا في التاريخ الاسلامي ، ط٢ ،المغرب ، ١٩٨١ ، ل ٣٦

(٣١) عبدالمنعم ماجد ، التاريخ السياسي للدولة العربية عصر الخلفاء الامويين ، القاهره ، ١٩٧٦ ،ج٢ ، ل١٣٥.

(٣٢) ابن خلدون ، مقدمة ابن خلدون ، قاهرة ، دت ، ل٦٩ ،محمود اسماعيل ، قضايا في التاريخ، ل٣٦.

(٣٣) ئەنتەرنێت ((اخرجه مسلم ، مسلم ،(١٧٧١) في باب الزكات البخاري (٦٤١٨) ، في باب اسبابه المرتدين وقتل الخوارج ، ل٣.

(٣٤) ادارة العراق في عهد مياد ، بغداد ، ١٩٨٧ ،ل٢٧.

(٣٥) شهرستاني ، الملل والنحل ، ج١ ،ل ١٥٧ ،صلاح عبدالفتاح الخالدي ، الخلفاء الراشدون بين الاستخلاف والاستشهاد ، ط١ ، عمان ، ٢٠٠ ،ل ٣٠٢.

(٣٦) نايف محمود ،الخوار في العهد الاموي ، ل ٢٧.

(٣٧) فەرید ئەسەسەرد ، ریشەکانی تکفیر لەخەواریج تا ....، ل٧٤.

(٣٨) احمد شبلي ، التاريخ الاسلامي والحضارة ، ط١ ،القاهرة ، ١٣٥٤ ، ل ٢٣٩.

(٣٩) مصلح جلالي ،شوراتەکان ، ل٣١.

(٤٠) نايف محمود ، الخواريج في العصر الاموي ، ل١٩٥.

(٤١) هەمان سەرچاوە ،ل١٩٥.

(٤٢) المبرد ، الكامل اللغە والادب ، ل ١٥٠.

(٤٣) احمد امين ، فجر الاسلام ، ج١ ،ل٢٥٩.

(٤٤) الخربوطلي ،ثورات في الاسلام ،ل٢٦٧.

(٤٥) فەرید ئەسەسەرد ، ریشەکانی تفکیرلەخەواریج ، ل٧٥.

** مەوالی:ئەو موسلمانانەن لە دەولەتی ئیسلامدا دەژین عەرەب نین ئەوەش فارس و کوردو رۆم دەگرێتەوە ، وە ماف ئیمتیازیەتیان ناگاتە ئەو کەسانەی عەرەبن ، ابن عبد ربە ، العقد الفريد ، ٤٣٦ ، علی حسن خربوطلی ،

تاریخ فی ظل الحکم الاموی ، السیاسی والاجتماعی والاقتصادی ،مر،١٩٥٩،ل ٢٥٢. بۆزیاتر زانیاری بڕوانە گۆڤاری هەزرین ژمارە ٣ بۆ بابەتیکی خۆم بەناوی بارودۆخی مەوالی لە دەولەتی ئومەوی

(٤٦) خالد عبدالمنعم العانی ،موسوعە العراق الحدیپ ،ج١،ل١٢٧،

(٤٧) ئەنتەرنیت .google...www.islamicwe،

(٤٨) محمود اسماعیل، قضایا فی التاریخ الاسلامي، لمغرب، ١٩٨١، ل ٣٦، ثابت اسماعیل الراوي، العراق في عر الاموي، رسالة ماجستیر تقدیم کلیةالاداي ، بغداد ، ١٩٥٥ ، ل ٢٢٣.

(٤٩) احمد امین ، فجر الاسلام ، القاهره ، ١٩٥٥ ، ج١ ، ل٢٥٧.

(٥٠) فەرید ئەسەسەرد ، ریشەکانی تفکیرلە خەواریج ، ل٧٣.

(٥١) محسن محەمەد حسین ، پێشەکی(شوراتەکان) ، ل٩ .

(٥٢) هەرچەند ووشەی کۆماری و دیموکراتی نەبووە لەو سەردەم بەلام مێژوونوسانی نوێ بەکاری دەهێنن بۆ بیروباوەری خەواریجەکان ، رمزی عبدالوهاب ، ادارة العراق فی عهد زیاد بن ابة .

(٥٣) شهرستاني ، العل ا لنحل ، ج١ ، ل١٥٨،

(٥٤) ئەنتەرنیت(ظهور الخوارج),Islamic.com,page.

(٥٥) ابو سعید خدری حدیسەکەی گێراوەتەوە دەفەرمووێت ((حتی یکون علیکم اثناعشرکلهم تجتمع علیه الامه.....قال لکهم من قریشي)) راجع السلسة الصحیة البانی(١١-٨٣٠).

(٥٦) مهند ماهر جاسم ، الحرکات المناهضة اعلاقة مروان بن محمد من بلاد الشام والجزیرة الفراتیة ، رسالة ماجستیر ، لکلیة الاداب ، جامعة ، ١٩٨٦ ، ل٢٩.

(٥٧) ابن الاثیر ، الکامل ، ج٣ ، ل١٨٧.

(٥٨) المسالك والممالك ، ل٢٨٢.

(٥٩) ابن الاثیر ، الکامل ، ج٣ ، ل ١٨٧ ، احمد میرزا ، غرب اقلیم الجبال، ل١١٥ ،

(٦٠) ابن الاثیر ، الکامل ، ج٣ ، ل ١٨٧.

(٦١) کتاب البلدان ، ل٣٥.

(٦٢) البلاذري ، انساب ، ج ٧، ل٣٧٢ ، نایف محمود ، الخوارج ، ل ١٧٣.

(63) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ج٣، ل ١٨٧.

(64) فائزة محمدعزت ،الكرد في اقليم الجزيرة وشهرزور ،ل١١٣.

(65) سڤین دهان ، رۆشنبیری کوردستان ،ژمارە ٢٠٠٢،٨،٨،ل٨.

(66) شـــوان عوسمـــــان مـــستەفا ، کوردستان و پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد ، چاپی یەکەم ،سلێمانی ٢٠٠٢ ،١٩٩١، ٥٢.

(67) ابـن الاثـير ،الكامـل فـي التـاريخ ،ج٣،ل١٨٧.

(68) هـــەمان سەرچـــاوە ،ج٣،ل١٨٧، فـائزة محمد عزقت ،الكرد في الاقليم وشهرزور، ١٠٨.

(69) فـائزه محمد عـزەت ،الكـرد فـي الاقليم وشهرزور، ١٠٨.

(70) ابن مهلهل الرسالة الثانية ،٥٩ ،لە فائزة محمد وەرگیراوە .

(71) مروج الذهب ومعادن الجوهر، وتنقيع شـارل بـيلا ، بـيروت ،١٩٧٣ ، ج٣، ل١٩٣.

(72) عبدالمنعم ماجد ، تـاريخ السياسى للدولةالعربية ،الدولة الاموى ،ل٤١٥.

(73) ئارشـاك پـۆلا ، کـورد لەسەرچـاوە عەرەبییەکان ، ل٤٥.

(74) محمدجاســم الحمــادى ، الجزيــرة الفراتية والموصل،٤١٦

(75) سڤین دهـان ، گۆڤـاری رۆشـنبیری کوردستان ،ل٩.

(76) فـواد مجید میسری ، کۆمەڵگا لـە سـایەی دەولـەتی خەلافـەت ، چـاپی دووەم ،دت،٢٠٠٢،ل٤٨.

(77) فائزة محمـد عزەت ، دور کرد فـی حركة مطرف بن مغيرة و عبدالرحمن بن الاشعث ،ل١٠٧.

(78) مصلح جلالـی ،شوراتەکان ، ل٤٥، فەرید سەسەسەرد ، ریشەکانی تکفیر لە خەواریجە تا...،٧٢.

(79) جـــاحظ، البيـــان والتـبين ،ط٤ ، بيروت ،١،٢٠٠٠ج،ل٢٣١.

(80) ابـن الاثـير ،الكامـل فـى التـاريخ، بيروت ،١٩٦٧،ط٣،ل١٧٨.

(81) هـــەمان سەرچـــاوە ،ج٣،ل١٧٨، فـائزه محمـدعزەت ،الكـرد فـى الاقلـيم الجزيرة وشهرزور ،١٠٨.

٨٢–٨٠– البلاذرى ،الانساب الاشراف ، ج٦، ل٣٤

(٨٣) ابـن حوقـل صـورة الارض ،بيروت،١٩٧٩،ل٣٠٤.

(٨٤) فائزه محمد عزت ،الكرد فى اقليم الجزيرة وشهرزور ،١٠٨.

(٨٥) ابن مهلهل ،الرسالة الثانية ،ل٥٩، له فائزه وەرگیراوە.

(٨٦) الـذهبى : مـروج الـذهب والمعـادن الجوهر ، ل١٣٧.

(٨٧) محمـد جاسـم الحمـادى، الجزيـرة الفراتيـة والموصـل (١٢٧-١١٨)، بغداد،١٩٧٧،ل٣٢٢.

(٨٨) العقدالفريد،ج٧،ل٢٤٠.

(٨٩) مـروج ذهـب ، ل١٠، زوبيـر بـيلال اسماعيل ، الاكراد فـى كتـاب ابـن الاثـير ،گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ،ل ٤٣.

(٩٠) صورة الارض، ل١٢٠.

(٩١) بلدان خلافة الشرقية ، لتعريب بشير فرنس كوركيس ،بغداد، ١٩٥٤،ل٢٠.

(٩٢) ابـو فـداء ،التقويم البلدان ،بيروت ،دت، ل٢٥٨.

(٩٣) هەمان سەرچاوە ،ل٣٢٨.

(٩٤) ابـن فقيـة ،مختـصركتاب البلـدان ،ليدن ، ١٨٨٥،ل١٣١.

(٩٥) مـسعودى مـروج الـذهب ومعـادن الجـوهر ،ج٢،بـيروت ،دت،ل١١٠. ابـن حوقـل صـورة الارض ، بـيروت، ١٩٧٩،،ل١٢٩.

(٩٦) خليـل اسماعيـل محمـد، اقليـم كرستان لعراق ، اربيل ١٩٩٨،ج٢،ل٨٣.

(٩٧) البلاذرى ، فتـوح البلدان ،المراجـع وتعليـق ،رضـوان محمـد،بـيروت ، ١٣٢٩ه،١٩٧٨،ل٣٢٣.

(٩٨) البلاذرى ،الانساب الاشراف ، ج٦، ل ٢٧ ، الطبرى ،التـاريخ ،ج٥، ل ٢١٧، ابن الاثير ،الكامل ،ج٣،ل٤٠٩.

(٩٩) بندنجين: شـارێكی ناسراوە لـەنزیك نـەهروان، يـاقوت الحمـوى ،معجـم ،ج١،ل٢١٧، الابـن الاثـير الكامـل ،ج٣،ل٤٠٩.

(١٠٠) البلاذرى ،الانساب الاشراف ، ج٥، ل ،١٦٥ ، الطبرى ،التاريخ ،ج٥، ل ٣٢.

(١٠١) الـدينورى ،اخبـار اطـوال ، تحقيـق عبدالمنعم عامر،مراجعة جمالدين الشيال ،ط١، القاهرة ،١٩٦٠،ل٢٢١.

(١٠٢) الطبرى ،التـاريخ ،ج٥،ل١١٥، الابـن الاثير ،الكامل، ج٣،ل٢٠٦،

(١٠٣) سـيد اميرعلـى ،مختـصر تـاريخ العرب، ل٧٨.

(١٠٤) ابـن الاثـير ، الكامـل ،ج٣،ل٢٠٦، نـايف محمـود ، الخـوارج فـى العـصر

الاموی ،ل٨٣ ، بدیر متولی حمید ، من اداب الحرکات الاسلامیة ، القاهیرة ،دت ، ل٨٣.

(١٠٥) الیعقوبی ، تاریخ الیعقوبی ، ط٢ ،بیروت ،١٩٦٠، ج٢،ل١٣٦، ابن ابن اثیر ،الکامل فی التاریخ ، ج٤، ل٤٠٩ ،نایف محمود ،الخواریج فی العصرالاموی،ل١١٥ ،

(١٠٦) مصلح جلالی ، شوراتەکان ،ل ١٤١.

(١٠٧) البلاذری ،انساب الاشراف ،ج٥،ل ل ١٩-١٧٠، ابن الاثیر الکامل ،ج٤،ل٤٠٩.

(١٠٨) الیعقوبی ،تاریخ الیعقوبی، ج٢،ل٢١٧، الطبری ، تاریخ ،ج٥، ل١٦٦، ابن الاثیر الکامل ،ج٤،ل٤٠٩.

(١٠٩) ابن الاثیر الکامل ،ج٣، ل٤١٠

(١١٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو،ج٣، ل٤١٠ ،ابن کثیر البدایة ، ج٨،ل٤٠، نایف محمود ،الخواریج ،ل١٣.

(١١١) احمد میرزا میرزا ،غرب اقلیم الجبال فی صدر الاسلام ،ل١١٦.

(١١٢) ابن الاثیر الکامل ،ج٣،ل٣٢٤.

(١١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل١١٦.

(١١٤) مصلح جلالي ، شوراتەکان ، ل١٤١.

** رەی :شارێکی بەناوبانگە دەکەوێتە هەرێمی فارس ، یاقوت الحموی ، معجم البلدان ،ج٢، ل٦٥.

(١١٥) الطبري ، تاریخ ، ج٧، ابن الاثیر، الکامل ،ج٣،ل٤٢١.

(١١٦) نایف محمود ، لخواریج في العصر الاموي ، ل١٢٠.

(١١٧) مصلح جلالي ، شوراتەکان ، ل١٤٢.

(١١٨) الطبري ، تاریخ،ج٧،ل١٠٧، نایف محمود ، الخوارج في العصر الاموي، ل١٢٠.

(١١٩) نایف محمود ، الخوارج،ل١٢٠.

(١٢٠) یاقوت الحموي، معجم لبلدان ،ل٧٨.

(١٢١) هەمان سەرچاوەی پیشوو،ل١٢٠.

(١٢٢) ابن خلدون ، تاریخ ابن خلون ، بیروت ، ١٩٩٢،ل٥٣.

** الصفریة : ئەمەش فرقەیەکی خواریجە دەگەرێتەوە بۆ سەرکردەکەیان ( ابن صفار ) بۆ زیاتر زانیاری بروانە نایف محمود ، الخواریج ، ل٢٣٤.

(١٢٣) ابن کثیر ،البدایة والنهایە ،ج٩،ل٨٥.

(١٢٤) نایف محمود ، الخوارج في العصر الاموي ،١٦٢،

(١٢٥) مهند مارهر ،الحركات المناهضة لخلافة مروان بن محمد ..،ل١٣٧.

(١٢٦) هەمان سەرچاوەی پیشوو،ل١٦٣.

(١٢٧) الطبري ،تاريخ ،ج٦، ل٢٢٠، الابن الاثير، الكامل في ..،ج٤، ل٣٩٣،

(١٢٨) الطبري ،تاريخ ،ج٦، ل٢٢٣، الابن الاثير، الكامل،ج٤، ل٣٩٥.

(١٢٩) ئارشاك پولا ،كورد لەسەرچاوە عەرەبیەکاندا،ل٥٢.

** ئامد : شارێکی هەرێمی جەزیرەیە دەکەوێتە بەشی رۆژئاوای دیجلە . ياقوت الحموي،معجم البلدان،ج٢، ل٤٨ ،ابن حوقل ، صورة الارض ،ل٢٨،الطبري ، تاريخ ،ج٦ ، ل٢٢٣.

(١٣٠) الطبري ، تاريخ ، ج٦، ل٢٢٢ .

(١٣١٠) الطبري ، تاريخ ، ج٦، ل٢٢٢ . الاثير ، لمل ، ج٤ ، ل ل٢٩٥-٢٩٦.

(١٣٢٠) جلولا:دەکەوێتەسەر ریگای خوراسان ، تقديم البلدان ، ل٣٠٧،

(١٣٣) الطبري ، تاريخ ، ج٦ ، ل٢٢٣ ، ابن الاثير ، الكامل ، ج٤ ، ل٣٩٦

(١٣٤) الطبري، ج٦ ، ل٢٢ ، ابن خلدون ، تاريخ ، ج٣ ، ل٥٢.

(١٣٥) نايف محمود ، الخواريج في العصر الاموي ، ل١٦٤ ، مهند ماهر ، الحركات المناهصة لخلافةمروان بن محمد ، ل١٣٨

(١٣٦) ابن كثير ، البداية والنهاية ، ج، ل١٢٠.

(١٣٧) البلاذري ، انساب الاشراف ، ج٦ ، ل٣٩ ، الطبري ، ج٦ ، ل٢٣١ ، ابن الاثير ، الكامل ، ج٤ ، ل٤٣ ، ابن كثير ، البداية ، ج٩ ، ل١٠.

(١٣٨) ابن خلكان ، وفياة الاعيان ،ل٤٤٩.

(١٣٩٠) مەلا جميل رۆژ بەیانی، مێژوی حسنەو یهی وعەبیاری ، ل١٦١.

(١٤٠) الطبري ، تاريخ ، ج٨ ، ل٨٩٠ ، ابن الثير ، لمل ، ج٤ ، ل٣٩٥ ، نايف محمود معروف ، الخوارج في العصر الاموي ، ل١٦٤،

(١٤١) نايف محمود ، الخوارج ، ل١٦٤،

(١٤٢) اليعقوبي ، تاريخ اليعقوبي ، ج٢ ، ل٢٧٤،

(١٤٣) محمد جاسم المحادي ، الجزيرة الفراتية ، الموصل ، ل٢٨٨

(١٤٤) البلاذري ، انساب الاشراف ، ج٦ ، ل٣٩ ، الطبري ، ج٦،ل٢٣١، ،ابن

اثیر،الکامل ،ج٤،ل ل٤٣–٦٠ ،ابن کثیر ،البدایة،ج٩،ل١٥١

(١٤٥) البلاذري ، انساب الاشراف ، ج٦ ، ل٣٩

(١٤٦) ابن خلدون ، تاریخ ابن خلدون ، ج٣ ، ل٥٣.

(١٤٧) نایف محمود، الخوارج في العصر الاموي ، ل١٦٦ ، مصلح جلالی ، شوراتەکان ، ل١٧٢.

(١٤٨)** داقوقا: سەربەهەرێمی جزیرەیە کورد تێیدا نیشتەجێیە ، الاصطخری ،المسالك والممالك ،ل٨٥ ،بۆ زیاتر گۆرانکاری ناوەکەی ،بروانە مەلاجمیل رۆژبەیانی ، مێژووی حێزووی حسنەویهی ،ل١٤٩.

(١٤٩) البلاذري ، انساب ، ج٦ . ل٢٢.

** خانیجار: شارۆچکەیەکە دەکەوێتە نێوان هەولێرو (اربل ) وبەغدا نزیك داقوقا ، یاقوت الحموی ، المعجم البلدان ،ج٢،٣٤١.

(١٥٠) البلاذري ، انساب الاشرف ، ج٦ ، ل٢٤ ، الطبری ، تاریخ ،ج٦،ل٢٣

(١٥١) الیعقوبي ، تاریخ ، الیعقوبي ، ج٢ ، ل٢٧٥ ، اب الاثیر ،الکامل ،ج٦ ، ل ٤٢٦نایف محمود ، الخوارج ي العصر الاموي ، ل١٦٧ .

(١٥٢) الیعقوبي ، تاریخ ، الیعقوبي ، ج٢ ، ل٢٧٥ ، اب الاثیر ،الکامل ،ج٦ ، ل٣٢.

(١٥٣) الطبري ، تاریخ ، ج٦ ، ل٢٨ ، ابن الاثیر ، د٦ ، ل٤٢٦.

(١٥٤) الیعقوبي ، تاریخ، ح٢، ل٢٧.

(١٥٥) مصلح جلالی ، شوراتەکان ، ل١٧٩.

(١٥٦) الطبري ، تاریخ ، ج٦ ، ل٣١٨.

(١٥٧) الراوي ، الدولة العربیة ، ل١٧٥.

* لەوانەیە ئەم پردەیە بەلەمی بچوك بێت بەیەکەوە بەستراوەتە ، نزار السعدون ، جذور الشبهات مراً فی حرکات الخواریج ،ط١، دیمشق ،١٩٩٦، ل١٢٣.

(١٥٨) احمد میرزا ، غربي اقیم الجبال في حدد الاسلام ، ل١٣٢ ،

(١٥٩) الطبري ، تاریخ ، ج٦ ، ل٢٩٠.

(١٦٠) ابن الاثیر ، الکامل ، ٤ ، ل٦٤.

(١٦١) احمد عثمان او بکر ، ذکر الاکراد وحولهم في کتابات المسلمین الاوائل ، گۆڤاری کۆری زانیاری کورد ، بەرگی سیازدە ، ١٩٨٥ ، ل١٢٧.

(١٦٢) ابـن الاثـير ، الكامـل ، ج٤ ، ل٢٣٥،رۆژیـەیانی مێـژووی حـسنەویهی عەییار،ل١٦٣.

(١٦٣) هەمان سەرچاوه ،ج٤،ل٢٣٥.

(١٦٤) فـائز محمـد ، دور الكـرد في حركـة مطرف بن مغيرة... ،ل١٠٥.

(١٦٥) الطـبري ، تـاريخ ج٦،ل ل٢٩١-٢٩٢، ئارشاك پۆلا ، كورد لەسەرچاوه عەرەبیەکاندا ،ل٤٦.

(١٦٦) نايف محمود ، الخوارج في العـصر الامـوي ، ل١٠٦، فـائزة محمـد ، الكـرد وحركـة مطـرف ب المغـيرة بـن شـعبة ، ل١٠٦.

(١٦٧) الطـبري ، تـاريخ ، ج٦ ، ل١٨٤ ، نايف محمود ، الخوارج في العصر الاموي ، ل١٦٩.

(١٦٨) هەمان سەرچاوه ،ج٦،ل٢٩٦.

(١٦٩) فـائز محمـد عـزت ،دور كـورد فـي حركة مطرف بن مغيره......ل١٠٦

(١٧٠) عبدالواحـد ذنـون، العـراق في عهـد الحجاج بن يوسف الثقفي ، ط١ ، مكتبـة بسام ، ج١٩٨ ، ل٨٥،

(١٧١) نـايف محمـود، الخـوارج في ا العـصر الاموي ، ل١٧٦،

(١٧٢) الطـبري ، تـاريخ ، ج٧ ، ل١٣٠ ، ابن الاثير ، الكمل ، ج٤ ، ل٢٣١.

(١٧٣) الطبري ، تاريخ ، ج٧ ، ل١٣٠.

(١٧٤) نزار ابوسعيد ، جذور الشبهات ، ل ل١٤٣-١٤٤.

(١٧٥) مهنـد مـاهر جاسـم ، الحركـات لمناهضة لخلافـة مـروا ن بـن محمـد - ل١٣٢.

(١٧٦) الطبري ،تـاريخ ،ج٦، ل٢٢٠، الابـن الاثير، لكمل،ج٤، ل٣٩٣.

(١٧٧) مصلح جلالـي،شوراتەکان، ل١٩٧ ،نزار ابوسعيد ، جذور الشبهات ،ل١٤٤.

(١٧٨) الطـبري ،تـاريخ ،ج٧، ل١٣١ ، مخند ماهر ، الحركات لمناهضة اخلافـة مروا ن بن محمد -ل١٤٠.

(١٧٩) نـزار او سـيد ، جـذور الـشبهات ، ل١٤٤.

(١٨٠) ابن الاثير ، الكامل ، ج٤ ، ل٢٣٢.

(١٨١) مهنـد مـاهر ، لحركـات الماهـضه لخلافة مروا بن محمد ، ل١٣٧.

(١٨٢) الطبرى ،تاريخ ،ج٧،ل١٣٢.

(١٨٣) اليعقـوبي ، تـاريخ ، ج٣ ، ل٦٣، الطبري ، تاريخ ، ج٧ ، ل١٣٢ ، الراوي ، العراق في العهد لاموي ، ل٢٤٢ ،تاريخ

، ج٧ ، ل١٣٢ ، نـزار وسـعيد ، جـذور الشبهات ، ل١٤٤ ،

(١٨٤) نایف محمود ، الخوارج في العصر الاموي ، ل١٧٧ ،

(١٨٥)* خەلیفە بن خیاط بە (بحدل) ناوی دەبات ، تاريخ خليفة ،ج٢، ل ٣٩٠.

(١٨٦) ابن كثير ، البدايه والنهايـه ، ح٨ ، ل٤٢٥ ،

(١٨٧) كفرتوتـا : گونـدێکی گەورەیە لـە جـەزیرە ، دەکەوێتـە نێـوان داراو (راس العـين ) ، يـاقوت ،معجـم البلـدان ،ج٤,٤٦٧.

(١٨٨) الطبري ، تاريخ ، ج٧ ، ل٣١٦ ، ن الاثير ، لكامـل ، ح٤ ، ل٢٨٩ ، الـذهبي تاريخ الاسلام ، ج٥ ، ل٣٣ ، ابن خلدون ، تاريخ ، ج٣ ، ل١٦٤ ،

(١٨٩) باقردی :دەکەوێتە بـاکوری موسـل نزیك جزيرەی ابن عمر، جاسم الحمادی ، الجزيرةالفراتية والموصل ، ل٤٦٣.

(١٩٠) ابن خياط ، تاريخ ، ٤ ،ل٣٧١ ،

(١٩١) محمدجاسـم ا لحمـاد ، الجزيـره الراتيه والموصل ، ل٤٦٢ ،

(١٩٢) مهنـد مـاهر ،ا لحركـات لمناهـضة لخلاقة مروان محمد ، ل١٤٢ ،

(١٩٣) خلفة بن خيـاط ، تـاريخ ، ج٢ ، ٩٠

(١٩٤) البدايـــة والنهايـــة ، ج١٠ ، ل٢٥ ، محمد جاسم ، الجزيرة الفراتيه والموصل ، ل٤٦٤.

(١٩٥) فائز محمد ، الكرد في قليم الجزيـره وشهرزور ، ل١١٤.

(١٩٦) محمـد جاسـم الحمـادي ، لجزيـرة لفراتيه والموصل ، ل٤٤٦.

(١٩٧) البلاذري ،انساب،ج٨، ل٢٥، فـائز محمد، الكرد في اقليم الجزيره، ل١١٥ ،

(١٩٨) الطـبري ، تـاريخ ، ج٧ ، ل٣١٧، ابـن الاثـير ، الكامـل ، ج٤ ، ل٢٨٩، ب خلدون ، تـاريخ ، ج٣ ، نـايف محمـود ، الخواريج في لعصر الاموي ، ل١٧٨.

(١٩٩) محمـــد جاســـم ، تـــاريخ ، ج٧ . لجزيرة الفراتيه ، ل٤٧ ، لەبەرویزوە.

(٢٠٠) الطـــــبري ، تـــــاريخ ، ج٧ ، ل٣١٨،نـــايف محمـــود ، الخـــواريج في العصر الاموي ، ل١٧٨.

(٢٠١) ئـەم نـاوەش دەگەڕێتـــەوە بـۆ پێـشەوەیەکەیان ، (ابـن بيهـسى ) ، المبرد ،كامل فى اللغة ، ج٢٢،ل٢٠٢، بۆ زیـاتر زانیـاری بروانـە نـایف محمـود ، الخواريج فى العصرالاموى ، ل١٣١

[202] دەیان گوت منداڵی ئیمانداران ئیماندارن ، منداڵی کافرەکان کافرن ، ئەگەر پێشەوایی ناوچەیەك کافر بێت ، خەڵکی ناوچەکەش کافر دەبێت . الملل والنحل ، ج١، ل١٦٩.

[203] انساب الاسراف ،ج٨،ل١٢٨.

[204] حمادی ، الجزیرة الفراتیة والموصل ،ل٤٦٨.

[205] بازبدی :ناوچەیەکە کەوتۆتە خۆر ئاوای دیجلەوە ، بەرامبەر باقردی ، لە جزیرەی ابن عمر ، البلاذری فتوح البلدان ، ١٨.

[206] هەمان سەرچاوەی پێشوو ،ل٤٦٨.

[207] حمادي ، لجزیرة الفراتیه والموصل ، ل٤٦٨ .

[208] ابن خیط ، تاریخ ، ج٢ ، ل٤٠٢ ،البلاذري ، انساب ، ج٩ ، ل٢٥١.

[209] هەمان سەرچاوەی پێشوو ،ل ٤٦٩.

[210] الطبري ، تاریخ ، ج٧ ، ل٣١٦، ابن الاثیر ، الکامل، ل٣٣٤.

[211] الجاحظ ، البیان والتبیین ، ج١ ، ل٣٤٣ ،

[212] الطبري ، تاریخ ، ج٧ ، ل٣١٧،ابن کثیر ، لبدای ، ج١٠ ، ل٢٥ ،نایف محمود، ظهور الخوارج في العصر الاموي ، ل١٧٨.

[213] مهند ماهر، الحرکات لمناهضة لخلافة مروان محمد ، بلاد شام والجزیرة ، ل١٤٤.

[214] هەمان سەرچاوە ، ل١٤٥، حمادي ، الجزیرة الفراتیه والموصل ، ل٤٧٣

[215] بۆ زیاتر زانیاری بروانە ، زرار صدیق ، الکرد فی العصر العباسی حتی مجیْ البویهین ،(١٣٢-٣٣٢هـ) اطروحة ماجستیر مقدمة الی کلیة الاداب ، جامعة صلاح الدین١٩٩٤.

[216] البلاذري ، انساب ، ج٩ ، ل٢٥٣.

[217] الطبري ، تاریخ ، ج٧ ، ل٣١٨.

[218]** صفریە یەکێکە لە گروپە گەورەکانی خەواریج ناونانی بەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ پێشەوایەکەیان ، ناوی ( زیاد کوری الاصفر) بوو، بەلام لەگەل ئەوەش دا بیروبۆچونی تر هەیە دەلێت ئەوانە لەبەر زۆری عیبادەت کردنیان ئەم ناوەیان لێنراوە ، چونکە روخساریان زەرد بوو بۆیە ئەم ناوەیان لێنراوە ، البغدادی الفرق ، ل٧٠ ، المبرد

الكامل فى اللغة ،ج٢، ل٢٠٢ بۆ زیاتر بروانة ، نایف محود الخواريج فى العصر الاموى .

[٢١٩] الطبري ، تاريخ ، ج٧ ، ل٣١٨،

[٢٢٠] ابن اثير ، الكامل ، ج٥ ، ل٣٣٥ ، ن خلدون ، تاريخ ، ج٣ ، ل٢٠١.

[٢٢١] بۆ زیاتر درێژەی گرتنی كوفەو و شەرەكانی بروانە ، مهند ماهر جاسم ، الحركات المناهضة لخلافة مروان بن محمد فى بلاد شام والجزيرة.

[٢٢٢] مهند ماهر ، هەمان سەرچاوە، ل١٣.

[٢٢٣] ابن خياط . تاريخ ،ج٢ ، ل٢٩٩.

[٢٢٤] البلاذري ، انساب الاشراف ، ج ، ل، مهند ماهر ، الحركات لمناهضة لخلافة مروان محمد ، ل١٥٤ ،

[٢٢٥] ابن خياط ، تاريخ ،د٢ ، ل٣٩٩ ، بن اثير ، الكامل ، د٤ ، ل٢٩٢.

[٢٢٦] البلاذري، انساب ، ج ٨،ل٩ ، ابن الاثير ، الكامل ، ج٥ ،ل٣٩٥.

[٢٢٧] بۆ زیاتر زانیاری بروانە مهند ماهر ، الحركات المناهضة لخلافة مروان محمد ، ل١٧٠

[٢٢٨] الطبري ، تاريخ ، ج٧ ، ل٣٥٠ ، ابن خلدون ، تاريخ ، ج٣ ، ل٢٠٢ ، الحمادي ، الجزيرة الفراتيه والموصن ، ل٥١٤.

[٢٢٩] ابن الاثير ، الكامل ،ج٥ ، ل٣٥٣ ، ابن كثير ، البداية ، ج٥ ، ل٢٩.

[٢٣٠] الطبري ، تاريخ ، ج٧ ، ل٣٥٠.

[٢٣١] الحمادي ، الجزيرة الفراتية والموصل ،ل٥١٥.

[٢٣٢]* السن : قەلايەكە لە جزيرە ، معجم ، ج٣،ل٢٦٩.

[٢٣٣] ابن خياط ، تاريخ ، ج٢ ، ل٤٠٩.

[٢٣٤] الطبري ، تاريخ ، ج٧ ، ل٣٥٠.

[٢٣٥] هەمان سەرچاوە ،ج٧،ل٣٥٧

[٢٣٦] ابن خياط ، تاريخ ، ج٢ ،ل٤٩.

[٢٣٧] الطبري ، تاريخ ، ج٩ ، ل٣٣٠.

# هەولێر لەسەردەمی سەلجووقیەکاندا



د.نیشتمان بشیر محمد

پێش ئەوەی بێینەسەر بارودۆخی سیاسی شاری (ئەربل)ی مێژوویی لەسەردەمی سەلجووقییەکاندا، هەر دەبێ بیرۆکەیەکی کورت سەبارەت بە سەلجووقییەکان لەڕووی بنچینەیان، ئەو شوێنەی لێیەوە هاتوون و، چۆنیەتی دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان بدەینە دەست، ئەوەبوو سەرهەڵدانی سەلجووقییەکان لەماوەی سەدەی پێنجی کۆچی/یازدەی زایینی لەسەر شانۆی ڕووداوەکانی هەرێمەکانی دەوڵەتی عەباسی بووە هۆی ڕوودانی گۆڕانکاری گەورە لە نەخشەی سیاسی لەناوچەکەدا، ئەوان کاریگەرییان بەسەر کۆی لایەنەکانی ژیان بەتایبەتی بەسەر میرنشینە کوردییەکان هەبوو کەلە چەندین هەرێمدا بڵاوببوونەوە، میرنشینی هەزبانی کە هەولێر لە چوارچێوەی ئەو ناوچانەدابوو فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکرد لەناو ئەو میرنشینانەدابوو.

هەروەها وای دەبینین بەشێوەیەکی کورت پێناسەی شوێنی جوگرافی شاری هەولێر بکەین ئەمەش لەبەرئەو گرنگیەی هەیەتی لە ڕوونکردنەوەی

ڕووەکانی پەیوەندییەکانی نێوان دەسەڵاتی سەلجووقی ومیرە کوردە هەزبانییەکان لە هەولێر، گرنگی ئەو لێکۆڵینەوەیە لەوەدایە کە قۆناغێکی گرنگ لە قۆناغەکانی مێژووی کوردی ئیسلامی ئاشکرا دەکات. هەروەها تیشك دەخاتە سەر بارودۆخی سیاسی هەولێر لەسەردەمی سەلجووقیدا.

سەرهەڵدانی سەلجووقییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و گەیشتنیان بەووڵاتی کورد وەکو زانراوە تورك لەو نەتەوە کۆنانەن کە لە ناوەڕاستی ئاسیا ژیاون[1]، و لەماوە مێژووییە جیاوازەکاندا و بەتایبەتی لەسەردەمی مێژووی ئیسلامیدا ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕاوە و، وادیارە هۆزە تورکییەکان لە کۆچکردنی بەردەوام دابوون بە مەبەستی گەڕان بەدوای لەوەڕگادا لە دوای ئەوەی بوونە موسڵمان دەستیان بەوەکرد ڕوویکەنە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، وهەرێمی خوراسان لەپێشەوەی ئەو هەرێمە ئیسلامیانە بوو کە تووشی هێرش و کۆچکردنی ئەو هۆزانە بووەوە[2].

غوز یەکەمین ئەو هۆزە تورکیانەبوون کە گەیشتنە جیهانی ئیسلامی ئەوەبوو ولاتانی کوردیش تووشی هێرشەکانیان بووەوە و لەو هەرێمانەش (ئازەربێجانی هەرێمی چیاکان، هەرێمی جەزیرەی فوراتی) وە هاتنیان بۆ هەرێمە کوردییەکان لە ڕووداوە گرنگ و مەترسیدارەکان دادەنرێ، ئەمەش لەبەرئەوەی کاریگەرییە گەورەیەیی لە گۆڕانی واقیعی سیاسی ناوچەکەدا هەبوو و هێرشەکانیان بووە هۆی خاپوور وێران کردن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی سەرهەڵدانیان لە ووڵاتی کورد(کوردستان) یەکەمین بەیەکتر گەیشتنی نێوان کورد و سەلجووقییەکان بوو.

لە سەرەتای سەدەی پێنجی کۆچی/ یازدەی زاینی سەلجووقییەکان لە

ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی سەریان هەڵدا[٣]. مێژوونووسان و لێکۆڵەران لەسەر ئەوە کۆکن کە سەلجووقییەکان لقێکن لە لقەکانی هۆزەکانی غوزی تورکی و بەگەڕاندنەوە بۆ سەلجوقی[*] کوری دەقاقی باپیریان بە سەلجوقی ناسراون، سەلجووقیش یەکێك لەسەرۆکەکانی هۆزەکانی تورك بوو، لەسەرەتادا ئەم هۆزە لە تورکستاندا دەژیان، ئینجا بەرەو جیهانی ئیسلامی شۆڕبوونەوە[٤].

ڕەواندی یەکێك لەمێژنووسانی سەلجووقییەکان سەبارەت بە کۆچ کردنیان بۆ جیهانی ئیسلامی ئاماژە بەوە دەکات کە ئەوان لە زێدی خۆیان لە هەرێمی تورکستان بە ئاراستەی ڕۆژئاوی ئیسلامی بەرەو وڵاتی ئەوبەری ڕووبار شۆڕبوونەوە، ئەمەش بەهۆی قەرەباڵغ بوون لە وڵاتیان و تەسکی لەوەڕگاکانیان بوو[٥]، سەبارەت بە ئاینیشیان پێش ئەوەی ببن بە موسڵمان ڕای جیاواز هەن بەڵام دەکرێ بەشێوەیەکی گشتی بگوترێ کە زۆربەی هەرە زۆرییان لەسەر ئایینی ئاسمانی بوون[٦].

لەدوای ئەوەی لە تورکستان کۆچیان پێکرا سەلجووقییەکان لە وڵاتی ئەوبەری ڕووبار جێگیربوون و سەرکردەکەیان توانی بە هەڵپەکردنی و کەسایەتی بەهێزی کیانێك بۆ هۆزەکەی پێك بهێنێ و بەهۆی هەوڵ وچالاکییەکانی توانی بەرزی ڕابگرێ، بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە دراوسێی موسڵمانەکان بوون، بوونە موسڵمان لەسەر مەزهەبی سوونی[٧]، بوونە موسڵمانیش هۆیەك بوو بۆکردنەوەی وڵاتی موسڵمانان لەبەردەمیاندا، بەمەش بۆ سەلجووق لوا کە هەلی بەکارهێنانی بارودۆخە سیاسییە شێواوەکەی لەناوچەکەدا هەبێ ودەستی بەوەکرد لەفەرمانڕەوا موسڵمانەکان

نزیک بێتەوە و کۆششی دەکرد بۆ ئەوەی ئایینی ئیسلام لەنێوان تورکە بت پەرستەکاندا بڵاوبکاتەوە[8]. هاتنە ناوەوەی سەلجوقییەکان بۆ چوارچێوەی جیهانی ئیسلامی پاڵی پێوەنان بۆ ئەوەی بەشداری لە ڕووداوە سیاسییەکان دا بکەن و بووە هۆی سەرهەڵدانیشیان لە ڕووی سیاسییەوە، لە دوای ئەوەی بوونە موسڵمان پابەند و دڵسۆز بوون بۆی و چوونە ناو چەند شەڕێک لە پێناو بڵاوکردنەوەی دا، لە دوای دامەزراندنی کیانێکی سیاسی سەربەخۆ بۆ خۆیان و تەغرۆل بەگ[9] کە لە کوڕانی سەلجووقی بوو ڕۆڵێکی گەورەی لە دامەزراندنی ئەو کیانە سەربەخۆیەدا بینی.

سەبارەت بە دەست نیشانکردنی ئەو ساڵەی دەوڵەتی سەلجووقی تیادا دامەزرا ڕای جیاواز لەنێوان لێکۆڵەران دا هەیە، هەندێک ئاماژە بەوە دەکەن کە لەساڵی(٤٢٩ك/١٠٣٧ز) بە مێژووی فەرمی دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان دادەنرێ ئەوەبوو لە شارەکانی ئەوپەڕی ڕوویاردا ووتاری هەینی بەناوی ئەوانەوە دەخوێندرایەوە[10]، لە کاتێکدا هەندێکی تریان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە سەرکەوتنیان بەسەر غەزنەوییەکان لەشەڕی دندانقان وەکو ڕاگەیاندنی سەقامگیری سەلجووقییەکان بوو لەو وڵاتەدا[11].

سوڵتان تەغرۆل بەگ سەرکردەی سەلجوقییەکان لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجووقی کوششی کرد لەپێناو فراوان کردنی قەڵەمڕەو و سەروەری بەسەر ناوچەکانی دەرووبەردا، توانی هەرێمەکانی جورجان و تەبەرستان و خوارزم کۆنترۆڵ بکات[12]، ناوبەنگیان بە هەرێمە جۆربەجۆرەکاندا بڵاوبووەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی بە خوڕ بەرەو ڕۆژئاوا چوون و، دوای هەست کردنیان بە سەقامگیری دەستیان بەوەکرد خۆئامادەبکەن بۆ

فراوانخوازی پتر ئەوەبوو لەماوەی ساڵە کەمەکانی تر توانیان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر چەند بەشێکی گرنگ لە جیهانی ئیسلامی پتەو بکەن[13] و هەرێمە کوردییەکانیش لەو هەرێمانە بوون.

## گەیشتنی سەلجووقییەکان بە هەرێمە کوردییەکان:

سەلجووقییەکان ڕوویان کردە هەرێمە کوردییەکان، ولەکاتی ڕووتێکردنەکەیان فەرمانڕەوایی کردن بەدەستی میرنشینە کوردییەکان بوو، لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان دا دەسەڵاتی سیاسی لەشارەکانیدا بە دەستی میرەکانی عەنازی شازنجانی بوو[14]، هەر چی لە ئازەربێجان بوو بەدەستی میرەکانی میرنشینی ڕەوادی کوردی بوو[15]، ئەم میرنشینە لە میرنشینە بەهێزەکان دادەنرێ ئەوەبوو میرەکانی لەوەدا سەرکەوتووبوون سنوری میرنشینەکە فراوان بکەن، هەروەها سەقامگیری بارودۆخی سیاسی وای کرد کە میرەکانی گرنگی بە کاروباری ناوخۆ و دەرەکی بدەن، کەچی دواتر ڕووبەڕووی فشارێکی گەورەی سەلجوقی بووەوە ئەوەبوو دەستیان بەوە کرد دەست لەکاروباری میرنشینەکەوە بدەن و سەقامگیرییەکەی لەق بکەن.

هەرچی هەرێمی ئاران بوو ئەوە میرنشینی شەدادی فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکرد، سەرکردەی خێزانی شەدادی کوردی کە لە خێزانە هەزبانییەکانی بلاوبووەوە لە ئاران، توانی لەساڵی(٣٤٠ک/٩٥١ز) بنەماڵەی میرنشینی شەدادی دابنێ، وسنووری میرنشینەکە وا فراوان بوو کە هەموو هەرێمی ئاران بگرێتەوە و لەدوای چەند ساڵێکیش لە سنووری خۆی تێپەڕاند بۆ ئەوەی هەندێ بەشی ئەرمینیا و ئازەربێجان بگرێتەوە[16].

دەسەڵاتی میرنشینی مەڕوانی لە جەزیرەی فوراتی (دیاربکر) بەردەوام بوو

ئەوەبوو میر بازی کوردی توانی میرنشینێکی کوردی دابمەزرێنی کە بە میرنشینی دۆستەکی یان مەروانی ناسرا، ودەکرێ بگوترێ کە بوونی میرنشینی مەروانی لەو شوێنە جوگرافیە گرنگەدا گرنگیەکی تایبەتی پێدا، بۆیە میرەکانی کاریان کرد لەسەر ئەوەی بە پلەی یەکەم سنورەکەی بە ئاراستەی شارە دراوسێکانی لەگەڵ بیزەنتی فراوان بکەن[١٧].

میرنشینی هەزبانی یەکێك لە کیانە کوردییەکانی ترە[١٨] ئەوەبوو تاکەکانی ئەو هۆزە کوردییە توانیان میرنشینێکی سەربەخۆ بۆ خۆیان دابمەزرێنن، وشاری (ئەربل) یان کردە سەنتەری میرنشینەکە، ئەوەبوو هەزبانییەکان لەو شارەدا سەقامگیربوون و دەستیان بەسەر قەڵادەروبەرەکەی دا گرت ئەمەش هەر لەسەرەتاکانی سەدەی پێنجەمی کۆچی/١١ی زاینی و بۆ ماوەی پتر لەسەدەیەك بوو، ئەو زانیاریانەی لەسەرچاوەکاندا دەربارەی میرنشینی هەزبانی هەن، وەکو زانیارییەکانی تایبەت بە میرنشینە کوردییەکانی تر کەمن، لێکۆلەر لەکاتی لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەو میرنشینانە رووبەرووی کە لەبەری زەمنی درێژ سەبارەت بە هەواڵی ئەو میرنشینانە دەبێتەوە.

هەموو میرنشینە کوردییەکان واتە شەدادی و رەوادی و مەروانی و عەنازی و هەزبانی کە لە وڵاتی کوردان دا بڵاوبیبونەوە دەکرێ بەکیانی سیاسی سەربەخۆ دابندرێن، کە لەسەر بنەمای پتەو لە فەرمانرەوایی کردن لەناوچەکانیاندا وەستابوون، و لەکاتی سەرهەڵدانی سەلجووقییەکان دا هێزی سیاسی خاوەن پایەی گرنگیان پێك دەهێنا ئەوەبوو ئابلوقەیان دا و پەیوەندی چەند لایەنەیان لەگەڵ بەست. سوڵتان تەغرۆل بەگی سەلجووقی

لە پێك هێنانی دەوڵەتێکی گەورەدا سەرکەوتوویبوو ئەوەبوو دەستی بەوەکرد قەڵمڕەوی خۆی فراوان بکات، هەرێمە کوردییەکانیش لە چوارچێوەی پلانە فراوانخوازییەکانی دابوو، ئەمەش لەبەرئەو شوێنە جوگرافیە ستراتیژییەیی هەیبوو کە وای کردبوو ببێت مایەی چاوتێبڕینی زۆربەی هێزە سیاسییەکان لەناوچەکەدا لە یەکەمیان ئەو هەرێمانەش کە دەستیان بەسەرداگرت هەرێمی چیاکان بوو کە فەرمانڕەوایی کردنی لەلایەن میرەکانی میرنشینی عەنازی (شازنجانی) بەڕێوەدەچوو. تێبینی ئەوەش دەکرێ کە سەلجووقییەکان بە هێرشەکانیان بۆسەر هەرێمی چیاکان شارە کوردییەکانیان خاپوورکرد و دانیشتوانیان کوشتن وسامانیان بەتاڵان بردن.

لەدوایدا سەلجووقییەکان بەرەو هەردوو هەرێمی ئازەربێجان وئاران پێشڕەویان کرد و توانیان دەسەڵاتی خۆیانی بەسەردا پتەو بکەن، وفەرمانڕەواییانی هەردوو میرنشینی ڕەوادی و شەدادی کەوتنە ژێر دەسەلاتیان، لەم ڕووەوەش میر نەسرئەلدەولەی مەڕوانی گوێڕایەڵی خۆی پێشکەش بە سوڵتان تەغرۆل بەگ کرد، بەم هەوڵەشی ویستی خەڵکی میرنشینەکەی لەشەڕ دووربخاتەوە، بەم سیاسەتەشی و بەهۆی دانابییەوە توانی خۆی لەگەڵ سەلجووقییەکان دا بگونجێنێ و پارێزگاری لە میرنشینەکەی بکات(١٩).

ئەوەی پەیوەندی بە بارودۆخی شاری ئەربلە لە ماوەی سەردەمی سەلجوقیدا (وەکو پێشتر ووتمان) ئەوە ئەربل سەنتەری فەرمانڕەوایی میرنشینی هەزبانی کوردی بوو، پێش ئاماژەکردن بە بارودۆخی هەردەبێ بڕۆکەیەکی کورت دەربارەی شوێنی جوگرافی ئەربل بخەینەڕوو.

**شوێنی جوگرافی شاری ئەربل**[*] : شاری ئەربل لەو شارە کوردییانە دادەنرێ کە مێژووییەکی کۆنی هەیە، لە کۆنترین ئەو شوێنانەیە کە تاکو ئێستا ژیانی تیادا بەردەوامە.

شارەکە لەسەرچاوە کۆنەکان دا بە (ئەربل) ناسراوە، سەرەڕای جیاوازی ڕایەکانیشی ئەوە ئێستا لەسەرچاوەو لێکۆڵینەوە مێژووییەکاندا ناوی ئەربیل بەکاردەهێنرێ، هەرچی ئەو ناوەیەکە لەنێوان دانیشتوانی شارەکە بەکاردەهێنرێ ئەوە (هەولێر)ە[٢٠]. ئەربل دەکەوێتە باکوری عێراق و لەماوە مێژووییەکاندا پێش سەرهەڵدانی ئیسلام بەهۆی شوێنە جوگرافییەکەی ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە، هەرچی لەماوەی مێژووی ئیسلامیە ئەوە وادیارە کە لە سێ سەدەی یەکەمی کۆچیدا شارەکە پایەیەکی گەورەی نەبووە لەوانەیە هۆیەکەشی ئەوەبێ کە سەر بە کورەی حەلوان بووە[٢١]، بۆیە لەلای وولاتناسان ومێژوونووسان ناوی نەهێنراوە، کەچی پارێزگاری ناوە کۆنەکەی کردووە، یەکێك لە لێکۆڵەران ئاماژە بەوە دەکات کە شوێنی جوگرافی جیاکەرەوەی شارەکە لەو ڕووەوەی کە دەکەوێتە سەر شوێنی بە یەکتر گەیشتنی ڕێگاکان بۆیە بۆ چەند ماوەیەکی درێژ ببووە سەنتەری بازرگانی ڕێگای قافلەکان[٢٢]. شاری ئەربیل لەو کاتەی کە بووە سەنتەری میرنشینی هەزبانی کوردی پتر بە دیارکەوت ئەو میرنشینەی کە فەرمانڕەوایکردنی تاکو دوای ساڵی(٥٢٠ك/١١٢٦ز) بەردەوام بوو، ئەوەبوو کە میرەکان بە دوای یەکتردا فەرمانڕەوابیان لەو میرنشینەدا کردوو لە دیارترینیشیان ئەبو هەیجائی هەزبانی[٢٣].

## هەزبانییەکان لە هەولێر و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ سەلجووقییەکاندا:

سەرەڕای کەمی زانیارییەکان دەربارەی میرنشینی هەزبانی کەچی هەندێ لە لێکۆڵەران باسی مێژووی ئەو میرنشینەیان کردووە، لەم ڕووەوەش پشتیان بەو دەقە کەم وبێ ڕووانە بەستووە کە لە سەرچاوەکاندا هاتوون، ئەوەی پەیوەندی بە زاراوەی هەزبانی هەیە ئەوە ڕای جیاواز سەبارەت بە بنچەی ناولێنانەکە هەیە، ئەوەتا زاراوەکە بەشێوەی جۆر بەجۆر هاتووە وەکو هەزبانی، هدیانی، هدبانی، وهەزبانییەکان[٢٤]، ئەمەش ئەوە بەدیار دەخات کە ووشەکە لەلایەن مێژوونووس و وڵاتناسەکان جێگیرنەبووە.

تاکەکانی هۆزی هەزبانی کوردی لەوەدا سەرکەتووبوون کە میرنشینێکی سەربەخۆ بۆ خۆیان دابمەزرێنن، و ئەربل یان کردە سەنتەری، ئەوەبوو هەزبانییەکان لەو شارەدا جێگیربوون و لەسەرەتاکانی سەدەی(٥ك/١١ز) بوونە خاوەنی قەڵا و دەوروبەرەکەی، ومێژووی سەرکردایەتی هەزبانی تاکو ساڵی(٤٢٠ك/١٠٢٩ز) نادیارە، لە ماوەی ئەو ساڵەدا میریان لە ئەربل ئەبو هەیجای هەزبانی بوو[٢٥]، و سەرچاوەکان بە ڕاشکاوی باسی سەرەتای سەردەمی و ماوەی فەرمانڕەوایکردنی ناکەن بێجگە لە ئاماژەکردن بۆ ئەوەی کە میر عیسای کوڕی موسای هەزبانی لە دوای ئەو بووە بە میری میرنشینەکە[٢٦]، وپتر پێدەچێ بە ئەبێ هەیجاء ناسرابێ واتە:میر موسای باوکی میر عیسا وئەبو هەیجاء یەك کەس بن، و لەدوای مردنی عیسای کوڕی لە جێگای ئەو دەسەلاتی گرتۆتە دەست.

میرنشینی هەزبانی لە ئەربل هاوسەردەمی سەلجوقییەکان بووە، ئەوەی وەکو هێزێکی نوێ لەسەر شانۆی سیاسی لە جیهانی ئیسلامی بە دیارکەوت،

وردەکریَ لە کاتی بە دیارکەوتنی سەلجوقییەکان دا هەزبانییەکان بە هێزێکی سیاسی خاوەن پایەیەکی گەورە دابنرێ ئەوەبوو کە هاوسەردەمی بوو و پەیوەندی چەندین لایەنەی لەگەڵدا کردبووەوە.

ئەوەی پەیوەندی بە بارودۆخی ئەربیل لەماوەی سەردەمی سەلجووقی هەیە. ئەو شتەی سەرنجی لێکۆلەر ڕادەکێشێ ئەو نادیارییە کە مێژووی میرەکانی و زنجیرەی بەدوای یەکتردا هاتنیان بەخۆوە دەگرێت، لەساڵی(٤٣٧ك/١٠٤٦ز) عیسای کوڕی موسای هەزبانی فەرمانڕەوایی میرنشینەکەی دەکرد و وادیارە کە میرنشینەکە ململانێی ناوخۆیی نێوان تاکەکانی بنەماڵەی فەرمانڕەوایی لەسەر دەسەلات بەخۆوە دەگرت، ئەم بارودۆخە بووە هۆی دەست تێوەردانی هەندێ لە هێزە سیاسییەکان لە کاروباری ناوخۆیدا بەتایبەتیش عوقەیلییەکان[٭] لە موسلّ دا. دەست تێوەردانی عوقەیلییەکان ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەتیژکردنی ناکۆکییەکانی نێوان میرەکانی هەزبانی دا، بەپێچەوانەی میرنشینە کوردییەکانی تر بارودۆخی لەکاتی سەرهەڵدانی سەلجووقییەکان دا سەقامگیر نەبوو، وپێش سەرهەڵدانی ئەو هێزەش میرنشینەکە بارودۆخی مەترسیداری بەخۆوە دیت، ئەوەبوو میر موسای ناسراو بە سالار پەنای بردە بەر عەقیلییەکان، و لەسەرچاوەکان وا بەدیار دەکەوێ کە لەساڵی(٤٣٧ك/١٠٤٦ز)دا عیسای لەلایەن برازایەکییەوە کوژرا، وکاتێك سالار بەم هەواڵانەی زانی بەخێرایی لەگەڵ قرواش ی عوقەیلی ڕووی کردە ئەربیل ئەوەبوو لە جیاتی برا کوژراوەکەی جڵەوی دەسەلاتی تیادا گرتە دەست[٣٧].

لەساڵی ٤٤٠ك/١٠٤٩ز میر (ئەبولحەسەن کوڕی موسك ی هەزبانی)

فەرمانڕەوایی میرنشینەکە بوو لە ئەربل ئەوەی کە ناکۆکییەك کەوتە نێوانی لەگەڵ ئەبو عەلی کوڕی موسکی برای ئەوەش بووە هۆی دوورخستنەوەی لە دەسەلات و ئەبو عەلی جڵەوی دەسەڵاتی لە ئەربل گرتە دەست ئەویش هاوسەردەم بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی سەلجووقییەکان[٢٨]، بەمەش دەسەڵاتی سیاسی هەبوو لە ئەربل کەهی هەزبانییەکان بوو گوێڕایەڵی خۆی بۆ سەلجوقییەکان ڕاگەیاند ئەمەش لەبەرئەوەی لەوە گەیشتبوون کە سەلجووقییەکان لەو ماوە مێژوویەدا لە ترۆپکی هێزی خۆیان دا بوون بۆیە پێویستی بەوەکرد گوێڕایەڵی بوونی خۆیان ڕابگەیەنن کەچی ڕاگەیاندنی گوێڕایەڵ بوون لەلایەن کوردەوە جۆر وشێوازی پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەردوولای لەدواتردا دەست نیشان کرد.

لە سەرەتای فەرمانڕەوایکردنی سەلجووقییەکاندا تێبینی ئەوە لە سیاسەتی سەلجووقیدا دەکرێ کە سیاسەتی مەرکەزیان پەیڕەو نەکردبوو، هەوڵیان نەدا کیانە سیاسیە کوردییە سەربەخۆکان ڕامالن، لە ڕاستیشدا ئەو سیستەمە نامەرکەزییەیی سەلجوقییەکان لەسەرەتای گرتیانەبەر بووە هۆی مانەوەی فەرمانڕەوایکردن وئیدارە لە هەرێمە کوردییەکان دا بەدەستی میرە کوردە سەربەخۆکانەوە، لەو میرنشینانەش هەزبانی ئەوەبوو میرەکانی دوای ئەوەی گوێڕایەڵ بوونی خۆیان بۆ سوڵتان تەغرۆل بەگی سەلجوقی پێشکەشکرد، فەرمانڕەوایکردنی ئەربل یان بۆ مایەوە.

سەرەڕای ئەوەی سەلجووقییەکان دەسەڵاتی سیاسی کوردییان هێشتەوە کەچی سیاسەتێکی ئەوپەڕی زیرەکانەیان گرتەبەر ئەوەبوو بەپەرۆش بوون بۆ ئەوەی هێزەکانیان و نوێنەرەکانیان و فەرمانبەرەکانیان

لە هەرێمە کوردییەکاندا بهێڵنەوە، لەهەمان کاتیشدا ئەو داهاتە زۆرانەیان بۆ خۆیان بەکارهێنا کە ئەو هەرێمانە پێی جیادەکرانەوە.

لە دوای دانپێدانانی کوردو سەلجوقییەکان بەیەکتری ڕوخسارەکانی پەیوەندییە سیاسییەکان پتر دەرکەوتن، لەسەردەمی هەردوو سوڵتان تەغرۆل بەگ وئەلب ئەرسەلان ئەو جۆرە پەیوەندییە بەردەوام بوو، کەچی سیاسەتی سەلجووقی لەسەردەمی سوڵتان مەلیکشاە وگۆڕا ئەوەی کە لەساڵی(٤٦٥ك/١٠٧٢ز) دەسەڵاتی گرتەدەست[٢٩]، ئەوەبوو لەو کاتەوەی فەرمانڕەوایی گرتەدەست بیرۆکەی مەرکەزییەت و ڕامالینی میرنشینە کوردییە سەربەخۆکان لە مێشکی مەلیکشاە چەسپی.

سوڵتان مەلیکشاە لەوەدا سەرکەوتبوو کە ژمارەیەك لە کیانە کوردییە سەربەخۆکان کۆتایی پێبهێنێ لەوانەش میرنشینی ڕەوادی وشەدادی ومەڕوانی وعەنازی، هەرچی پەیوەندی بە عەنازییەکان بوو کە لە ئەربل فەرمانڕەواییان دەکرد ئەوە تێبینی ئەوە دەکرێ ئەو زانیاریانەی لەبارەیەوە هەیە لەچەند ئاماژەییەکی تێپەڕی ئیبن ئەسیر و ئیبن مستوفی خاوەنی (تاریخ اربل) تێناپەڕێ، ئەوەی کە لێی هەڵدەکرێ کە لەماوەی سەردەمی سوڵتان مەلیکشاە و دوای ئەویش و سەرەڕای سیاسەتی مەرکەزی ئەو سوڵتانەش هەرمابووەوە ودەسەڵاتی خۆی پاراستبوو، و وادیارە کە سەلجووقییەکان هەوڵیان نەدا کە ئەم میرنشینە بڕوخێنن لەبەرئەوەی نەبووبووە مایەی مەترسی بۆ سەر پایەو قەڵەمڕەویان لە ناوچەکەدا.

ئەوەبوو زۆرجار ئاژاوەو پەشێوی وناسەقامگیری تیایدا بڵاودەبووەوە بەتایبەتی ململانێی لەنێوان میرەکانی هەردوو هۆزی هەزبانیوحەکمی لەسەر

دەسەلاَت[٣٠] بۆیە میرنشینەکە بەم بارودۆخەی نەیدەتوانی ببێتە مایەی مەترسیەکی ئەوتۆ بۆسەر فەرمانڕەوایی سەلجووقی ئەوەبوو مەلیکشاه کاری نەکرد بۆ لە ناوبردنی.

لە ڕەوتی ڕووداوەکان دەردەکەوێ کە میرەکانی هەزبانی ئەربل گوێڕایەڵی سەلجووقییەکان بوون وبەرامبەر بەمەش سەلجوقییەکان پێیان وانەبوو کە پێویستی بکات سوپا بنێرنە سەر ئەربل وەکو ئەوەی کە لەگەڵ میرنشینە کوردییەکانی تردا کردیان، زیاتر لەمەش میرەکانی هەزبانی چوونە پاڵ سوپای سەلجووقی و خزمەتەکانی خۆیانیان پێشکەشکرد، میر فەزڵ کوڕی ئەبی هەیجائی هەزبانی لە یاوەرانی سوڵتان مەلیکشاه بوو لەکاتی ڕەوتکردنی بۆ وولاتی شام و لەڕێگادا هەڵیبژارد بۆ ئەوەی بیکاتە نوێنەر لەنێوان خۆی و میری مەڕوانی[٣١].

بەردەوام بوونی فەرمانڕەوایی هەزبانی لە ئەربل بووە هۆی بەشداری کردنی میرنشینەکە لەو ڕووداوانەی لەناوچەکەدا ڕوویاندا لەسالَی (٤٨٩ك/١٠٩٥ز) خاوەنی ئەربل میر ئەبو هەیجاء خۆی وەردابوو لە ململانێ یە ناوخۆییەکانی نێوان میرەکانی عوقەیلی موسڵ[٣٢]، ئەوەبوو زۆرجار میرەکانی ئەو میرنشینە کوردییە کەوتبوونە گێروگرفت لەگەڵ عوقەیلییەکان ببونە لایەنێك تیایدا لەگەڵ ئەوەی کە بابەتەکە تایبەت نەبوو بە میرنشینەکەیان.

هەروەها میرەکانی میرنشینەکە ڕۆڵیان هەبوو لەو ململانێیەی لەنێوان سەرکردەکانی سەلجووقییەکان دا بەرپابیوو، لەسالَی(٥٠٠ك/١١٠٦ز) میر ئەبو هەیجاء ڕۆڵێکی زۆر گرنگی لە ململانێی نێوان دوو لە سەرکردە سەلجووقییە کێبرکێکەرەکان لەسەر شاری موسڵ گێڕا، ئەوانیش جگرمش و

جاولی سقاو بوون[٣٣]، لەکاتی ئەو ململانێ یەش میری کوردی بەسەر ڕاستی هەولێدەدا کە ئەو مەترسیەیی دەوری ولاتەکەی دابوو دوور بخاتەوە لە ترسی ئەوەی بکەوێتە ژێر دەسەلاتیان.

هەروەها سەلجوقیەکان دەیانزانی کە هەزبانیەکان سەروەری وقەلەمڕەوییەکی بەهێزیان لەدەوروبەری ئەربل دا هەیەو وایان بینی کەباشتر وایە میرنیشینەکەیان بهێڵنەوەو دانیپێدابنێن و ڕێگایان پێ بدەن کە فەرمانڕەوایی کردن و ئیدارە لەناوچەکەدا پەیڕەو بکەن بەوەندە وەستان کە پاپەندبوون وگوێڕایەڵیان بەدەست بهێنن[٣٤]. بەلام ئەو سەربەخۆبونەی ئەربل و میرنیشینەکە هەیبوو زۆری نەخایەند ئەوەبوو هەر زوو کەوت ودەرکەوتنی ئەتابك عیمادەدین زەنگی گەورەترین کاریگەری بەسەر کەوتنیەوە هەبوو، ئەوەبوو ناوبراو بەفرانخوازییەکانی لەناوچەکەدا ناسرا بوو، بەمەش لەسالی(٥٢٦ك/١١٣١ز) ئەربل لەو ناوچانەبوو کە لە ژێردەستی دابوو[٣٥].

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:

(1) زکریا کتابچی، الترک في مؤلفات الجاحظ، بیروت، ١٩٧٢، ص١٩؛ بارتولد، ترکستان، ترجمة:صلاح الدین عثمان هاشم، الکویت، ١٩٨٠، ص١١٤-٢٣٨.

(2) ابن حسول، کتاب تفضیل الاتراک علی سائر الاجناد، بغداد، ١٩٤٠، ص٤٠.

(*) قامبری وای دەبینێ کە ڕێزمانی تورکی ئەم وشەیەی بەم شێوەیە داڕشتوە کە یان (سیلجیق یان سالجوق)ە. تاریخ بخاری، ترجمە:احمد محمود الساداتی، القاهرە، ١٩٦٥، ص١٢٧، هەروەها(دقاق یان تقاق)ە، ئەوە مانای بە تورکی کەوانی ئاسنینە:ابن الأثیر، الکامل في التاریخ، بیروت، ١٩٧٨، ج٩، ص٤٧٣.

(3) زۆر لە لێکۆلەران باسی مێژووی سەلجووقییەکانیان کردووە. لەوانە: تامارا رایسی، السلاجقة تاریخهم وحضارتهم، ترجمة:لطفي الخوري، ابراهیم الداقوقي، بغداد، (د.ت)؛ حسین امین، تاریخ العراق في العهد السلجوقي، بغداد، ١٩٦٥م.

(4) الحسیني، اخبار الدولة السلجوقیة، تحقیق: محمد نورالدین، بیروت، ١٩٨٦، ص٢٣-٢٤

Ency of Islam, Vol, P٢٠٨

(5) راحة الصدور، القاهرة، ١٩٦٠، ص١٤٥.

(6) سەبارەت بە وردەکارییەکانی تایبەت بە ئاینی سەلجووقییەکان پێش ئەوەی ببنە موسڵمان بگەڕێوە بۆ: نیشتمان بشیر محمد، الکرد و السلاجقة، اطروحة دکتوراه ، جامعة صلاح الدین، ٢٠٠١، ص٧٠-٧١.

(7) الحسیني، اخبار الدولة السلجوقیة، ص٢٤ ؛ هارت، دائرة المعارف الاسلامیة، مادة السلاجقة، ج١٢، ص٤٥.

(8) الگردیزی، زین الاخبار، تهران، ١٩٨٤، ص٤١٥-٤١٦ ؛ ابن الاثیر، الکامل، ج٩، ص٤٧٤.

(9) تەغرۆل بەگ ناوێکی تورکی لێکدراوە تەغرۆل مانای ناوی باڵندەیەکی ناسراوە لەلایەك و بەگ مانای میرە. ابن خلکان، وفیات الاعیان، تحقیق: احسان عباس، بیروت، ١٩٦٨، مج٥، ص٦٨.

(10) ستانلی لین پول، الدول الاسلامیة، ترجمة: محمد صبحي، دمشق، ١٩٧٣، ق١، ص٣١٩.

(11) عباس اقبال، الوزارة في عهد السلاجقة، ترجمة: احمد كمال الدين حلمي، الكويت، ١٩٨٤، ص٣٢.

(12) سەبارەت بە شوێنی جرجان وتە پەرستان و خوارزم بڕوانە: ياقوت الحموي، معجم البلدان، بيروت، (د.ت)

(13) عبدالمنعم محمد حسنين، سلاجقة ايران والعراق، القاهرة، ١٩٧٠، ص٢١.

(14) بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە میرنشینی عەنازی بڕوانە: حسام الدين النقشبندي، الكرد في الدينور وشهرزور خلال القرنين الرابع و الخامس الهجريين، رسالة ماجستير، جامعة بغداد، ١٩٧٥.

(15) سەبارەت بەو میرنشینە بگەڕێوە بۆ حسام الدين النقشبندي، اذربيجان دراسة حضارية، اطروحة دكتوراة، جامعة بغداد، ١٩٨٤.

(16) اسماعيل شكر رسول، الشداديون في بلاد اران، رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٤.

(17) بگەڕێوە: الفارقي، تاريخ امد و ميافارقين(تاريخ ميافارقين)، تحقيق: بدوي عبداللطيف عوضى، القاهرة، ١٩٥٩.

(18) احمد عبدالعزيز محمود، الهذبانيون في اذربيجان واربل، رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٠؛ ابن الاثير لە چوارچێوەی ڕووداوەکانی ساڵی ٤٤٠ك باسی ناکۆکی نێوان یەکێك لە میرەکانی عوقەیلی لەگەڵ کوردەکانی حەمیدی و هەزبانی دەکات و ئاماژە دەکات بەوەی کە حەمیدی یەکان چەند قوڵەیەکیان هەیە لە پاڵ موسڵە لەوانە ئاکریێ، و هەزبانیەکانیش قەلاتی هەولێر و دەوروبەریان هەیە، الكامل في التاريخ /٩/٥٤٩.

(19) عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كوردستان الوسطى، بغداد، ١٩٧٥، ٢٢٠/١.

(*) ناوی ئەربل لە نوسینە مێژووییەکان دا و بەدرێژایی سەردەمەکان بە زۆری هاتووە لە کونترین ئاماژەپێکردنەکانیش لە نووسینەکانی شای سۆمەری شولکی لە ٢٠٠٠پ.ز بە دیپوی (ئوربلیون) یان (ئوربلیوم) هاتوە هەروەها بەشێوەی ئەربیلا(Arbila) ش.. بۆ زیاتر زانیاری سەبارەت بەناوەکانی تایبەت بەهەولێر بڕوانە: اسماعيل شكر رسول، اربيل دراسة تاريخية في دورها الفكري و السياسي، رسالة الدكتوراه ، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٩، ص٩-١١.

(٢٠) اسماعيل شكر رسول، اربيل دراسة تاريخية، ص١٠.

(٢١) احمد عبدالعزيز محمود، الامارة الهذبانية، ص٣٤.

(٢٢) محمود، الاماره الهذبانية،ص٢٤؛شترك،دائرهالمعارف الاسلاميه،مادهاربل،٢/٥١٧.

(٢٣) لە لاپەرەكانی تردا باسی ئەربیل لەسەردەمی میرنشینی هەزبانی دا دەكەین.

(٢٤) بروانە: الامارة الهذبانية في اربل ، ص٤١، ٤٢.

(٢٥) ابن الاثير، (الكامل في التاريخ)، ٩/٥٣١ ؛ ابو الفداء ، المختصر، القاهرة، (د.ت)، ٢/١٦٨.

(٢٦) الكامل، ٩/٤٣١.

(*) لە (٣٨٠-٤٨٩ك/ ٩٩٠-١٠٩٦ز) لە موسڵ فەرمانرەواكیان كرد المختصر، بيروت، ١٩٩٦، ١/٤٨٦.

(٢٧) الكامل، ٩/٥٣١ : المختصر ،٢/١٦٨ ؛ ابن الوردي تتمة المختصر ، بيروت، ١٩٩٦، ١/٤٨٦.

(٢٨) الكامل، ٩/٥٤٩.

(٢٩) ابن الجوزي ، المنتظم، حيدر اباد، ١٣٥٧ه ، ٨/٢٩٧ ؛ البنداري، تاريخ دولة ال سلجوق، ص٤٨.

(٣٠) الكامل، ١٠/٦٣٥ ؛ ابن المستوفي، تاريخ اربل ،تحقيق: سامي بن السيد خماس الصقار، بغداد، ١٩٨٠، ٢/٤٦٢.

(٣١) اسامة بن منقذ، كتاب الاعتبار، ص٨٧.

(٣٢) الكامل، ١٠/٢٥٨-٢٥٩.

(٣٣) ن.م.س. ؛ ارسين موسى رشيد، الهذبانيون ودورهم السياسي والعسكري في القرن الخامس الهجري، بحث مقدم الى كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، ١٩٨٥، ص٩.

(٣٤) محمود، الهذبانيون، ص١٠٥.

(٣٥) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان ، ص١٨٩ ؛ ابو شامة ، الروضتين، ج١، ق١، ص٧٧ ؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ١/ ٩٨ ؛ و بۆ زیاتر زانیاری بروانە: محمود : الهذبانيون، ص ص٥٨-٦٢.

# فەرهەنگنووسیی کوردی لە ١٩٧٠ - ١٩٨٤



د.هیمدادی حوسێن
پرۆفیسۆری یاریدەدەر

## سەرەتایەکی کورت:

فەرهەنگنووسیی کوردی تا ئێستا قۆناغێکی چاکی بڕیوە، ڕێکخستنی بیبلۆگرافیا[1] بۆ هەر بابەتێك تارادەیەکی زۆر یارمەتی خوێنەران و نووسەران دەدات، بۆ ئەوەی بتوانن بە ئاسانی و لە ماوەیەکی کورتدا ئەوەی بە دوایدا دەگەڕێن بیدۆزنەوە. ڕێکخستنی بیبلۆگرافیاش بۆ ئەو فەرهەنگانەی، کە تا ئێستا لە جیهاندا دەرچوون و بڵاوکراونەتەوە کارێکی قورس و ماندووبوونێکی زۆری گەرەکە، بەڵام ئەوە نەبۆتە هۆی ئەوەی نووسەران بە تایبەتی ئەوانەی لە بواری فەرهەنگنووسیی دەکۆڵنەوە، لەبەر دەم ئەو کارەدا دەستەو ئەژنۆ بوەستن.

باسەکەمان لە دەوری ئەم خاڵانەدا دەسووڕێتەوە:

١- فەرهەنگ چییە؟
٢- ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی لە فەرهەنگنووسیی کوردی.
٣- فەرهەنگنووسیی کوردی لە ١٩٧٠-١٩٨٤.

## ١- فەرهەنگ Dictionary چییە؟

فەرهەنگ بەو سەرچاوەیە دەگوترێت، کە وشەکانی زمانێکی تێدا کۆکرابێتەوە، جا بەرامبەرەکەی یان زمانێکی دی جیاوازی خۆی یان هەر زمانەکە خۆی واتای وشەکان لێکدراوەتەوە. هەندێ فەرهەنگ شێوەی گۆکردنی(تلفظ) وشەکانیشی نووسیوە، لە بنەچەی وشەکەو هاوبەشی لەگەڵ زمانانی دیکەشدا روون کردۆتەوە، ئەمە سەرباری ئەوەی هەندێ فەرهەنگ وێنەداریشەو بە وێنە روون کراونەتەوە. رێکخستنی فەرهەنگیش بە جۆری جیاواز رێك دەخرێت، بەڵام بەزۆری لەسەر شێوەی ئەلفو بێ دەبێ.

(هەرچەندە فەرهەنگ جۆری زۆرە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێ بە دوو جۆری سەرەکی جیا بکرێتەوە: یەك، فەرهەنگی ئینسکلۆپیدی، دوو، فەرهەنگی فیلۆلۆژی. فەرهەنگی ئینسکلۆپیدی سەبارەت بەروداوو دیاردەو خەڵك.. هتد دەدوێ، هەرچی فەرهەنگی فیلۆلۆژییە لە وشە دەکۆڵێتەوە، واتە وشەکە دانەی زمانە، کەرەستەی سەرەکیی فەرهەنگی فیلۆلۆژییە)[٢].

## ٢- ئاوردانەوەیەکی مێژوویی لە فەرهەنگنووسیی کوردی:

لە زەمینەی فەرهەنگنووسییدا نەتەوەی کورد تارادەیەك درەنگ کەوتۆتە خۆ، کە باسی فەرهەنگو فەرهەنگنووسیی بکرێ بە دڵنیاییەوە دەبێ پەنجە بۆ فەرهەنگەکەی شاعیری مەزنی کورد ئەحمەدی خانی رابکێشین.

ئەم فەرهەنگە بە نرخەی( ئەحمەدی خانی) ناوی(نەو بەهار)ەو بە شێوەی هۆنراوە دانراوەو نێزیکەی شەش هەزار وشەی کوردی کرمانجی سەرووەو بەزمانی عەرەبی- کوردییە،ئەم فەرهەنگە لە ١٦٨٢ز داندراوەو بۆ یارمەتیدانی منداڵانی کورد بۆ ئەوەی فێری زمانی عەرەبی ببن.

ئەوروپاییەکان چ لە بواری فەرهەنگو مێژووو جوگرافیاو چ لە لایەنەکانی دیکەی ژیاندا لە سەدەکانی هەژدەو نۆزدەوە بە هۆی گەشتەکانیان بۆ کوردستان زۆر شتی گرنگیان لە فەوتان بۆ رزگار کردووینو لای خۆیان پاراستوویانە. ئەگەرچی هەندێکیان بوونەتە هۆی ئەوەی بە شێوەیەکی خوارو خێچ کورد لە میللەتانی ئەوروپایی بگەیێنن، بەلام نموونەی ئەوانەش زۆرن، کە بە دەستپاکیو دڵسۆزییەوە گرنگیان بە کورد داوە. لەدوای یەکەمین فەرهەنگی کوردی، یەکەمین کەسێك گرنگی بە فەرهەنگی کوردی دابێ قەشەی ئیتالی ماورێزۆ گارزۆنی Maurizio Garzoni یە، لە کۆتایی ئەو کتێبەی دەربارەی رێزمانی کوردی نووسیویەتی فەرهەنگێکی کوردی- ئیتالیایی رێکخستووە، کە نێزیکەی پێنج هەزار وشەی کوردی خەڵکی ئاکرێو ئامێدی گرتۆتەوەو کتێبەکەی ماورێز گارزۆنی بە ناوی: ( گرامەرو فەرهەنگی زمانی کوردی) ناحیەی ئامێدی یەو لە ١٨٧٨دا لە رۆما چاپ کراوە. Maurizo Garzoni, Grammatic e Vocabolario deiialingua Kurda, Roma, ١٧٨٧.

لە دوای ئەو لە ١٣١٥ ك شێخ مارفی نۆدێ فەرهەنگە شیعرییەکەی خۆی نووسیوە، ئەم فەرهەنگە وەك فەرهەنگە شیعریەکەی (ئەوبەهار)ی ئەحمەدی خانی وایەو بۆ کاك ئەحمەدیو بۆ منداڵانی کوردی داناوە. ئەم فەرهەنگە لە ١٩٣٦دا لە سلێمانی چاپ کراوە.

پاشان زۆر لە ئەوروپاییەکان، وەك: ژاباو سۆتسینویەگیزارۆڤو مێجەرسۆن گرنگیان بەفۆلکلۆرو فەرهەنگی کوردی داوەو زۆریان بە کوردیو بەرامبەرەکەی بە زمانەکانی خۆیان فەرهەنگی سەربەخۆیان لە پاشکۆی

کتێبەکانیاندا فەرهەنگۆکیان ڕێکخستووە یان بە پێچەوانەوە بە زمانەکانی خۆیان بەرامبەرەکەی بە کوردی واتای زۆر وشەیان لێکداوەتەوە. دوای ئەوانەش لە کوردستانی باشووردا چەندان مامۆستاو نووسەری گەورە خزمەتی زۆری زمانی کوردیان کردووە. لەوانە بەشانازییەوە پەنجە بۆ مامۆستای خوالێخۆشبوو گیوی موکریانی رادەکێشرێ، کە ئەم فەرهەنگانەی داناوە:

١- فەرهەنگی رابەر، عەرەبی- کوردییە، هەولێر، ١٩٥٠.

٢- کۆلکە زێڕینە، کوردی- عەرەبی- فارسی- فەڕەنسی ئینگلیزییە،١٩٥٥.

٣- فەرهەنگی مەهاباد، کوردی- عەرەبییە، هەولێر، ١٩٦١.

٤- فەرهەنگی کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٠.

لە دوای مامۆستای ناوبراو کۆمەڵێ زاناو نووسەری دیکە فەرهەنگی کوردی سەرنجی راکێشاون ، لەوانە ئایەتوڵڵا شێخ محەمەد مەردوخی کوردستانی، لە ساڵی ١٩٥٦دا (فەرهەنگی مەردوخ)ی بە دوو بەرگ بڵاوکردەوە، بەرگی یەکەمی لە پیتی (ا-ن)و بەرگی دووەم لە (س-ی)دەست پێدەکاتو بەرگی یەکەم (٩٨١) لاپەڕەی قەوارە گەورەو بەرگی دووەم(٩٦١) لاپەڕەیەو سەرباری ئەوەش ژمارەیەکی زۆر لە پەندی پێشینانی کوردی بۆ شێوەزاری ئەردەڵانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی. ئەم فەرهەنگە بە نرخە کوردی- فارسی- عەرەبییەو لە تاران بە زەنگۆگرافو بەخەتی فارسی شکستە بڵاوکراوەتەوە.

لە ساڵەکانی دواتریش لە کوردستانی باشوور نووسەرانی وەک:

عەلائەدین سەجادیو شێخ محەمەدی خاڵو شاکر فەتاحو جەمال نەبەز، لە ئێران نوسەرانی وەك: صدیق صفی زادەو ئاورنگو سەیدیانو لە کوردستانی باکوور موسی عەنتەرو لە کوردستانی رۆژئاوا جگەر خوێنو چەندان کوردو غەیری کورد لە وڵاتانی دەرەوە بە تایبەتی لە یەکێتی سۆڤیەتو ئەڵەمانیاو فەرەنسا کاری بە نرخیان ئەنجام داوە.

ئەمە ئاوڕدانەوەیەکی زۆر خێرای فەرهەنگنووسیی کوردی لە سەرەتاوە تا کۆتایی شەستەکانو سەرەتای حەفتاکان بوو.

## ٣- فەرهەنگنووسیی کوردی لە ١٩٧٠-١٩٨٤:

لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠دا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە شێوەی (نەوبەهار)ی ئەحمەدی خانی فەرهەنگێکی بە چاپ گەیاند، ئەم فەرهەنگە بە ناوی (دوو ڕشتە)یەو لە (١١٢) لاپەڕەدایەو عەرەبی- کوردییە.

فەرهەنگەکە بە سەر چەندان باسی جودا دابەش کراوە، وەك: ناوە پیرۆزەکان، رشتەی ماددەو ماویە، ئادەمیزادو ئەندامەکانیو بە سەرهاتی(عەقلو عیلمو حەواس) پێویستیەکانی نووسینو زۆر بابەتی دی.

نموونەیەك لەو فەرهەنگە، (ل٢٣):

| | |
|---|---|
| (عرق) ئارقە (زبد) یەعنی کەف | (ریق)و(بصاق)و(رچاب) یەعنی تف |
| (غمص) بە مەعنا رییۆقی چاوە | (دمع) فرمێسکە (عبرە) بەد ناوە |
| (نخع) ئاوی لووت(نخامە) چڵمە | (لعب) یەعنی لیك(بلغم) بەلغەمە |
| (لمی) ئاوی دەم، بە پێی شەرعو دین | هەموویان پاکن بیزانە یەقین |

| | |
|---|---|
| (قی‌و) ڕشانەوە پیسە ئەم ناوە | چونکە لە مەعدەی گەرما کولاوە |

لە ساڵی ١٩٧١دا لە کوردستانی ڕۆژهەڵات لەلایەن صدیق صفی زادە (بۆرەکەئی)وە فەرهەنگی (پەهلەوی- کوردی) لە تاران بڵاوکرایەوە. ئەم فەرهەنگە(٩٦) لاپەڕەیە.

لەهەمان ساڵدا(١٩٧١) لێژنەیەک لە مامۆستایانی پارێزگای سلێمانی (زاراوەی پارێزگای سلێمانی)یان دەرکرد، ئەم نامیلکەیە هەر لە سلێمانی چاپ کراوەو نێزیکەی ١٤٠٠ وشە دەبێ‌و (٣٤) لاپەڕەیە. ساڵی ١٩٧٢ صادق بەهائەدین ئامێدی (ئیدیەمێت کوردی) بە چاپ گەیاند. مامۆستای ناوبراو ئیدیەمەکانی بە کرمانجی ژووروو نووسیوەو بەرامبەرەکەی بە عەرەبی مانای لێکداونەتەوەو ئەم کتێبە لە بەغدا بە ١٦٨ لاپەڕە چاپکراوە. هەر لە ساڵی ١٩٧٢دا گیوموکریانی، کە تەمەنێکی درێژی بە کاری فەرهەنگ نووسیەوە بردە سەر، یەکێ لە کارە بە نرخەکانی خۆی خستە بەردەستی خوێندەواران، ئەویش کتێبی (ئەلفو بێی کوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی، بە زاراوەکانی سۆرانی، بادینی، فەیلی، هەورامی)بوو. ناوبراو لەم کتێبەدا وشەو زاراوەکانی بە هەر چوار دیالێکتی کوردی لێداوەتەوە.

هەروەها لە کۆتایی کتێبەکە لە (ل١٢١-١٥٨) لە هەندێ رووی ڕێزمانی کوردی کۆڵیوەتەوە. ئەم کتێبە ١٥٩ لاپەڕەیەو لە چاپخانەی کوردستان لە هەولێر لە چاپ دراوە. دەبی ئەوەش بڵێین ئەم کتێبە وێنەداریشە.

نموونەیەک لەم کتێبە:

| | | |
|---|---|---|
| S. Basik | (سۆرانی) | |
| B. zend | (بادینی) | Basik |
| F.Beleseq | (فەیلی) | |
| H. Herejin | (هەورامی) | |

لە سالی ١٩٧٢دا عەبدولقادر بەرزنجی(فەرهەنگی زانیاری)، ئینسکلۆپیدیای کورد)ی بە چاپ گەیاند.. ئەم فەرهەنگە لە سلێمانیو بە (٢٣٧) لاپەرە چاپ کراوە، مامۆستای ناوبراو چەندان زاراوەی زانستی لێکداوەتەوەو بە درێژی لە کۆمەڵێ ناو دواوە، ئەم بەرگە بەرگی یەکەمە. هەر لە سالی ١٩٧٢دا مەعرووف قەرەداغی بەرگی یەکەمو دووەمی (فەرهەنگی کشتوکاڵ)ی لە بەغدا بە چاپ گەیاند، کە تیایدا چەندان وشەو زاراوەی تایبەت بە کشتوکاڵو ئامێرەکانیو جووتو جووتیاری روون کردۆتەوەو مانای لێداوەتەوە. ئەم فەرهەنگە بەرگی یەکەمی (١٩٨) لاپەڕەو بەرگی دووەمی (١٥٧)لاپەڕەیە، بەڵام بەرگی دووەمی لە (١٩٧٣) لە چاپ تەواو بوو.

دیسان هەر لە ١٩٢٧دا دەزگا رۆشنبیرییەکانیش هەستیان بە پێویستی کاری فەرهەنگ نوسی کرد، بۆیە گۆڤاری(پەروەردەو زانست) ژمارە ٤، ساڵ٢، بە ١٩٦ لاپەڕە فەرهەنگێکی کوردی- عەرەبی خستە بەردەستی خوێندەوارانی کورد.

لە سالی ١٩٧٣دا ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد (زاراوەی کارگێڕی) یان بلاوکردەوە، ئەم کتێبە ١٦٩ لاپەڕەیەو دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد پێشەکی بۆ نووسیوەو رێکی خستووە. لەم کتێبەدا زاراوەکانی بە عەرەبی

و بەرامبەرەکەی بە کوردی واتایان لێداوەتەوە. ئەم کتێبە لیستی یەکەمو دووەمی زاراوەکانی کۆڕ بوو.

لە ساڵی ١٩٧٤دا ئەنجوومەنی کۆڕ لیستی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕیان بڵاوکردەوە. ئەم لیستە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی دووهەم-بەشی دووەمدا بڵاوکراوەتەوە، لە لاپەڕە (١٦٤-٢١٨)ی گرتۆتەوە. ئەم لیستە زاراوەی هەمە چەشنەو زاراوەی زمانو زاراوی پزیشکی گرتۆتەوە.

هەر لە ١٩٧٤ کەمال جەلال غەریب بەرگی یەکەمو دووهەمی(فەرهەنگی زانیاری)ی دەرکرد، ئەم فەرهەنگە بە ٤٢٨ لاپەڕە لە بەغدا چاپ کراوە.

هەر لە هەمان ساڵدا گۆڤاری پەروەردەو زانست دووبارە ژمارە(٧و٨)ی خۆی بۆ فەرهەنگ تەرخان کردووە. ئەمجارە فەرهەنگۆکێکی عەرەبی-کوردی بوو، ئەم نامیلکەیە زێتر وشەو زاراوەی پێویست بۆ قوتابخانەکانی تێدایە.

ساڵێك دوای ئەوە، لە ١٩٧٥دا ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد لیستی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕیان بە چاپ گەیاند، ئەم نامیلکەیە لە بەغدا بە ٤٦ لاپەڕە لە چاپ دراوە، هەروەك لیستەکانی دی عەرەبی- کوردییە، ئەم نامیلکەیە دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف پێشەکی بۆ نووسیوەو رێکی خستووە، نامیلکەکە لە سێ بەش پێکهاتووە:

١- زاراوی زمان.

٢- زاراوی کارگێڕی.

٣- زاراوی کتێبی فێرگەکان.

هەر لە ساڵی ١٩٧٥دا ئەنجومەنی کۆڕ(زاراوی هەمە چەشنە)، کە لیستی پێنجەمی زاراوەکانی کۆڕ بوو بە چاپیان گەیاند. ئەم لیستەش عەرەبی– کوردییە، بۆ نموونە:

| زاراوی عەرەبی | زاراوی کوردی |
|---|---|
| اتقاد | کلپە، سۆڵە |
| حالوب، ناعم | گژگ ، تەرگژ |

## تێبینی:

(هالاو)و (بلێسە)ش بە کاردێن.لە بادینان بە کاردەهێنرێ.

لە ساڵی ١٩٧٦دا شێخ محمدی خاڵ بەرگی سێیەمی فەرهەنگە بە نرخەکەی(فەرهەنگی خاڵ) بە چاپ گەیاند. ئەم بەرگە لە پیتی (ق–ێ)یەو لە (٥١١) لاپەڕەدایە. ئەم فەرهەنگە کوردی– کوردییەو نووسەر هەوڵی داوە وشەو زاراوەی زۆربەی ناوچەکانی کوردستان روون بکاتەوە. هەروەها لە کۆتایی فەرهەنگەکەیدا چەند وتەیەکی کوردی کۆنی لە فەرهەنگێکی ماد دەرهێناوە.

هەر لە ساڵی ١٩٧٦دا صدیق صفی زادە لە تاران چوار نامیلکەی دەرکرد.نووسەری ناوبراو لەم چوار نامیلکەیەدا وشە فارسیو کوردییە هاوتاکان یان چوونیەکەکان دەست نیشان کردووە. جا هەر یەك لەم نامیلکانەدیالێکتێکی کوردی گرتۆتەوە.ئەمەسەرباری ئەوەی صدیق صفی زادە زۆر بەرهەمی دی، جگە لە کاری بەرهەم بە چاپ گەیاندووە[٣]

لە ساڵی ١٩٧٧دا فاضل نظام الدین فەرهەنگێکی بە نرخی پێشکەش بە

بە کتێبخانەی کوردی کرد، ئەمیش (فەرهەنگی ئەستێرە گەشە) بوو، ئەم فەرهەنگە ٧٧٤ لاپەڕەیەو کوردی- عەرەبی یەو لە بەغدا لەلایەن دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بڵاوکراوەتەوە. ئەم فەرهەنگەو گشت فەرهەنگەکانی دی کەم و کوڕیان لەوەدایە وشەو زاراوەکانی گشت ناوچەکانی کوردستانی نەگرتۆتەوە.

هەر لە ساڵی ١٩٧٧دا (عەبدولرەحمان محەمەدەمین زەبیحی) بەرگی یەکەمی (قاموسی زمانی کوردیی) کە تەرخان کرابوو بۆ پیتی_ك) بڵاو کردەوە، ئەم فەرهەنگە بە نرخە- کوردی- یەو لە بەغدا بە(٢٤٦) لاپەڕە بڵاوکراوەتەوە.

هەر لە ساڵی ١٩٧٧دا لەلایەن(ی. ئی، کێدایتینێ)و(کوردستان موکریانی)و(ڤ.ئی.میترۆخینە) فەرهەنگێکی قوتابخانەیی لە مۆسکۆ بە چاپ گەێندرا. ئەم فەرهەنگە رووسی- کوردییەو (٢١٠٠) وشەی رووسییەو بە کوردیماناکانی لێدراوەتەوە، ئەم فەرهەنگە کە لە دەزگای چاپەمەنی (زمانی رووسی)یە، پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ لە رووی زانستی یەوە پێیدا چووەتەوە[٤]

لە ساڵی ١٩٧٨دا فەرهەنگێکی بە نرخ لەلایەن (مەحمود زامدار)ەوە بڵاوکرایەوە. ئەم فەرهەنگە (فەرهەنگی لەک و لوڕ) بوو، کە لە دانان و کۆکردنەوەی (حەمید ئێزەد پەناهـ)و مەحموود زامدار لێیدواوەو بەراوردی کردووە. فەرهەنگەکە لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردە لە بەغداو لە (٢٣٠) لاپەڕەیەو حەمیدی ئێزەد پەناهـ لە کۆتایی فەرهەنگەکەیدا هەندێ رووی رێزمانی دیالێکتی لوڕیشی روون کردۆتەوە. فەرهەنگەکە خۆی لوڕی-

فارسییە، بەڵام (مەحمود زامدار) کردوویە بە لوڕی – کرمانجی خواروو– فارسی.

ئەگەرچی ئەم کارە پیرۆزە وردە هەڵەی تێکەوتووە، بەڵام کارێکی بە نرخە.

لە ساڵی ١٩٧٩دا (عەبدولڕەحمان محەمەد زەبیحی) بەرگی دووەمی(قاموسی زمانی کوردیی)بڵاوکردەوە، کە بۆ پیتی (ب) تەرخان بوو، ئەم بەرگە (٢٢٠) لاپەڕەیەو هەروەك بەرگی یەکەم کوردی– کوردییە، لەهەمان ساڵدا (فتاح عزیزی اقدم) لە ئازربایجانی ڕۆژئاوا، پیرانشهر، بەرگی یەکەمی (فرهنگ اصیل)ی بڵاوکردەوە. ئەم فەرهەنگە، کە (١٨١)لاپەڕەی قەوارە بچووکە کوردی– فارسییەو بە دەست خەت نووسراوەتەوەو بە زەنگۆگراف بڵاوکراوەتەوە.

لە ساڵی ١٩٨٠دا خاتوو جویس بلو Joyce Blau لە پاریس کتێبێکی بە فەڕەنسی دەربارەی کورد بڵاوکردەوە. لە کۆتایی کتێبەکەیدا دوو فەرهەنگۆکەی (کوردی– فەڕەنسی)و(فەڕەنسی– کوردی) بڵاوکردۆتەوە، یەکەمیان لە لاپەڕە(٢١٠– ٢٤٥)و دووەمیان لە ( ٢٤٦–٢٨٧) ی کتێبەکەی گرتۆتەوە. کوردی یەکەیشی بە ئیملای عەرەبیو لاتینی نووسراوە. کتێبەکە خۆی(٢٨٨)لاپەڕەیەو لەلایەنە دەزگای Libraie C. Kinvksieck یەوە بڵاوکراوەتەوە[٥] شایانی باسە ئەم خاتوونە (جویس بلو) چەندان شتی دی دەربارەی کورد لە پاریس بڵاوکردۆتەوە[٦]

لە ساڵی ١٩٨٠دا سیامەند سەلیم کتێبی (چۆن فێری زمانی هیندی= کوردی– عەرەبی– دەبیت..) بڵاوکردەوە. ئەم کتێبەی نووسەری

نـاوبراو(١٢٥) لاپەڕەیـەو تیایـدا ژمارەیـەکی زۆر وشـەو رسـتەی هینـدی نووسیوەو بەرامبەرەکەیان بە کوردیو عەرەبیو واتاکانی نووسیون. ئەم کتێبە لە بەغدا چاپ کراوە.

لە ساڵی ١٩٨٢دا لە کوردستانی رۆژهەڵات لەلایەن (شکراللە بابان)ەوە (فەرهەنگی بابان) بڵاوکرایەوە، ئەم فەرهەنگە بە نرخەی مامۆستا(٨٧٢) لاپەڕەیەو (فارسی- کوردی)یە، فەرهەنگەکەی وشەیەکی زۆری بە خۆوە گرتووە. نووسەر لە سەرەتای فەرهەنگەکەی وتارێکی دەربارەی کوردستان نووسیوەو زێتر بە لای مێژوودا دەچێتەوە.

هـەر لـە سـاڵی ١٩٨٢دا لـە تـاران لەلایـەن (صـدیق صـفی زادە)ەوە (فەرهـەنگی مـاد) بڵاوکرایـەوە. ئـەم فەرهەنگـە(کـوردی- فارسـی)یـەو ٢١٥)لاپـەڕەی قـەوارە گەورەیـەو نـاوە نـاوە بـە وێنـەش وشـەکان روون کراونەتەوە. نووسەر لـە سـەرەتادا چەند باسێکی دەربارەی کوردو زمانی کوردیو دیالێکتەکانی زمانی کوردیو فەرهەنگنامە کوردییەکان نووسیوەو ئەمجا هاتۆتە سەر هەندێ لایەنی رێزمانی کوردیو لێیان دواوە، شایانی باسە ئەم بەرگە بەرگی یەکەمی فەرهەنگەکەی نووسەر تەرخانە بۆ پیتی(ئ).

دیسان هەر لە ١٩٨٢دا (محەمەد ئەمینێ ئۆسمان) نامیلکەیەکی بە ناوی (کوردی- ئورووپی بەرهەڤکرن) بڵاوکردەوە. ئەم نامیلکەیە لە بەغدا بە (٦١) لاپەڕە چاپ کراوە، کە نووسەر تیایدا چەندین وشەی کوردیو ئەورووپی بەراورد کردووەو وەك لە سەرەتای کتێبەکەیدا دەڵێ ئەم نامیلکەیە لە١٩٧٢ دوە بۆ چاپ ئامادەکراوە.

لە ساڵی ١٩٨٣دا لـەلایەن (دکتۆر قـەناتی کوردۆو دکتور زارێ یوسف)

دەوە(فەرهەنگی کوردی- رووسی(سۆرانی) لە مۆسکۆ بڵاوکرایەوە. ئەم فەرهەنگە بە نرخە(٧٥٢) لاپەڕەیەو نێزیکەی ٢٥٠٠٠ وشە دەبێ.

هەر لە هەمان ساڵ (سیامەند سلیم)بەرگی دووەمی(چۆن فێری زمانی هیندی- کوردی- عەرەبی دەبیت) بڵاوکردەوە، ئەم بەرگە(١٨٤) لاپەڕەیە. نووسەر هەر لە ١٩٨٣دا بەرگی یەکەمیشی دووبارە چاپ کردەوە. هەردوو بەرگ لە بەغدا چاپکراون. هەر لە ساڵی ١٩٨٣دا (صابر گرد عازەبانی)نامیلکەی(کیف تتعلم التدریب علی المحادثة باللغتین العربیة والکردیة) بڵاوکردەوە بەرگی یەکەمی ئەم نامیلکەیە(١٢٢) لاپەڕەیەو نووسەر چەندان وشەو رستەی عەرەبیو کوردی بەرامبەر یەك کردووە واتاکانی هەر یەکەکانی بە زمانی دی نووسیوەتەوە.

هەر لەو ساڵەدا بەرگی دووەمیشی بە (١٢٧) لاپەڕە لە سلێمانی بە چاپ گەیاند.

لە ساڵی ١٩٨٣ کەمال جەلال غەریب بەرگی سێیەمی لە فەرهەنگی زانیاری بە چاپ گەیاند. ئەم بەرگە (٣٨٢) لاپەڕەیەو لە بەغدا چاپکراوە. لەم فەرهەنگەدا وشەکانی بە عەرەبی نووسیوەو بەرامبەرەکەیان بە ئینگلیزیو ئەمجا بە کوردی واتاکانیانی لێداوەتەوە. مامۆستا وشەیەکی زۆری نووسیوەو بۆ یەکێ بیەوێ گوتارو لێکۆڵینەوەی زانستی لەبارەی کیمیاو فیزیاو زانستەکانی دیکەوە بنووسێ زۆر سوود لەم فەرهەنگە دەبینێ، بێجگە لەم فەرهەنگانە، فەرهەنگێکی دی بە ناوی (وشە بژێر) هەیەو لەلایەن(م. س. کارا)ەوە لە کوردستانی رۆژهەڵات چاپ کراوە، ئەم فەرهەنگە

فارسی- کوردییەو (٢٠٠)لاپەڕەی قەوارە بچووك دەبێت. ساڵی چاپکردنی بە سەرەوە نیە، بەڵام بە دڵنیاییەوە لەم چوار پێنج ساڵەی دواییدا دەرچووە.

ئەمە لیستی ئەو فەرهەنگە کوردییانە بوو، کە لە نێوان ساڵانی (١٩٧٠-١٩٨٤)دا چاپکراون (ئەوەندەی من ئاگام لێیان بێ). سەرباری ئەو فەرهەنگانەی باسمان لێوە کرد، چەندان کتێبی دیکەی کوردیو غەیرە کوردی بڵاوکراونەتەوە، کە لە کۆتایی کتێبەکانیاندا فەرهەنگۆکیان بۆ کردووە. بۆ نموونە:

١- ژیانی ئافرەتی کورد، نووسینی هێنری هەرۆڵد هەنسن، وەرگێڕانی، عەزیز گەردی، بەغدا، ١٩٨٣، ل٤٢٢-٤٣٠.

٢- تەنەکە، یەشار کەمال، وەرگێڕانی، شوکور مستەفا، بەغدا، ١٩٨١، ل١٩٤-٢٠٤.

٣- کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبیی، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، بەغدا، ١٩٧٩،ل٣٦١-٣٦٥.

٤- لیرەیەك لە گەنجینەی نەتەوەی کورد، ئەسعەد عەدۆ، بەغدا، ١٩٨٤، ل١١٧-١٢٦.

٥- فەلسەفەی جوانیو هونەر، کەمال مەمەند میراودەلی، سلێمانی، ١٩٧٩، ل٢٨٥-٣٩١،.

خشتەی فەرهەنگنووسیی کوردی (١٩٧٠-١٩٨٤):

| ساڵەکان | عێراق | ئێران | سۆڤیەت | فەرەنسا |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٧٠ | ١ | X | X | X |
| ١٩٧١ | ١ | ١ | X | X |
| ١٩٧٢ | ٥ | X | X | X |
| ١٩٧٣ | ٢ | X | X | X |
| ١٩٧٤ | ٣ | X | X | X |
| ١٩٧٥ | ٢ | X | X | X |
| ١٩٧٦ | ١ | X | X | X |
| ١٩٧٧ | ٢ | ٤ | ١ | X |
| ١٩٧٨ | ١ | X | X | X |
| ١٩٧٩ | ١ | X | X | X |
| ١٩٨٠ | ١ | ١ | X | ١ |
| ١٩٨١ | - | X | X | X |
| ١٩٨٢ | ١ | X | X | X |
| ١٩٨٣ | ٦ | ٢ | ١ | X |
| ١٩٨٤ | X | X | X | X |
| بە گشتی | ٢٧ | ٨ | ٢ | ١ |

**تێبینی:** بە پێویستم نەزانی ناوی سەرچاوەکان بنووسمەوە، هەموو ئەو فەرهەنگانەی ناوم بردن سەرچاوەی ئەم باسەن. (نووسەر).

## پەراوێز وسەرچاوەکان:

(1) بیبلۆگرافیا: **Bibliography** وشەیەکی یۆنانییە، لە دوو بەش پێکهاتووە. یەکەم، **Biblio** واتا کتێبو دووەم**graphy** واتا(نووسینەوە، دەنووسم)هاتووە، لەسەرەتادا لەزمانە ئەوروپاییەکاندا وشەی بیبلۆگرافیا بۆ (هونەری کتێب نووسینەوە) بەکار دەهێنرا، لەپاشان وای لێهات کە بۆ ئەو باسایانە بەکاردەهێنرا، کە دەربارەی کتێب دەنووسرا. ئێستا بیبلۆگرافیا بەو سەرچاوانە دەگوترێت، کەبەرهەمی نووسراوی نووسەران، چاپکراوو چاپ نەکراو بەشێوەی لیستەی رێکخراوی فراوان پێشان دەدات، بۆ زێدە شارەزایی بروانە:

- ئیبراهیم ئەمین باڵدار: کتێبخانە، زانکۆی سلێمانی، ١٩٨٠.
- بیبلۆگرافیای کتێبی کوردی، ئەریمان، بەغدا، ١٩٧٧.

(2) بروانە: وشەی زمانی کوردی، د. ئەورەحمانی حاجی مارف، بەغدا، ١٩٧٥،ل٦٩.

(3) لەوانە:

١- بابا تاهیری عوریان، ١٣٦١.

٢- مشاهیر اهل حق، تهران، ١٣٦٠.

٣- کردی بیاموزیم، تهران، ١٣٦٠.

(4) بروانە، پاشکۆی عێراق، ژمارە(١٧)، ١٩٧٨.

(5) بروانە:

**Joyce Blau de Kurde, Dialecte Sorani, Librairie C. Klincksieck, Paris,١٩٨٠.**

(6) لەوانە:

**Joyce Blau, Dictionaire Kurd- Francais Anglais, Paris,١٩٦٥.**



# ڕۆڵی کورد لە ڕاپەرینی کانوونی ١٩٤٨ لە عێراقدا*

م.مەهدی محمد قادر
کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەدین

بارودۆخی سیاسی لە عێراقدا لە ئەنجامی مانەوەی هەیمەنەی ئینگلیزەکان‌وپاشکۆیەتی ولاَت لە ڕووی ئابوری‌وسیاسییەوە بە بێگانەوە ونەبوونی ئازادییە دیموکراتیەکان، هیچ گۆڕانێکی تێدا چاوەڕوان نەدەکرا کە ببێتە هێنانەدی ئامانجەکانی گەل، هەر بۆیە بەرزبونەوەی دەنگی ناڕەزایی لەلایەن تەواوی گەل و حزب و ڕێکخراوە ئاشکراو نهێنییەکان لەپێناوی بەدیهێنانی مافەکانی گەل قۆناغێکی نوێی گرتەبەر[1].

ڕەتکردنەوەی پەیماننامەی حوزەیرانی ١٩٣٠ی نێوان (عێراق‌وبەریتانیا) لە پێشەنگی ئەم داواکارییانە بوو، هەرچەندە بیروبۆچوونەکان سەبارەت بەم پەیماننامەیە جیاوازییان هەبوو، حزبە ئاشکراکان لە دژی هەر گۆڕانکارییەک بوون و هەر پەیماننامەیەکی نوێیان ڕەتدەکردەوە کەشوێنی پەیماننامەی ١٩٣٠ بگرێتەوە، بەلاَم حزبە نهێنییەکان لەوانەش حزبی شیوعی عێراق‌و پارتی دیموکراتی کورد دژی هەر پەیمانێك بوون کە لەگەلَ ئینگلیزەکان مۆربکرێت، لە هەمان کاتیشدا هەولَی ئەوەیان دەدا کە لەڕێگای چالاکی شۆڕشگێرانەو ڕێکخستنی خۆپیشاندان‌و مانگرتنەکانی جەماوەرەوە لە دژی

بۆستن[٢]. ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران لە ڕێگای دانیشتەکانی ئەنجەمەنەوە بە ڕاشکاوی بیرۆکەی گۆڕانکاری بەسەر پەیمانی ١٩٣٠ یان خستەبەرباس وگفتوگۆ[٣].هەروەها هەندێ لە ئەندامان بەهۆی نەبوونی متمانەیان بە ئینگلیزەکان بیرۆکەی ڕەتدکرنەوەیان پەسەند دەکرد[٤].

سەرەڕای ئەمەش رۆژنامە نیشتیمانییەکانیش ڕۆڵی کاریگەرییان دەبینی لە وشیارکردنەوەی گەل و دەرخستنی خراپیەکانی بەستنەوەی وولات بە ڕەوڕەوەی بێگانە بەهۆی ئەم پەیماننامە نەگریسانەوە[٥].

لە ئەنجامی ئەو پەرەسەندنە سیاسییانەی کە وولات بەخۆوەی بینی، یەکەمین حکومەتی دوای جەنگ لەلایەن (توفیق سویدی) دامەزرێنرا، بەڵام بەهۆی زوو لەکارکەوتنی ئەم وەزارەتە هیچ هەنگاوێکی کردارەکی ئەنجام نەدرا[٦].

ئینگلیزەکانیش لەلایەن خۆیانەوە کەوتنە بیرۆکەی گۆڕانی پەیماننامەکە بە پەیماننامەیەکی تر، کە بۆ ماوەیەکی درێژ ئامانجە سیاسی‌وسەربازی‌وئابورییەکانیان مسۆگەر بکات. بەڵام کاتی دەستپێکردنی ئەم هەنگاوە بەوەسی عێراقیان ڕاگەیاند، دواخرا بۆ دوای تەواوبوونی دانوستاندنەکانیان لەگەڵ (میسر) بۆ گۆڕینی پەیماننامەی ١٩٣٦ی نێوان (ئینگلیزومیسر)[٧]. هەر بۆیە بە درێژایی حوکمڕانی هەردوو وەزارەتەکەی (ئەرشەد عومەری ١/٦/١٩٤٦-١٦/تشرینی دووەمی/١٩٤٧) هیچ دانوستانێکی ڕەسمی ئەنجلم نەدرا[٨].

لە ٢٩ی ئاداری ١٩٤٧ (سالح جەبر) وەزارەتێکی نوێی پێکهێنا، کە ئەرکی سەرەکی بەستنی پەیماننامەیەکی نوێ بوو لەشوێنی پەیماننامەی ١٩٣٠،

هەروەک لەیەکێک لـە بـەندەکـانی پـرۆگرامی وەزارەتەکە تایبەت بە کاروبـاری دەروە هاتووە:

"کارکردن لەسەر پەیماننامەی عێراقی–بەریتانی لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی هەردوولا...لە بەر ڕۆشتایی بنـەماکان و دەقـەکانی پەیماننامـەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بەهێزکردنی ئەو دۆستایەتییەی کـە هەیـە لـەنێوان عێراق و بەریتانیا"[٩].

وەك هەنـگاوی یەکـەمیش "سالّح جـەبر" بـۆ جێبـەجێکردنی نـەخشەو کـاری وەزارەتەکەی مۆڵەتی کارکردنی ئاشکرای (حزبی یـەکێتی نیشتمانی و حزبـی گـەل)ی ڕەتکـردەوە، هـەردوو سیاسـەتمەدار (کامـل چادرچـی، عەبدولفەتاح ئیبراهیم) بە تۆمەتی جۆراوجۆر دران بە دادگـا، (عزیـز شـەریف) هەڵاتە دەرەوەی عێـراق[١٠] ولێـدانێکی کوشـندەی ئاراستەی حزبـی شیوعی عێراقی کرد، هەر سێ سەرکردە (فەهد، حازم، صارم) خرانە بەندیخانەوە[١١]، لـە ١٩ی حـوزەیرانی ١٩٤٧ هـەر چوار ئەفسەرە کوردەکـانی لـە سێدارەدا. بەمجۆرە بـارودۆخێکی لـەباری گونجانـدن بـۆ دەسـتپێکردن و جێبـەجێکردنی نەخشە و پلانەکانی بە یارمەتی ئینگلیزەکان.

یەکەمین دانوستاندنی ڕەسمی بەشێوەیەکی نهێنی لـە ٨ی مایسی ١٩٤٧ لـە باڵیۆزخانـەی بـەریتانیا لـە بەغـداد دەسـتپێکرد. دواتـر دانوستاندنەکان درێژەیان کێشا و شاندی عێـراق چـەند جارێـك سـەردانی لەنـدەنی کـرد، بـەم شێوەیە چەندین کۆبونەوە لە بەغداد و لەندەن بەڕێوەچوون بۆ گـەیشتن بـە شێوازێکی کۆتـایی[١٢]، دواجـار لـە ٤ی کـانوونی دووەمـی ١٩٤٨ بـە بڕیـاری ئەنجومـەنی وەزیـران، شـاندی عێـراق بـۆ گفتوگـۆ کۆتـایی و مـۆرکردنی

پەیماننامەکە دەستنیشان کرا(١٣)، بە سەرۆکایەتی (ساڵح جەبر)، دوای گەیشتنی شاندی ناوبراو لە ڕۆژی ٥ی کانوونی دووەم و کۆبوونەوەکانی لە ڕۆژانی ١٠،٨،٧ی هەمان مانگ(١٤)، لە ڕۆژی ١٥ی کانوونی دووەم لە (پۆرتسمۆس)* هەردوو وڵات ئیمزای پەیماننامەکەیان کرد(١٥).

داوبەدوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی مۆرکردنی (پەیماننامەی پۆرتسمۆس) لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکان لە ١٦ی هەمان مانگ(١٦)، هەموو خەڵکی عێراق بە جارێك خرۆشان بە هەزاران خۆپیشاندەر ڕژانە سەر شەقامی شارە گەورەکانو نارەزایی گەل دژی ئەم پەیماننامەیە زۆر بە خێرایی تەشەنەی کرد و گەیشتە پلەی ڕاپەڕینێکی گەورە.

سەبارەت بە ڕۆڵی کورد لە ڕاپەڕینەکانی بەغداد، هەر لەسەرەتاوە زۆر بەگەرمی تێکەڵ بە ڕووداوەکان بوون لە یەکەمین ڕاپەڕینی جەماوەریدا لە ٥ی کانوونی دووەم کە لەئەنجامی ڕاگەیاندنەکانی وەزارەتی دەرەوە فازل ئەلجەمالی لە لەندەن دەستپێکرد لەلایەن قوتابیانی کۆلێژی ماف(١٧)، قوتابیە کوردەکانیش شان بەشانی خۆپیشاندەارن ڕژانە نێو شەقامەکان، هەر ئەوە ڕۆژەش لەسەر فەرمانی سەرۆك وەزیران هێزەکانی پۆلیس بەربوونە گیانی خۆپیشادەران. (عومەر مستەفا) کە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی پارتی دیموکراتی کوردو یەکێك لە قوتابیە کوردەکانی کۆلێژی ماف بوو، لە ئەنجامی بەشداربوونی لە خۆپیشاندانەکانی ڕۆژانەی کۆلێژی مافو ڕووبەڕووبوونەوەکانی هێزەکانی بریندار کرا(١٨). هەروەها حکومەت بە بیانووی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی گێرەشێوێن لە ناو قوتابیاندا کۆلێژی مافی داخست و ژمارەیەك لە قوتابیان دەستگیرکران(١٩).

لەسەر ئاستی سیاسیش (پارتی دیموکراتی کورد) بەمەبەستی سەرپەرشتی و ئەرکی ڕێکخستنی خەباتی گەل ودیارکردنی دروشمەکانی خەباتی ئەم قۆناغە، شان بەشانی (حزبی شیوعی عێراق، حزبی گەل، باڵی چەپرەوی- حزبی نیشتمانی دیموکراتی) لیژنەیەکی تایبەتیان دامەزراند بەناوی (لیژنەی هاریکاری نیشتمانی)[20] کە دروشمە سەرەکییەکانی (پووچەڵکردنەوەی پەیمانی پۆرتسمۆس، ڕووخاندنی حکومەتی ساڵح جەبر، هەڵبژاردنی ئازادی نوێنەرانی گەل، دانی مافە دیموکراسییەکان، نەهێشتنی گرانی) بوو[21]. (ڕەشید عەبدولقادر) ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کورد، نوێنەرایەتی (پارتی) لە لیژنەکەدا دەکرد. کە کۆبوونەوەکانی لیژنەکە لە ژوورە تایبەتەکەی خۆیدا لە (بارتمنت ماریا) لەشاری بەغداد بەڕێوەدەبرد[22].

لە یەکەمین کاردانەوەی مۆرکردنی پەیماننامەکە لە ١٥ی کانوونی دووەم، جگەلە حزبەکانی نێو (لیژنەی هاریکاری نیشتمانی) حزبە مۆڵەت پێدراوەکانیش (حزبی نیشتمانی دیموکراتی) و (حزبی ئازادیخوازان) و حزبی سەربەخۆیی) دژی مۆرکردنی پەیماننامەکە بەیاننامەیان دەرکرد[24]، تیایدا داوایان کرد کە گەلی عێراق ئەم پەیمانە ڕەت بکاتەوەو ئەمەشیان ڕاگەیاند کە حکومەتی (ساڵح جەبر) هیچ کاتێك مافی ئەوەی نییە بەناوی گەلی عێراقەوە پەیمانێکی نوێ لەگەڵ بەریتانیادا ببەستێت[25].

بەمجۆرە دوای دەرکەوتنی هەڵوێستی حزبە ئاشکراکان و لیژنەی هاریکاری، ڕۆژی ١٩ی هەمان مانگ بە هەزاران خۆپیشاندەر بە دروشمە نیشتمانییەکانیانەوە ڕژانە سەر شەقامەکان و بەدەم هاواری (بڕوخێ

حکومـــەتی ســالح جــەبر) و (بمــریّ پـــەیمانی پۆرتـــسمۆس) ڕێـــڕەوی خۆپیـشاندەران بـەرەو ئەنجومـەنی نوێنـەران ڕۆیـشت (جـەمال بابـان) لـە بەیاننامەیەکی ڕەسمیدا کەوتـە هەڕەشـەکردن لـە گـەل و ڕایگەیانـد کـە هـەر خۆپیشاندانێکی تر ڕوویداتەوە بەشێوەیەکی توندوتیژ ڕێگای لێدەگیرێت[٢٦].

بەڵام هەڕەشەکانی (جەمال بابان) نەبووە هۆی سارکردنەوەی جەماوەرەکە و ڕۆژی دواتـر واتـە ٢٠ی کـانوونی دووەم بەغدادی پایتـەخت خۆپیـشاندانێکی گەورەی بەخۆوە گرت، کـە لەئـەنجامی هێرشـی هێزەکـانی پـۆلیس چـوار لـە خۆپیشاندەران کوژران و دەیـانیش برینـداربوون[٢٧]، لـە ڕۆژی ٢١ی کـانوونی دووەم کاتێـك ژمارەیـەکی زۆری جـەماوەر بەمەبەسـتی بەشـداریکردنی لـە ناشتنی قوربانیانی ڕۆژی ٢٠ی مانگ ڕوویان کـردە نەخۆشـخانەی (مەلـەکی)، هێزەکانی پۆلیس دەستیان بە لێدانی جەماوەرەکە کرد، بوو بەهۆی کـوژرانی قوتابیەکی کۆلیژی دەرمانسازی و برینداربوونی چەندانی تر[٢٨].

ئـەم ڕووداوەش بـوو بـەهۆی ناڕەزاییـەکی فراوانـی جـەماوەر، تەنانـەت هەستی ئەو کەسانەشی بزواند کە تا ئەم کاتەش بـەهۆی هۆکـاری جۆراوجـۆر تێکەڵ بە خەباتی جەماوەری نەبووبوون، بەمجۆرە ئـەم نیـشتمانپەروەرانەش دەنگـی ناڕەزاییـان بـەرزکردەوەو تێکـەڵ بەخـەباتی گـەل بـوون. هـەروەها دەستەیەك لە مامۆستایانی کۆلیژی پزیشکی و ژمارەیەکی زۆری پزیشکەکانی شاری بەغداد بەتوندی دژی ڕەفتارەکانی پۆلیس وەسـتان و دەسـتیان لـەکار کێشایەوە[٢٩].

لــە ئێـوارەی هــەمان ڕۆژ بەمەبەسـتی دەرچـوون لـەم تەنگژەیـەی کـە حکومەت تێیکەوتبوو، وەسی (عەبدولئیلای کوڕی عەلی) لە ڕێگەی ئێزگەوە

بەیاننامەیەکی بلاگردەوە، کە تێیدا بەڵێنیدا کە هیچ پەیمانێك مافی وولات وداخوازییە نیشتمانییەکانی ڕەچاونەکات، نابەسترێت[30]. دەتوانرێ بووترێ (وەسی) لەم بەیاننامەیەدا دوو مەبەستی سەرەکی هەبوو، کە بەهۆی بەڵێنەکانی متمانەی هەندێ لەو حزبانە بەدەست بهێنێت و لەلایەکی تریشەوە ئەو یەکریزییە لەناو ببات کەلەنێوان حزبەکاندا هەیە، کە هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆسارکردنەوەی جەماوەری ڕاپەڕیوو هێمن کردنەوەی بارەکە.

هەرچەندە هەندێ لە حزبەکان جۆرێك ساردبوونەوەیان لێ دەرکەوت وتارادەیەك متمانەیان بە ووتەکانی وەسی کرد، بەلام ئەوەی ڕۆڵی گەورەی گێڕا لە بەردەوامی خۆپیشاندانەکان و جۆشدانی جەماوەر (لیژنەی هاریکاری نیشتمانی) بوو کە بەیاننامەکەی وەسی بە شێوازێکی سرکەرانەی ڕاپەڕینەکە دەرخست و داوای کرد تەواوی گەل بەردەوام بن تاوەکو پەیماننامەکە بەشێوەیەکی تەواو لەگۆڕ دەنرێت[31].

بەمجۆرە لەژێر کارتێکردنی ڕێنماییەکانی (لیژنەی هاریکاری نیشتمانی) و هەڕشەکانی (سالح جەبر) لەلەندەن، ڕۆژی ٢٣ی کانوونی دووەم شاری بەغداد خۆپیشاندانێکی گەورەی جەماوەری لەخۆگرت کەچەندین دروشمی نیشتمانییان بەرزکردەوە کە بەشێکیان پێوەندداربوون بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد وەك دروشمی پێدانی مافە دیموکراتیەکان[32]. هەر لەهەمان ڕۆژدا بۆ ڕێزلێنان سەرداتی مەزارگای شەهیدانییان کرد[33] بەمجۆرە ڕۆژانی ٢٤و٢٥ی مانگ خۆپیشاندانی گەورە بەڕێوەچوو[34]. کوردە نیشتیمانپەروەرەکان لە شاری بەغداد جگە لە بەشداربوونیان لە خۆپیشاندانەکان هەندێکیان ڕۆڵی بەرپرسێتیان لە ئەستۆ گرتبوو، وەك عاسم

حەیدەری (١٩٢١-١٩٧١) کە ئەندامی حزبی شیوعی بوو لێپرسراوێتیی ڕێکخستنەکانی بەری (کەرخ)بوو لە ڕۆژانی ڕاپەڕیندا، (مەجید رووف) لە ڕێکخەرەکانی خۆپیشاندانەکانی (خانەی مامۆستایان-دار المعلمین العالیە) بوو، (جەودەت ئەحمەد ناجی) لێپرسراو بوو لەکۆلێژی ماف وبەرپرسی ڕێکخستنەکانی ئافرەتان بوو لەئەعزەمیە[٣٥].

لە ناو ئەم بارودۆخە دژوار و ترسناکەدا، ڕۆژی ٢٦ی کانوونی دووەم شاندی عێراق گەیشتەوە بەغداد، لە ئێوارەی هەمان ڕۆژدا سالح جەبر لە ڕێگای ئێزگەوە بەیاننامەیەکی ئاڕاستەی گەلی عێراق کردو داوای کرد هێمنی بنوێنن[٣٦]، بەڵام هەر دوای بڵاوکردنەوەی ئەم ڕاگەیاندنە بە ماوەیەکی کەم جەماوەری پایتەخت بەدەم دروشمی (بڕوخێ حکومەتی سالح جەبر و بمرێ پەیمانی پۆرتسمۆس) ڕژانە سەر شەقامەکان[٣٧]، بەمجۆرە شاری بەغداد شەوی ٢٦ لەسەر ٢٧ی مانگ لە چاوەڕوانی ڕووداوێکی گەورە کاتی بەسەربرد.

لەگەڵ بەیانی ڕۆژی ٢٧ی کانوونی دووەم کە بە ڕۆژی وەسبە ناسراوە ڕاپەڕینێکی جەماوەریی گەورە تەواوی بەغداد پایتەختی گرتەوە، لە نێو هێرشێکی جەماوەری ڕاپەڕیو ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە سەرکوتکەرەکانی حکومەتی پاشایەتی، داستانێکی گەورەیان لە مێژووی خەباتی دژ بە ئیستیعمار و نۆکەرانیان و گەل فرۆشان تۆمار کرد، کە بەدرێژایە حوکمڕانی سەردەمی پاشایەتی ڕووی نەدابوو.گەورەترین ڕووداویش شەڕی (پردی مەئمون)*یوو کە لە کاتی تێپەڕبوونی جەماوەری خۆپیشاندەر بەبەستی یەکگرتنەوەی هەردووبەرەی (کەرخ و ڕەسافە) ڕوویدا[٣٨].

ژمارەیەکی زۆر کوژران و بریندارکران[٣٩].

شەهیدانی کوردیش لە راپەرینەکانی شاری بەغداد، بوون بە لاپەڕەیەکی پرشنگداری مێژووی کوردوشانازییەکی گەورەی نەتەوەکەیان، پێناسەی خەباتی بێ ووچانی دژ بە ئیستیعمار و نۆکەران، لەوانەش (شەهید جوامێر، قادر چاوشین، حوسێن عەلی) بوون. ژمارەیەکیش لە کوردە نیشتمانپەروەرەکان لەڕۆژانی خەباتی گەلدا بەهۆی ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ هێزەکانی پۆلیس بریندار کران وەك (ئەحمەد وەلی، عومەر مستەفا) و چەندانی تر[٤٠].

ئەندامانی کوردیش لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا، هەڵوێستێکی نیشتمانی ودروستیان لە ڕووداوەکانی ڕۆژی ٢٧ی مانگ وەرگرت و دەست لەکار کێشانەوەی خۆیان ڕاگەیاند لەوانەش (محمد نەقیب– نوێنەری هەولێر، باباعەلی شێخ محمود، ئەنوەر جەمیل–نوێنەری سلێمانی، موسلح نەقشبەندی–نوێنەری موسڵ، محەمەد زیاد ئاغا، نوێنەری کۆیە)[٤١].

سەبارەت بە ڕۆڵی نیشتمانپەروەرانەی شار وشارۆچکەکانی کوردستان، هیچی کەمتر نەبوو لەشاری بەغداد، دروشمی (برایەتی کوردوعەرەب) لە گرنگترین دروشمەکانی راپەرینەکانی کوردستان بوو، کە ڕۆڵی سەرەکی ئەم وەرچەرخانە نیشتمانییە دەگەڕێتەوە بۆ خەبات وکۆششی (حزبی شیوعی عێراقی و پارتی دیموکراتی کورد) کە ڕۆڵێکی گەورەیان نواند لەهاندانی جەماوەر، کە لەڕۆژانی ڕاپەڕیندا هێزی سەرەکی بزوتنەوەی گەل ومەیدانی خەبات بوون[٤٢].

شاری هەولێر، بەشدارییەکی بێ وێنەی لە دژی حکومەتی سالح جەبر و

پەیماننامەی پۆرتسمۆس نواند و چەندین خۆپیشاندانی جەماوەری لەخۆگرت، بەجۆرێك کە لە پێشوودا ڕووی نەدابوو[٤٣]. لە دیارترین ئەو کەسانەی کە لە ڕۆژانی ڕاپەڕینەکاندا ڕۆلی کاریگەریان بینیوەو بە ووتارەکانیان جۆشی جەماوەریان دەدا (جەمال حەیدەری، شێخ محەمەد محەمەد (شێخەشەل)، عەلی فەتاح دزەیی، سمە عالّلایی، خالد جەبار، جوهەر حوسێن مەلا) چەندانی تر[٤٤]. بەلام سەبارەت بە هەلوێستی حکومەت لەبەرامبەر خۆپیشاندانەکان، هیچ کاردانەوەیەکی توندوتیژی ڕووی نەدا کە هیچ کەسێك ببێتە قوربانی، لەوەش دەچێت کە ئەم هەلوێست نواندنە بگەڕێتەوە بۆ بەرپرسانی ئەوسای هەولێر لەوانەش موتەسەریف (مستەفا قەرەداغی)[٤٥].

شاری (کەرکوك)یش، لە ژێر دروشمە نیشتمانییەکان لیژنەی هاریکاری نیشتمانی ودەنگی نارەزایی بەرامبەر بەپەیماننامەی پۆرتسمۆس، لە خۆپیشاندانێکی گەورەی جەماوەریدا لە ڕۆژی٢٧ی کانوونی دووەم هێرشیان بردە سەرکونسلخانەی بەریتانی ودەزگاکانی کۆمپانیای نەوتیش بەپۆلیس تەنران لەلایەن حکومەتەوە، لە ئاکامی ڕووبەڕووبوونەوەکانی جەماوەروهێزەکانی پۆلیس ژمارەیەك دەستگیرکران و ئازار و ئەشکەنجەدران[٤٦].

لە شاری سلێمانی، دوای بلاوبوونەوەی ڕاپەڕینی بەغداد، خۆپیشاندانەکانی دەستی پێکرد، قوتابیانی سانەوی سلێمانی ڕۆلی بەرچاویان گێڕا لە تەقاندنەی ڕاپەڕینەکان و جەماوەری شارەکەش زۆر بە گەرمییەوە تێکەلی ڕووداوەکان بوون. لە دیارترین ئەو کەسانەی کە لە

ڕاپەڕینەکاندا سەرچاوەی سەرەکی هاندانی جەماوەر بوون بە ووتارە شۆڕشگێڕەکانیان (حلمی عەلی شەریف، ئەکرەم یامولکی، سەید تەها سەید جەلال، ئەحمەد بادی، محەمەد کەریم فەتحوڵلا) و چەندانی تر[٤٧].

هەر چەندە ئەو کاتە شاری سلێمانی هیچ هێمایەکی ڕاستەوخۆی ئینگلیزەکانی لێنەبوو جگە لە (مەڵبەندی ڕۆشنبیری بەریتانی) نەبێت، کە لەلایەن (عەلی مەلا شەریف، حەمەبۆر) بەڕێوەدەبران، لە ڕۆژانی ڕاپەڕینەکەدا، ئەم مەڵبەندە کەوتە بەر هێرشی جەماوەرو سوتێنرا، (حەمە بۆر)یش تێدا بریندار بوو[٤٨].

هەروەها دانیشتوانی سلێمانی لە ڕۆژانی ڕاپەڕیندا بە نامەیەکی تایبەتی داخوازییەکانیان خستەبەردەم وەزارەتی (ساڵح جەبر) کە بریتی بوو لە (دانی مافە دیموکراسیەکانی گەل، ڕێگادان بە ژیانی حزبایەتی سەربەخۆ، ڕێگەدان بە دانانی سەندیکای کرێکاران، ئازادکردنی بەندە سیاسییەکانی وولات، لابردنی پەیمانی ١٩٣٠). هەروەها نێرەرانی نامەکە بەمجۆرە کۆتاییان پێهێنابوو (دانیشتوانی شارەکەمان دەست لە خەباتی خۆیان هەڵناگرن هەتاوەکو ئەم داخوازییانە جێ بەجێ دەکرێن)[٤٩]. لەبارەی ڕاپەڕینەکانی سلێمانییەوە لۆنگریك دەڵێت:

"ئەو هاوپەیمانییە بەهێزەی ساڵی ١٩٤٨ لە نێوان نەتەوەپەرستان و کۆمونیستانی کوردی سەر بەڕووسدا بەسترا ئاژاوەیەکی بێ کۆتایی لەسەر شەقام و قوتابخانەکانی شاری سلێمانی نایەوە"[٥٠].

لەوە دەچێت لۆنگریك مەبەستی ئەو بەرەنیشتمانییە بێت کە پارتی دیموکراتی کورد وحزبی شیوعی عێراق پێکیان هێنابوو لە نێو (لیژنەی

هاریکاری نیشتمانی) و مەبەستی لەم ئاژاوەیە ئەم لیژنە هاوبەشە بێت کە لە سلێمانی پێکهێنرابوو کەلەپێناو مافەکانی گەل وهاندانی جەماوەر دژی ئیستعمار و نۆکەرانی رۆڵیان دەبینی.

شایەنی باسە ئافرەتانی کوردیش لە شارەکانی کوردستان رۆڵی گەورەو بەرچاویان لە راپەرینەکان گێراوە شان بەشانی براکانیان، لەوانەش سەکینە سلێمان، فەریدە یونس (خوشکی نافیع یونس) کە یەکێك لەووتاربێژەکانی راپەرینەکانی شاری هەولێر بوو[٥١]. هەروەها ئافرەتانی گوندنیشینەکانیش کە بەهۆی ئۆتۆمبێلەکانەوە دەهێنرانە شارەکانی هەولێر و سلێمانی بۆ ئەوەی بەشداری راپەرینەکانی بکەن[٥٢].

شاعیرانی کوردیش لە رۆژانی راپەرینەکاندا بە هۆنراوەکانیان ئاگری تێکۆشانیان لەناوگەلدا خۆش دەکرد، کە بەدەم هۆنراوە شۆرشگێرییەکان و دروشمەکانی دژ بە پەیماننامەی نەگریسی پۆرتسمۆس لە پێشەوەی جەماوەردا بوون، (کامەران موکری) یەکێك لەو شاعیرانە بوو کە لە رۆژانی راپەریندا رۆڵێکی گەورەیان نواند[٥٣]، هەروەها (بێکەس) بە هۆنراوە بەناوبانگەکەی (داری ئازادی) وەرچەرخانێکی مێژوویی بیری نەتەوەیی کوردی دارشت[٥٤]، (پیرەمێرد)یش کە سەر قافڵەی دەستەی شاعیرانی کورد بوو لەراپەرینەکاندا سەبارەت بە رۆڵی ئافرەتانی کورد دەڵێت:

تا ئێستا ڕووی نەداوە لە تاریخی میللەتا
قەڵغانی گوللە سینگی کچان بێ لە هەڵمەتا
پێی ناوێ بۆ شەهیدانی وەتەن شیوەن وگرین
نامرن ئەوانە وا لە دڵی میللەتا ئەژین[٥٥].

شارۆچکەکانی تری کوردستانیش ڕۆڵی نیشتمانیان هیچی کەمتر نەبوو لە ڕۆڵی شارە گەورەکان لە ڕۆژانی ڕاپەڕیندا. لەوانەش شارۆچکەی (کۆیە) چەند خۆپیشاندانێکی بەخۆوە گرت کە لەلایەن جەماوەری شۆڕشگێڕی شارەکە بەڕێوەچوو، گەورەترین خۆپیشاندان و ڕاپەڕینی جەماوەریش لە ڕۆژی ٢٧ی کانوونی دووەم بوو، کە سەرجەم چینە کۆمەڵایەتییەکان و ئاینییەکان و ڕۆشنبیران و کاسبکاران ڕژانە سەر توندوتیژیان ئەنجام نەدا و خۆپیشاندانەکە بەشێوەیەکی هێمنانە بەڕێوەچوو. لەدیارترین ئەو کەسانەی ڕۆڵی بەرچاویان بینی لە ڕاپەڕینەکەدا (نافیع یونس، عونی یوسف، یونس ڕەووف (دڵدار)، عەلی عەبدوڵڵا) کە لیژنەی هاوبەشیان پێکەوەنا بۆ ڕابەرایەتی کردنی خەباتە جەماوەرییەکان[٥٦].

لە گرنگترین ئەو ئەنجامانەی کە لەئاکامی خۆپیشاندانەکانی بەغداو شارەکانی کوردستان و شارەکانی تری عێراق هاتە دی، ڕووخاندنی حکومەتی ساڵح جەبر و پوچەڵکردنەوەی پەیماننامەی (پۆرتسمۆس) و دامەزراندنی حکومەتی (محەمەد صەدر) بوو کە چەند نیشتمانپەروەرێك تێدا بەشداربوون[٥٧].

لە شوباتی ١٩٤٨ شاندی شارو شارۆچکەکانی کوردستان بۆ ڕێزلێنان لــە قوربانیــانی ڕاپەڕینــەکانی شــاری بەغــداد، ســەردانی مەزارگــەی شــەهیدانیان کــرد. نوێنــەرانی هــەولێر وکۆیــە لــە ڕۆژی ١٣ی شــوبات گەیشتنە پایتەخت و بەچەپکە گوڵی وەفادارییەوە سەردانی ڕێوڕەسمی ناشتنی (حوسێن عەلی)یان کرد لە شاری نەجەفی پیرۆز. لە ڕۆژی ٢٦ی شــوبات نوێنــەرانی ســلێمانی و زاخــۆ و ڕانیــەش گەیــشتنە بەغــداد، بەڕێوڕەسمێکی شکۆدار بە شەقامی ڕەشیدا تێپەڕین بەرەو گۆڕستانی (باب المعظم)، هەروەها ئافرەتــانی کــورد بــە چــەپکە گوڵەوە بــە شــوێن بەیداخــەکانی (ســلێمانی و زاخــۆ و ڕانیــە) و لاوانــیش بــە جــل و بــەرگی کــوردی بــە بەیــداخی پرســەوە، دیمــەنێکی وەفادارییــان نوانــد. کــە تاگەیــشتنیان بــە مەزارگــەی شــەهیدان دانیــشتوانی شــاری بەغــداد بــە گەرمییەوەلــە پێشوازیان وەســتابوون. لــە ڕۆژی ٥ی شــوبات پۆســتەی خانــەقین گەیــشت بــەلاوویرەوە بــە چــەپکە گــوڵی وەفــادرای دەســتی ئافرەتانی خانەقین و بەدروشمی (بژی یــەکێتی کــورد و عــەرەب) تاجــە گوڵینەیان لەسەر گۆڕی شەهیدان دانا.

هــەر لــەم ڕیوڕەسمانــەی نوێنــەرانی شاروشارۆچکەکانی کوردســتان، لەکاتی گەیشتنیان بە گۆڕستانی شەهیدان چەندان ووتــار بــۆ ڕێزلێنــانی قوربانیان بــەزمانی کــوردی وعــەرەبی لەلایــەن (محەمــەد ئەحمــەد تــەها، ڕەشید ئەحمەد، عامرە عەلی حەیدەر، سوعاد ئەمین) خوێندرایەوە[٥٨].

شایەنی باسکردنە ئەگەر بلێین گەلە کورد ڕۆڵێکی گەورە و کاریگەری

گێڕا لەسەر ئاستی سیاسی و ئاستی جەماوەری لە ڕاپەڕینەكانی بەغداد و شارەكانی كوردستاندا بۆ ڕووخاندنی حكومەتی سالح جەبرو لە گۆڕانی پەیماننامەی پۆرتسمۆس. شەهیدانی كوردیش بەلگەی ئەوەن كە گەلی كورد جگە لەكێشە ڕەواكەی و بیروباوەڕە نەتەوەییەكەی، ئامادەی فیداكارییە لەپێناوی ڕزگاری ئەو گەلانەی لەگەلیدا دەژیت و ژێر دەستەن وەخاوەن بیروباوەڕێكی نیشتمانپەروەریی گەورەیە. بەم شێوەیە هەوڵەكانی بەعێراقكردنی كورد سەركەوت و جەماوەری كورد لە ئەنجامی ڕۆلی حزبەكان بەتایبەتی حزبی شیوعی عێراق كەوتنە قوربانیدان لەپێناو كێشەكانی عێراق.

---

* ئەم توێژینەوەیە بەشێكە نامەی ماستەری قوتابی (مەهدی محەمەد قادر) كە پێشكەشی ئەنجومەنی كۆلێژی ئەدەبیات لە زانكۆی سەلاحەدین كردووە بۆ بەدەستهێنانی ماستەر لەمێژووی نوێ كورد

## سەرچاوە و پەراوێزەكان:

(1) علاءجاسم محمد الحربي، العلاقات العراقية–البريطانية ١٩٤٥–١٩٥٨، ط١، بغداد، ٢٠٠٢، ص٦٣٢.

(2) موسوعة سرية خاصة بالحزي الشيوعي العراقي السرى، ج١، ص٦–٦١.

(3) المملكة العراقية، محاضر مجلس النواب، الدورة الانتخابية العاشرة، الاجتماع العادى لسنة ١٩٤٥، الجلسة السادسة عشرة، ٢١ كانو الثانى ١٩٤٦، ص١٥٨–١٥٩.

(4) ن.م، الجلسة الثانية، ١٩٤٦/٣/٥، ص١٩٨.

(5) بۆ زیاتر بڕوانە: قيس عبدالحسين الياسرى، الصحافة العراقية و الحركة الوطنية، ص٢٣٣–٢٦٠.

(٦) جعفر عباس حميدي، التطورات السياسية في العراق ١٩٤١-١٩٥٣، ص٤٨٠-٤٨١.

(٧) علاء جاسم محمد الحربي، م.س، ص٦٦-٦٧.

(٨) بۆ زیاتر دەربارەی کارەکانی هەردوو وەزارەتەکە بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج٧، ص٩٠-١٥٧.

(٩) م.ن، ص٢١٨- ٢١٩.

(١٠) عبدالوهاب حميد رشيد، العراق المعاصر، ط١، دمشق، ٢٠٠٢، ص١٠٥.

(١١) عزيز السباهي، عقود من تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، ص٤٠٧.

(١٢) بۆ زیاتر دەربارەی دانوستانەکانی نێوان هەردوو شاندی عێراق و بەریتانیا کە لە بەغداد و لەندەن بەڕێوەچوون بڕوانە: فاروق صالح العمر، المعاهدات العراقية-البريطانية واثرها في السياسة الداخلية ١٩٢٢-١٩٤٨، بغداد، ١٩٧٧، ص٣٩٣-٤٣٢.

(١٣) لە (ساڵح جەبر -سەرۆك، فاچل الجمالي-وەزیری دەرەوە، شاکر الوادی-وەزیری بەرگری، نوری سەعید-سەرۆکی ئەنجومەنی ئەعیان، توفیق سویدی-ئەندامی ئەنجومەنی ئەعیان) پێك هاتبوون. عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات....،ج٧، ص٢٢٣.

(١٤) علاءجاسم محمد الحربي، م.س، ص١١٩.

(*) یەکێکە لە بەندەرەکانی بەریتانیاو دەکەوێتە خوارووی وولاتەکە، دوای کۆتایی هاتنی دانوستانەکان شاندی بەریتانی میوانداری شاندی عێراق لەم بەندەرە کرد بەمەبەستی مۆرکردنی پەیماننامەکە، بۆیە بە پەیماننامەی پۆرتسمۆس ناسراوە.

(١٥) دەربارەی بەندەکانی پەیماننامەکە بڕوانە: عبدالرزاق محمد اسود، موسوعة العراق السياسية، مج٥، ص١٨٦-١٨٧.

(١٦) محمد حمدي الجعفري، بريطانيا و العراق، (حقبة من الصراع ١٩١٤-١٩٥٨) ص١٦٧.

(١٧) المملكة العراقية، محاضر مجلس النواب، الدورة الانتخابية الحادي عشرة،الجلسة التاسعة، ١٩٤٨/١/١٨،ص١٢٥-١٢٦.

(١٨) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ رشید عەبدولقادر، لە ٥تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢؛ جلال الطالباني، كردستان والحركة القومية

الكوردية، ص١٦٥ ؛ محسن محمد المتولي، كرد العراق منذ ١٩١٤-١٩٥٨، ص٢٠٦.

(١٩) حنا بطاطو، العراق الحزب الشيوعي، الكتاب الثاني، ص٢٠٦.

(٢١) سەرەڕای لیژنەی هاریکاری نیشتمانی چەند لیژنەیەکی تر هەر لە ڕۆژانی یەکەمی ڕاپەڕینەکەدا پێك هێنران وەك (لیژنەی قوتابیانی کۆلێژ و پەیمانگاکان) هەروەها لیژنەیەکی تر لەلایەن حزبە ئاشکراکان پێکهێنرا لە (حزبی نیشتمانی دیموکراتی، حزبی سەربەخۆیی، حزبی ئازادیخوازان). بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ڕۆڵی ئەم لیژنانە لە ڕۆژانی ڕاپەڕیندا بڕوانە: خميس حزام والي، وثبة كانون الوطنية في العراق ١٩٤٨، رسالة ماجستير(غيرة منشورة) مقدمة الى كلية القانون والسياسة-جامعة بغداد، ١٩٧٩، ص١٠١-١٠٢ ؛ رحيم عجينة، وثبة كانون معركة ظافرة وصفحة حافلة بالتجارب" الثقافة الجديدة" (مجلة)، عدد٢١، كانوني الثاني ١٩٧١، ص٢١-٢٢.

(٢٢) خميس حزام والي، م.س. ص١٢٤.

(٢٣) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ڕەشید عەبدولقادر لە ٥ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢؛ شعبة التحقيقات الجنائية، موسوعة سرية الخاصة، ج٢، ص٣٩٣.

(٢٤) دەربارەی بەیاننامەکانی ئەم حزبانە بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات..،ج٧، ص٢٤٦-٢٤٨ ؛ محمود القاضي، كانون الثاني شهر الجهاد الوطني، ط١، بغداد، مارت ١٩٤٨، ص٦٦-٧٥، ٨٠-٨٤.

(٢٥) کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٥، ل٢٠٩.

(٢٦) جعفر عباس حميدي، التطورات الساسية...، ص٥٢٢-٥٢٣.

(٢٧) خالد عبدالمنعم العاني، م.س، ص٢٧٩.

(٢٨) محمود القاضي ، م.س، ص٩٣.

(٢٩) محمود شبيب، م.س، ص٩٣.

(٣٠) بۆ زیاتر دەربارەی دەقی بەیاننامەکە بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات...، ج٧، ص٢٥٩-٢٦٠.

(٣١) عبدالجبار عبد مصطفى ، تجربة العمل الجمهوري في العراق، ص٢٢٢ ؛ جعفر عباس الحميدي، التطورات السياسية..، ص٥٢٩-٥٣٠.

(٣٢) کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیك...، بەرگی یەکەم، ل٢٠٩-٢١٢.

(٣٣) لە کاتی گەیشتنیان بۆ سەرگۆڕی شەهیدەکان (محمد مەهدی الجواهیری) هۆنراوەیکی بەسەر شەهیدەکاندا خوێندەوە کە لە بەشێکی دا دەڵێت:

قف باجداث (الضحايا) لاتسل

فوقها دمعا ! ولاتبك ارتجالا

لاتذل عهد (الرجولات) التى

تكره الضعف وتابى الانحلالا

بڕوانە دەقی هۆنراوەکە لە محمود القاضی، م.س، ص١٠٩-١١٢.

(٣٤) دەربارەی ڕاپەرینەکانی ڕۆژانی ٢٤و٢٥ ی کانون بڕوانە: م.ن، ص١١٥-١٢٤؛ جعفر عباس حميدى ، التطورات السياسية...، ص٥٢٥-٥٣٦.

(٣٥) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: موسوعة سرية خاصة،ج١،ص٢٢،٥١،ج٣،ص ٥١٤،٥٨٤،٦١٧ ؛ اسماعيل شكر، اربيل-دراسة تاريخية في دورها الفكرى و السياسى ١٩٣٩-١٩٥٨،ص٢٤٥.

(٣٦) اسماعيل احمد ياغى، تطور الحركة الوطنية العراقية ١٩٤١-١٩٥٢، ص٢٣٢.

(٣٧) محمد حمدى الجعفرى، انقلاب الوصي في العراق ١٩٥٢، ص٦١ ؛ قيس عبدالحسين الياسرى، م.س، ص٢٥٦.

* دواتر بەهۆی ئەم شەڕەوە بە پردی شەهیدان ناسرا.

(٣٨) دەربارەی ڕشووداوەکانی ڕۆژی ٢٧ ی کانون بڕوانە: محمود القاضی ،م.س، ص١١٥-١٤٣؛ محمود شبيب، م.س، ص١٠٩-**١١٢**؛ محمد حمدى الجعفرى، بريطانيا و العراق، ص١٦٧-١٧١.

(٣٩) دەربارەی ناوو ژمارەی شەهیدانی ڕاپەڕینی کانون بڕوانە: الحزب الشيوعى العراقي، شهداء الحزب شهداء الوطن ١٩٣٤-١٩٦٣، ط١، بيروت،٢٠٠١، ص٢١-٣٤.

(٤٠) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك...، بەرگی دووەم، ل٣٨٧-٣٨٨ ؛ جلال الطالبانى، م.س، ص١٦٥ ؛ بهاءالدين نوری، بیرەوەریەکی ڕۆژانی ڕابردوو، "بیری نوێ" (گۆڤار)، (٢٧٦)، ٢٨ /١ /١٩٧٨، ل

(٤١) كمال مظهر احمد، صفحات من تاريخ العراق المعاصر، ط١، بغداد،١٩٨٧،ص١٣٨ ؛ جلال الطالبانى، م.س، ل١٦٥ ؛ محمود شبيب ،م.س، ص١١٤ ؛ محسن محمد المتولى، مم.س، ص٢٩٦.

(٤٢) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ عەزیز محەمەد، لە ٤ی ئەیلولی ٢٠٠٢؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کەریم ئەحمەد، لە ٣٠ی تشرینی دووەمی٢٠٠٢؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ رەشید عەبدولقادر لە٥ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢.

(٤٣) بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی رۆڵی هەولێر لە راپەرینەکانی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ بروانە: اسماعیل شکر، اربیل....،ص٢٤٣-٢٥٠.

(٤٤) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ عەزیز محەمەد، لە ٤ی ئەیلولی ٢٠٠٢؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ رەقیب حوسێن مەلا، لە٦ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ حەیدەر عوسمان، لە ٢٧ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢.

(٤٥) اسماعیل شکر، اربیل....، ص٢٤٧.

(٤٦) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ محەمەد عومەر دەربەندی، لە٨ی ئاداری ٢٠٠٢ ، لەساڵی ١٩٣٥ لەدایك بووە، لەساڵەکانی پەنجاکان پەیوەندی بە حزبی شیوعی عێراق کردووە، بەشداری خۆپیشاندانەکانی کانوون و تشرینی ١٩٥٢ه کردووە، ئێستا لە هەولێر دادەنیشت. کەمال مەزهەر، چەند لاپەرەیەك....، بەرگی یەکەم، ل٢١٣.

(٤٧) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بەهادین نوری، لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ غفوری میرزا کەریم، لە٢٤ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ عیزەالدین مستەفا رەسوڵ، لە٢٢ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢.

(٤٨) بهاء الدین نوری، مذکرات، ص٤٥ ؛ محمود شبیب، م.س، ص١١٥.

(٤٩) کەمال مەزهەر، چەند لاپەرەیەك..، بەرگی دووەم، ل٢٩٢.

(٥٠) وەرگیراوە لە هس، هـ.ل.

(٥١) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ عەزیز محەمەد، لە٤ی ئەیلولی ٢٠٠٢ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ حەیدەر عوسمان، لە٢٧ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ عەلی جوکل، لە٢٧ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بلال عەزیز، لە١٧ی ئابی ٢٠٠٢.

(٥٢) موسوعة سریة خاصة، ج١، ص٢١٣.

(٥٣) غفور میرزا کریم، لەیادی چلەی کۆچ کردنی کامەرانی شاعیردا، "هاوکاری" (رۆژنامە)، ژ(٨٧٦، ١٩٨٧/١/٢٩.

(٥٤) لەبەشێکی هۆنراوەکەدا دەڵێت:

داری ئـازادی بـە خـوێن ئاونـەدرێ قـەد بەرناگرێ سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ

بڕوانـە : دەقـی هۆنراوەکـە لـە: دیـوانی بێکەس، ڕێکخستنی محەمەدی مەلا کەریم، بەغد، ١٩٨٦، ل٨٢-٨٣.

(٥٥) ڕاپەڕینەکـەی کـانوون و شـاعیرانی کـورد، "بـیری نـوێ"(گۆڤـار)، ژ٣٧٧، ١٩٧٨/٢/٤، ل٨.

(٥٦) چاوپێکەوتنێک لەگەڵ کەریم ئەحمەد، لـە٣٠ی تشرینی دووەمـی ٢٠٠٢ ؛ مـسعود محمـد، گەشـتی ژیـانم، چـاپی یەکـەم، ستوکۆلهم، ١٩٩٢، ل٢٧٧-٢٧٨.

(٥٧) دەربارەی پێکهاتەکەی وەزارەتەکەی محەمەد سەدر بڕوانە: عبدالرزاق الحسنی، تاریخ الوزارت...،ج٧، ص٢٨٢.

(٥٨) دەربـارەی ڕێـوڕەسمی نوێنـەری شاروشارۆچکەکانی کوردستان بەدرێـژی بڕوانـــە: پۆســـتەی کـــوردەواری، "گەلاوێـژ"(گۆڤـار)، ژ٣ سـاڵ ٩، مـارتی ١٩٤٨، ل١٢-٢٣.

# دۆزینەوەی وێنەی سەربەرد لە کوردستان*

دلشاد عزیز زاموا**

**سەرەتایەک:**

ئەگەرییێت و باس لە مێژووی هونەری وێنەکێشانی مرۆڤ بکەین، ئەوا دەبینین ئەم هونەرە هەر لە کۆتایی چاخی بەردینی کۆنەوە دەست پێدەکات (٢٥٠٠٠پ.ز)، کاتێك کە مرۆڤەکان لەناو ئەشکەوتەکاندا دەژیان لە سەر دیوارەکانی ناوەوەی ئەشکەوتەکان وێنەی جۆرەها ئاژەڵیان دەکێشا، یان وێنەی خۆیان دەکێشا لە کاتی ڕاوکردندا بە ڕم و تیر. ئەم وێنانە بۆ مەبەستێکی سیحری بوون بۆ ئەوەی مرۆڤ بەسەر ئەو جۆرە ئاژەڵانەدا زاڵبێت کە وێنەی دەکێشان، چونکە بنەمایەکی سیحری هەیە دەڵێت زاڵبوون بەسەر وێنەی شتێکدا دەتگەیەنێتە زاڵبوون بەسەر ئەو شتەدا لەبەر ئەم مەبەستە بوو مرۆڤەکان لە ئەشکەوتەکاندا وێنەیان دەکێشا لەکاتی ڕاوکردندا، بە شێوەیەك کە تیر یان ڕمەکە وێنە دەکێشرا، کە بەرجەستەی ئاژەڵەکە دەکەوت وخوێنی لێدەهات ئەم جۆرە وێنانە تائێستا لە ئەشکەوتەکانی کوردستان(کوردستانی باشور)نەدۆزراونەتەوە، بەلام لەزۆرێك لە ئەشکەوتەکانی ئەوروپا بەتایبەت فەرەنسا و ئیسپانیا و ئەشکەوتەکانی

ڕۆژهـەلأتی ناوەڕاسـت ئـەم وێنانـە دۆزرانـەوە، بـەو هیوایـەی کـە لـە ئەشکەوتەکانی لـە کوردستاندا ئـەم وێنانـە بدۆزرێنـەوە، ئەگـەر تیمێك لـە شوێنەوارناسەکانی کوردستان لێکۆڵینەوە لە ئەشکەوتەکاندا بکـەن و بـەدوای ئم جۆرە وێنانەدا بگەڕێن .

پـاش ئـەوەی مـرۆڤ ئەشـکەوتەکانی بەجێهێشت و ڕووی کـردە دامێنی شاخەکان و سەر ڕووبارەکان و نشینگەی کاتی(المستوطنات الوقتیة) بۆ خۆی دروستکرد لـە چـاخی بـەردینی ناوەڕاستدا (١٥٠٠٠-١٠٠٠٠پ.ن) لـەم کاتـەدا مرۆڤەکان جۆرێك لە هونەر وێنەکێشانیان داهێنا کە شوێنەوارناسـەکان پێـی دەڵێن( PETROGLYPHS)یان (ROCK PICTURE) واتـە وێنەی بەردی یان وێنـەی سـەربەرد ،کە ئـەم وێنانـە بـەزۆری لەسـەر بـەردی گەورە دەکرێت، ئەم جۆرە وێنانە لەزۆربەی ناوچەکانی ڕۆژهەلات دۆزرانـەوە، بەتایبـەت لـە م سـالأنەی دواییـدا کـە لـە کوردسـتانی بـاکوور لـە ناوچـەی شـاخەکانی وان، هـەروەها لـە کوردسـتانی ڕۆژهـەلأت لـەم جـۆرە وێنانـە دۆزرانەوە. بـەلأم لـە کوردسـتاندا(کوردسـتانی باشوری) تـا ئێـستا بـاس لـە دۆزینـەوەی ئـەم جـۆرە وێنانـە نـەکراوە، تـا ئێـستا ئـەم جـۆرە وێنانـە نەدۆزراونەتـەوە و هـیچ لێکۆڵینەوەیـەك لـەبارەی ئـەم جـۆرە هونـەرەوە بلأونەکراوەتەوە.

**دۆزینەوەی وێنەی سەر بەرد لە کوردستان:**

دۆزینـەوەی وێنـەی سەربەرد لـە گونـدی قـەلأتووکان دادەنرێت بـە یەکـەم دۆزینـەوەی لـەو جـۆرە لـە کوردسـتاندا شـایەنی باسـە کـە تیمێـك لـە بەڕێوبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی سەردانی ئەم شوێنەوارەیان کرد لە ساڵی

١٩٩٨دا، بەڵام هیچ نووسینێك و لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی ئەم شوێنەوارە نەكراوە، هیچ زانیارییەك دەربارەی بڵاونەكراوەتەوە تا ئێستا، كە ببێتە هۆی ناساندنی ئەم شوێنەوارە بەخەڵكی و بەتایبەت بە شوێنەوارناسان و پسپۆڕان لەو بوارەدا. وە بڕیارماندا كە سەردانی قەڵاتووكان بكەین لە كاتێكی گونجاودا، تا لە ڕۆژی ١٦ ئەیلولی ٢٠٠٥ دا توانیم لەگەڵ تیمێك لەبەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی كە بۆ كاری تایبەتی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار ڕوویان كردە ناوچەكە لە نزیكەوە ئەم شوێنەوارە گرنگە ببینم و لێكۆڵینەوەی لە سەر بكەم و وێنەی بگرین.

## شوێنی قەڵاتووكان:

قەڵاتووكان (ناوی قەڵاتووكان لە قەڵای تووان یان قەڵای توركان وە هاتووە بەپێی ووتەی خەڵكی گوندەكە قەڵایەك لەنزیك گوندەكە هەیە، بەڵام بە پێی ڕای هەندێك قەڵاتووكان بەواتای قەڵای بچووك دێت) گوندێكە دەكەوێتە باكوری ڕۆژهەڵاتی سەنگەسەر، لە ڕانیەوە نزیكەی ٣٠كم دوورە، ئەم ناوچەیە سەربە پارێزگای سلێمانیە، ڕۆیشتن بۆ گوندی قەڵاتووكان لە ڕێگای سەنگەسەرەوە دەبێت، لە دووری ٣كم لەباكوری سەنگەسەر ڕێگایەكی گڵ لە ڕێگا قیرتاو كراوە سەرەكیەكە جیادەبێتەوە بەلای ڕاستدا، ئەم ڕێگا گڵە دەگاتە قەڵاتووكان، ڕێگاكە زۆر سەختە بۆ سەیارەی بچووك نابێت، لەلای ڕاستی ڕێگاكەوە پاشماوەی چەمێك دیاربوو كە ووشكی كردبوو ، كە ئەم چەمە لە بەهاراندا ئاوەكەی زیاد دەكات تا ناوەڕاستی هاوین ئاوی پێدادێت سەرچاوەكەی لەكانیەكانی دەوروپشتی گوندی قەڵاتووكانەوە دەست پێدەكات. بە نزیكبوونەوە لەقەڵاتووكان ڕێگاكە سەختتر دەبێت، لە

ڕانیەوە بەنزیکەی ٩٠ دەقیقە گەیشتینە قەلاتووکان بەسەیارە لەبەر سەختی ڕێگاکە. دوای گەیشتنە گوندی قەلاتووکان کە لە بناری شاخێکی سەختە(شاخی کورش)لە دووری زیاتر لە ١کم لە باکوری ڕۆژهەلاتی گوندەکە تادەگەیتە شوێنی مەبەست.(نەخشەی١).

## وەسفی وێنەگان:

وێنەکان لە سەربەردێکی گەورە کێشراون، بەردەکە لە جۆری (limestone)ە، و شێوە چوارلایە و لە ناوەڕاستدا شەق بووە بۆ دوو بەش، کە پێدەچێت بەهۆی دابەزینی گۆڕانی بەردەوامی پلەی گەرما و بەفری زۆرەوە ئەم بەردە توشی شەقبوون بووبێت. بەهۆی کشان و چوونەوەیەکی بەردەوام و لەلای خەڵکی ناوچەکە بە(بەردە قلّشیو)ناو دەبرێت.

ئەم بەردە بەرزییەکەی نزیکەی ( ٢٧٠ سم )و پانییەکەی نزیکەی ( ٢٤٠سم ) دەبێت، زۆربەی وێنەکان لەلای ڕۆژهەلات لەسەر ڕووی بەردەکە کێشراون(بڕوانە شێوەی١) ڕووی بەردەکە ڕەنگی قاوەییەکی کاڵە و کلسی دەرکردووە و داخورانێکی زۆری پێوەدیارە، وێنەکان دروستکراون لەسەر بەردەکە لە ڕێگای بەکارهێنانی بەردی خڕ بۆ شکاندنی کلسەکەی سەر ڕووی بەردەکە تا وێنەکان بەڕەنگی تەباشیری دەربچن. وە هەندێك جار بەردێکی تیژ بەکارهاتووە بۆ هەڵکەندنی(نحت الغائر) وێنەکان بەقوڵکردنی سەر ڕووی بەردەکە بەهەڵکەندنی چاڵی بازنەیی بچوك لەلای یەکەوە، پاشان گەیاندنی بازنەکان بەیەك ودروستبوونی وێنەیەکی دیاریکراو، وە وێنەکان دابەشکراون بە چەند بەشێکەوە کە بە چەند هێڵێکی سروشتی لە یەك جیادەکرێنەوە.( بڕوانە شێوەی٢).

**بەشی یەکەم:** لەوێنەکان، کە لەرووی ڕۆژهەلاتی بەردەکە هەڵکەندراون لەلای ڕاستەوە، وێنەکان لەرووبەرێکی چوارگۆشەییدان کە درێژی لایەکی نزیکەی(١١٠سم) دەبێت (شێوەی ١). وێنەکانی ئەم بەشە چەند مرۆڤێکمان نیشان دەدات بەقەبارەی جیاواز وجوڵەی جیاواز. لەلای ڕاستەوە لەبەشی سەرەوە وێنەی کەسێك کراوە(ناوی دەنێین A) کە لەمرۆڤەکانی تر گەورەترە(نزیکەی ٢١سم بەرزە) رووی کردۆتە باشوور و لەحاڵەتی جوڵەدایە بەرەو (C)، وە تەنها نیوەی لاشەی دیارە و نیوەی خوارەوەی سڕاوەتەوە، هەردوو باڵی کراوەتەوە و دەستی ڕاستی بەرزکردۆتەوە. پێدەچێت ئەم وێنەیە لە وێنەکانی تر کۆنتربێت.( بڕوانە شێوەی٢) لە ژێرباڵی چەپی ئەم کەسەدا وێنەی کەسێك دیارە(ناوی دەنێینB) کە بەبچوکی کراوە( باڵای نزیکەی ١٠سم بەرزە) و زۆر گرنگی بەلاشەی نەدراوە و دەستەکانی خستۆتەسەر ناوقەدی و کە بووەتە هۆی دروستبوونی دوو بازنەی داخراو، لە بەردەمی کەسی یەکەمدا (A ) شتێك دیارە بنکەکەی نارێکە لەشێوەی لولپێچ دا بەرزبۆتەوە (ناوی دەنێین C) نزیکەی (٢٥ سم بەرزە)، بەڵام روون نییە کە ئەمە وێنەی ئاژەڵە یان وێنەی درەخت یان ئاگر یان هەر هێمایەکی تر. بەڵام لەلای چەپ بەرامبەر( AوBوC) وێنەی دوو کەس دیارە کەسی یەکەمیان (لەلای ڕاستەوە) بە بچوکی کراوە(١٠سم بەرزە)زۆر روون نییە (ناوی دەنێین D). لەلای چەپی(D)یەوە وێنەی کەسێك دیارە (ناوی دەنێین E) کە لەحاڵەتی جوڵەدایە و باڵەکانی کردۆتەوە و قاچەکانی دیارن، کە لە حاڵەتی ڕۆیشتن دایە(نزیکەی ٢٠سم بەرزە). لە ڕیزی دووەمدا لەلای ڕاست وێنەی کەسێك دیارە کە لەهەموو وێنەکان روونتر و تەواوترە(ناوی دەنێین F) کە

کەسێکمان نیشاندەدات لە حاڵەتی سەرکەوتن دایە، و قاچی چەپی بەرز کردۆتەوە و ئەژنۆی نوشتاندۆتەوە و باڵەکانی کردۆتەوە بەگۆشەی (١٨٠)پلە، و دەستی ڕاستی بەرزکردوتەوە(نزیکەی ٢٠سم بەرزە). بەلام لە ریزی سێیەمدا لەلای ڕاستەوە وێنەیەك دیارە(ناوی دەنێین G) کە لەوێنەی مرۆڤێك دەچێت بە هەلگەڕاوەیی ( یا بە مردوویی؟) (٢٠سم بەرزە). لە ناوەڕاستدا چەند وێنەیەکی سڕاوە دەردەکەوێت، بەلام زۆر ڕوون نین، یەکێك لەو وێنانە، وێنەی مرۆڤێکە(ناوی دەنێین H ) کە بەناڕێکی و بچوکی کراوە (نزیکەی ١٠سم بەرزە). لەلای چەپ وێنەی کەسێك دیارە(ناوی دەنێین I)کە لەحاڵەتی جوڵەدایە و باڵەکانی کردۆتەوە وئەژنۆی ڕاستی بەرزکردۆتەوە کە بەلگەی سەرکەوتنە بەسەر شوێنێکی بەرزدا و(نزیکەی ٢٥سم بەرزە) .

**بەشی دووەم:** لەدووری تەنها یەك مەتر لەلای چەپەوە وێنەکانی بەشی یەکەم، وێنەکانی بەشی دووەم دەستپێدەکات کە چەند وێنەیەکی ڕوون و دیارن وە لەڕووی ڕێگەی هەلکەندن و جۆری وێنەکانەوە لە وێنەکانی بەشی یەکەم جیاوازن ئەم وێنانە هەلکەندراون(نحت الغائر) لەسەر ڕووی بەردەکە، وێنەی یەکەم هی مرۆڤێکە(ناوی دەنێین J )کە لەحاڵەتی جوڵەدایە و باڵەکانی کردۆتەوە (بەرزیەکەی ١٠سم دەبێت) ، بەلام وێنەی دووەم (ناوی دەنێین k ) بریتییە لەشێوە بازنەییەکی ناڕێك و لەناوەڕاستیدا بازنەیەکی بچوك هەلکەندراوە،(درێژیەکەی ١٠سم و پانیەکەی ٥سم دەبێت) (بڕوانە شێوەی٤)، بەلام وێنەی سێیەم وێنەی ئاژەڵێکە لەفیل دەچێت؟(ناوی دەنێین L ) کە لەسەر ڕووی بەردەکە بەقوڵی هەلکەندراوە( ١٠ سم بەرزە) (بڕوانە شێوەی٦) وە ئەگەر ئەمە وێنەی فیل بێت؟ ئەوا بەلگەی ئەوەیە کە

لە چاخی بەردیندا فیل لە کوردستان ژیاوە . لە دووری ٢٠سم لە وێنەی( L ) وە وێنـەی سـێ بازنـەی قـوڵ هەڵکەنـدراوە (نـاوی دەنـێین M) بازنـەکان دووانیان لەسەرەوە و دانەیەکیان لەخوارەوە (شێوەی دەم و دووچاو دەدات) (بڕوانە شێوەی٦) شایەنی باسە ئـەم جۆرە چاڵانە لەسـەر چـەند شـوێنێکی جیاوازی سەر ڕووی بەردەکە هەیە، کە یـەکێکیان لەحـەوت چاڵ پێکهاتووە کە لەسەر ڕووی سەرەوەی بەردەکە هەڵکەندراوە. پێدەچێت مانای فەلـەکی (Astronomical symbols) تایبـەتی خـۆی هـەبێت و دەربـارەی ئەستێرەکان بێت.

## چەند تێبینیەکی گرنگ لەسەر وێنەکان:

١- وێنەی قەڵاتووکان بە دوو ڕێگا کێشراون:

ا- بەشـی یەکـەمی وێنـەکان(B،A ،C،D،E،F،G،H،I) لەڕێگـەی پیاکێشانی بـەردێکی خڕ بـەڕووی بەردەکـەدا وێنەدەکێشران، بۆ ئەمـەش سوود لەو بەکلسبوونەی ڕووی بەردەکە وەردەگیرا، چونکە بەپیاکێشان بە ڕووی بەردەکەدا بە ڕێگایـەکی دیاریکراو دەبێتـە هـۆی دەرکـەوتنی وێنـەکان بەڕەنگێکی تەباشیری سپی، لە ڕێگای قرنجاندنی ڕووی بەردەکە.

ب- وێنەکانی بەشی دووەم بـە دوو ڕێگـا کێشراون: یەکـەمیان لـەڕێگای هەڵکەندنی ڕووی بەردەکە(**نحت السطح**) لەڕێی پیاکێشان بەهۆی چەکوشێکی بــەردین بەگۆشــەیەکی دیــاریکراو، بــەڵام دووەمیــان ڕێگەیــەکی تێکــەڵ بەکارهاتووە لەنێوان ڕوشاندن و پیاکێشان (التحزیز و الضرب) کە دەتوانرێت بەم ڕێگایە بووترێت ڕێگەی سێیەم.

٢- زۆربەی وێنەکان وێنەی مرۆڤن، کە ئەمەش وێنە بەردییەکانی قەڵاتووکان جیادەکاتەوە لە وێنە بەردییەکانی ناوچەکانی دیکەی جیهان. و دەبێتە دیاردەیەکی دەگمەن، چونکە لەم وێنانەدا ئاژەڵ بەدەگمەن دەردەکەوێت، بەڵام لەوێنە بەردییەکانی ناوچەکانی دیکەی جیهان مرۆڤ وئاژەڵ پێکەوە دەردەکەون بەتایبەتی لەکاتی ڕاوکردندا.

٣- ڕەگەزی نێر و مێ جیانەکراوەتەوە لە وێنەکاندا واتە: نازانرێت کامە پیاوە وکامەیان ژن، کە ئەم جیاکردنەوەیە لە هەندێك لە وێنە بەردییەکانی جیهاندا دەبینرێت.

٤- مرۆڤەکان بەشێوەیەك کێشراون وەك ئەوەی لە حاڵەتی وەرزش کردندابن، هەروەك دەبینین زۆربەیان باڵەکانیان کردۆتەوە بەگۆشەی ١٨٠پلە، هەروەها زۆربەیان قاچی ڕاست یان چەپیان بەرزکردۆتەوەو ئەژنۆیان نوشتاندۆتەوە، وەك ئەوەی لە حاڵەتی سەرکەوتندابن کە ئەمەش دەلالەت لە واقعی ژیانی ڕۆژانەیان دەکات کە لەو ناوچە شاخاویە سەختەدا ژیاون.

٥- وێنەی مرۆڤەکان بە قەبارەی جیاواز کێشراون، هەندێکیان قەبارەی بچوك و هەندێکیان گەورە.

٦- وێنەکان زۆر بەسادەیی کێشراون یان هڵکەندراون، وەك وێنە کێشانی منداڵ وایە، ئەمەش بەڵگەیەکە، کە دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە ئەم وێنانە بۆ چاخەبەردینەکان دەگەڕێنەوە، و وێنەکان مرۆڤە وێنەکێشەکانی چاخی بەردین کێشاویانە وهەڵیان کەندووە.

٧- وێنەکان هەندێکیان بە ڕوونی دیارنین، کە ئەمەش بۆ داخوران و گۆڕانی بەرز و نزمی پلەی گەرما و جۆری بەردەکە دەگەڕێتەوە.

٨- لە بەشی یەکەمی وێنەکان وادەردەکەوێت، کە هەندێك لەوێنەکان هەر لەو سەردەمەدا سڕابنەوە و وێنەی دیکەیان لەسەر کێشرابێت. کە ئەم حاڵەتە لە زۆربەی وێنە بەردییەکانی جیهان و وێنەی ئەشکەوتەکاندا هەیە.

## وێنە بەردییەکانی قەڵاتووکان باس لەچی دەکەن؟

ئەگەر بەوردی بڕوانینە وێنەکان ئەوا بەشێوەیەکی گشتی لە وێنەکانی بەشی یەکەمدا دەبینین کە هەموو مرۆڤەکان لە حاڵەتی جووڵەدان، ئایا ئەم جووڵەیە حاڵەتی ڕاوکردنە یان هەڵپەڕکێیەکی سیحری (رقص سحري) نیشاندەدات؟.

بێگومان کە ئەم وێنانە باس لەڕاوکردن ناکەن چونکە ئاژەڵ نابینین، هەروەها مرۆڤەکان تیروکەوان و ڕمیان پێنییە لە وێنەکاندا، بەلام ئەگەر بێت وئەم جوڵەیە هەڵپەڕکێ بێت ئەوا مەبەست لەم هەڵپەڕینە چی بووە؟ ئایا دوای گەڕانەوە بووە لە ڕاوکردن و دەستکەوتنی نێچیرێکی باش؟ یان ئەگەر وامان دانا کە وێنەی(C) ئاگربێت ومرۆڤەکانی(A، B، D، E، F، G، H، I) بەدەوریدا هەڵپەڕیون ؟ ناتوانین هیچ کام لەم گریمانانە بسەلمێنین. بەلام دەتوانین بڵێین کە وێنەکانی بەشی دووەم ( J، K، L، M ) بۆ سەردەمێکی کۆنتر دەگەڕێتەوە چونکە ئەم شێوازە هەڵکەندنە لە چاخی بەردینی کۆندا هەیە( ٣٠٠٠٠ ساڵ پ.ز) لە زۆربەی ناوچەکانی جیهان بەتایبەت لە هەندێك لە ئەشکەوتەکانی ئەوروپا ئەم شێوازە هەڵکەندنە دەبینرێت.

ئایا وێنەی (K) کە وێنەی بازنەیی ناڕێکە وبازنەیەکی لەناودایە چی دەگەیەنێت؟ پێدەچێت ئەمە وێنەی ئەو شوێنەبێت کە تێیدا ژیاون خێوەتگەی کاتی (مخیم وقتی)، بەڵام ئەگەر ئەمە وادەرنەچوو ئەوا لەوانەیە ئەم شێوە بازنەییە وێنەی تەڵەیەکی ڕاوبێت بۆ ئەو ئاژەڵەی کە لەنزیکیەوە وێنەی کێشراوە و کە لەفیل دەچێت(L).

بەڵام هەر وەك لە خاڵی(٨)دا ئاماژەمان پێکرد کە هەندێك لە وێنەکان لەو سەردەمەدا سڕاونەتەوە دوای تەواو بوونی ڕێوڕەسمە سیحرییەکە. کە وێنەکان بۆ ئەو مەبەستە دروستدەکران.

هەروەها دەبێت ئەوەمان لە بیر نەچێت کە مرۆڤی چاخی بەردینی کۆن و ناوەڕاست جۆرێکی تایبەت لە پەرستگایان هەبووە، کە لە شوێنێکی کراوەدا بووە (معابد العراء ) واتە: لە ناو ئەشکەوت و شوێنی دروست کراودا نەبوو. لەو شوێنەدا وێنەیان لەسەر بەردەکان دەکێشا و کۆمەڵە بەردێکیان بە جۆرێکی تایبەت دادەنا، و ڕێوڕەسمە ئاینی و سیحرییەکانی خۆیان لە دەوری ئەو بەردانە ئەنجام دەدا. جا لەبەرئەوە گومانمان وایە کە شوێنی وێنەی سەربەردەکانی قەڵاتووکان جۆرە پەرستگایەك بوو بێت(المعبد العراء).

**دیاری کردنی سەردەمی وێنەبەردییەکانی قەڵاتووکان:**

پێش ئەوەی باسی دیاریکردنی سەردەمی ئەم وێنانە بکەم، پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە هەندێك جار خەڵکانێك بۆ شێواندنی مێژوو و شوێنەوار و سەرلێشێواندنی شوێنەوارناسان لەم سەردەمەدا هەڵدەستن بە دروست کردنی ئەم جۆرەوێنانە. بەڵام شوێنەوارناسان بەئاسانی دەتوانن ئەو جۆرە وێنە ساختانە دیاریبکەن و لە وێنەکۆنەکان جیای بکەنەوە. لەبەرئەوە کاتێك

کە چووم بۆ قـەڵاتووکان لەخـەڵکی گوندەکـەم پرسـی کـەی ئـەم وێنانـەتان دۆزییەوە؟ ئەوان باسیان لەوەکرد کە زیاتر لەسەد ساڵ دەبێت کە ئەم وێنانە لەلایەن خەڵکی گوندەکەوە بینراوە. دوای بیستنی ئـەم وەڵامـە گومـانم ئـەما لەوەی کـە ئـەم وێنانـە بـۆ سـەردەمە کۆنـەکان دەگەڕێتـەوە. بەتایبـەت کـە ناوچەکە سەختە و ژمارەیەکی کەم خەڵك لێی دەژی. وە دوای بـەراوردکردنی وێنـــەکان بـــەو وێنانـــەی لەناوچـــە جیاوازەکـــانی جیهـــان دۆزراونەتـــەوە ودەگەڕێنەوە بۆ چاخە بەردینەکان، بۆم دەرکەوت کەوێنەکان دەگەڕێنەوە بۆ سـەردەمی چـاخەبەردینەکان. ئەمـە شـتێکی ئاسـاییە کـە مرۆڤـی چـاخە بەردینەکان لەم ناوچەیە ژیابێت چونکە لە دەوروبەری ئەم ناوچەیە لـە چـەند ئەشـکەوتێکی ناوچـەی ڕەوانـدوز شـوێنەواری مرۆڤـی چـاخەبەردینەکان دۆزراونەتەوە. هەروەها لە ئەشکەوتی کاوانیـان لـەنزیك شـەقڵاوە و لـە نزیـك ڕانیە لەگردی شمشارە و باسمۆسیان شوێنەواری چاخی بـەریینی نـوێی پـێش گۆزەکـاری(PRE-POTTERY NEOLITHIC) دۆزرایـەوە، کـە بۆ(٨٠٠٠ساڵ پ.ز) دەگەڕێتەوە.کە ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو مرۆڤانەی لـە قەڵاتووکان و لە ناوچەکەدا لە کۆتایی چاخی بەردینی کۆن و چاخی بـەردینی ناوەڕاستدا ژیـاون، لـە چاخی بـەردینی نوێدا ڕوویـان کردۆتـە دەشـتەکان و لەسەر ڕووبارەکان لەناوچەی ڕانیە و ناوچەکانی تر ژیاون.

دیاریکردنی مێژووی وێنـەکانی قـەڵاتووکان کاتێك بەشێوەیەکی تـەواو و ڕاست دەبێت، کە ئێمە لەو شوێنەی وێنـەکانی لێکێشراوە بـەرد و کەلوپـەلی چاخی بـەردین بدۆزینـەوە، یـان لـە نزیـك ئـەو ناوچـەیە. بـەڵام دەتـوانین وا دابنێین کە وێنەکانی قەڵاتووکان بـۆ کۆتـایی چـاخی بـەردینی کـۆن و چـاخی

بەردینی ناوەڕاست دەگەڕێنەوە لەڕێگەی بەراوردکردنەوە لەگەڵ ئەو وێنانەی کە بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە و لە ناوچەکانی دیکەی جیهان دۆزراونەتەوە، بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین تەمەنی ئەم وێنانە دیاری بکەین لە نێوان (١٥٠٠٠-٩٠٠٠پ.ز) واتە چاخی بەردینی ناوەڕاست.

لەکۆتاییدا، دەڵێین ئەم وێنانە یەکەم وێنەن کە دەدۆزرێنەوە لەکوردستاندان بەڵام کۆتا وێنەنین، لەخەڵکی ناوچەکەم بیستووە کە لەو ناوچەیەدا چەند وێنەیەکی لەو جۆرەیان بینیوە کە ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە ناوچەی شاخەکانی قەندیل و ڕانیە دەوڵەمەندە بەم جۆرە وێنانە، ئەگەر لەداهاتوودا توانرا ژمارەیەك لە و وێنە بەردییانە بدۆزرێتەوە، ئەوا لقێك لە زانستی شوێنەوارناسی کوردستان زیاد دەکات، کە ئەویش زانستی شوێنەواری وێنەی سەربەردەکانە.

---

(*) ناونیشانی ئینگلیزی ئەم توێژینەوەیە بەم شێوەیە دەبێت:
-FIND ROCK PICTURES (PETROGLYPHS) IN KURDISTAN

(**) قوتابی ماستەر لە بەشی ئارکیۆلۆجی لە کۆلیژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەدین.

## پاشکۆی وێنەکان:



شێوەی (١) وێنـەکانی بەشی یەکەم (A،B ،C ،D ،E،F ، G ،H،I) ڕووی بەردەکە بە ناو تەڕکراوە تا وێنەکە بەباشی دەربکەوێت.



شـــێوەی(٢) ڕووی ڕۆژهـــەڵاتی بەردەکە، کە وێنەکانی بەشی دووەم و یەکەم دەردەکەوێت.



شێوەی(٣) ڕەسمی وێنەکانی بەشی یەکەم (A،B ،C ،D ،E،F ، G ،H،I).



شێوەی (٤) بازنەیەکی ناڕێك هەیە کە لە ناوەڕاستیدا بازنەیەکی بچوك هەیە



شێوەی(٥) وێنەی ئاژەڵێك کەلە فیل دەچێت لەناوەڕاستدا وێنەی کراوە و لە لای ڕاستەوە بازنەییەك دیارە.



شێوەی(٦) چەند چاڵێك كە پێدەچێت پاشماوەی ڕووەك یان ئاژەڵ بێت كە لە چاخە جیولۆجیەكاندا دروست بووە و ئێستا نەماوە.



شێوەی(٧) مرۆیەك وێنەكراوە لە بەشی دووەم.




نەخشەی ژمارە

(١) نەخشەی شوێنی قەلاّتووکان و شوێنەوارەکانی چاخی بەردین لەکوردستان نیشان دەدات، تێبینی: شوێنەکان بە شێوەیەکی نزیکەیی دانراون و ئەم نەخشەیە تەنها بۆ ڕوونکردنەوەیە.

(نەخشەی ژمارە ١ )ئەم نەخشەیە شوێنی قەلاّتووکان و شوێنەوارەکانی چاخە بەردینیەکان لە کوردستاندا نیشان دەدات. هەروەها ئاماژەکراوە بۆ شارو ناوچەکانی ئێستا بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە.

تێبینی:شوێنەکان بە شێوەیەکی نزیکەیی دانراون

١- قەلاّتووکان شوێنی وێنەکان(کۆتایی چاخی بەردینی کۆن و چاخی بەردینی ناوەڕاست).

٢- ناحیەی سەنگەسەر.

٣- شارۆچکەی ڕانیە.

٤- گوندی شمشارە(چاخی بەردینی نوێ هەزارەی هەشتەمی پ.ن).

٥- شارۆچکەی قەلاّدزێ.

٦- ئەشکەوتی زەرزی چاخی بەردینی ناوەڕاست(نزیکەی پانزە هەزار پێش ئێستا).

٧- ئەشکەوتی پاڵەگەورە(چاخی بەردینی ناوەڕاست).

٨- ئەشکەوتی حاجیاوا، کۆتایی چاخی بەردینی نوێ و چاخی کانزایی(هەزارەی شەشەمی پ.ز).

٩- ئەشکەوتی هەزارمێرد، چاخی بەردینی کۆن و نوێ(نزیکەی چل هەزار ساڵ پ.ز).

١٠- گوندی چەرموو، چاخی بەردینی نوێ(هەزارەی حەوتەمی پ.ز).

١١- بەردە بەلەکا، سەرەتای چاخی بەردینی کۆن(شوێنی کەلوپەلی بەردین دروستکردن((work shop)) کە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی هەشتا هەزار ساڵ پێش ئێستا).

١٢- شەقلاوە.

١٣- ئەشکەوتی کاوانیان(چاخی بەردینی ناوەڕاست).

١٤- قەڵای هەولێر(هەزارەی پێنجەمی پێش زایین).

١٥- ئەشکەوتی هاودیان(چاخی بەردینی ناوەڕاست).

١٦- ئەشکەوتی بەستون.

١٧- ئەشکەوتی شانەدەر، چل و پێنج هەزارساڵ پێش ئێستا تا هەزارەی نۆیەمی پێش زایین(چاخی بەردینی کۆن و ناوەڕاست و نوێ).

١٨- نشینگەی زاوی چەمی، (هەزارەی دەیەم و نۆیەمی پێش زایین).

١٩- دهۆك.

٢٠- گوندی ئەمریك، سەرەتای چاخی بەردینی نوێ(هەزارەی نۆیەم پێش زایین).

زۆری ژمارەی شوێنەوار دۆزراوەکانی چاخی بەردین لە کوردستاندان، ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێت، لەمەودوا ئێمەی شوێنەوارناس بە دوای گرنگترین

پاشماوەکانی ئەم مرۆڤانەدا بگەڕێین، بەتایبەتی وێنەی سەر دیواری ئەشکەوتەکان و بەردەکان کە بیروباوەڕی ئەو مرۆڤانە دەردەخات و دەبێتە کۆنترین هونەری وێنەکێشان لە کوردستاندا.

# ئاکام و مەرگەساتەکانی
# جەنگی جیهانی یەکەم لەسەر کوردستانی ڕۆژهەلات

ن: محسن مامل محمد

شەڕی یەکەمی جیهانی یەکێکە لەو شەڕە درێژخایەنانەی کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام بوو، کاتێک لە ساڵی(١٩١٤ز) هەڵگیرسا تاوەکو ساڵی(١٩١٨ز) بەردەوام بوو، وە لەهەمان کاتدا ژمارەیەکی زۆر لە وڵاتان تێدا بەشداربوون، وەلەلایەکی تر ئەو شەڕە زەرەروو زیانێکی زۆری ماڵی و گیانی بە وولاتە شەڕەکەرەکان گەیاند.

لێرەدا ئەگەر سەیر بکەین کاتێک شەڕ هەڵگیرسا ئێران لە ٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی(١٩١٤ز) بێلایەنی خۆی لەشەڕ ڕاگەیاند، بەڵام کاتێک ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ٢ی تشرینی دووەم (١٩١٤ز) شەڕی ڕاگەیاند لە دژی ڕوسیا ڕاستەوخۆ خاکی ئێران وە بەتایبەتی کوردستانی ڕۆژهەڵات بوو بە مەیدانی پێکدادانی سەربازی لە نێوان سوپای عوسمانی و ڕوسەکان[1].

لێرەدا کوردستانی ڕۆژهەڵات بووە مەیدانی پێکدادانە سەربازیەکان لە ئەنجامی هێرش و لەشکرکێشیەکانی سوپای عوسمانی و هەروەها هێرشی ڕووس و تیپەچەکدارە ئەرمەنیەکان و لەشکرکێشیەکانی بەریتانیاش لەلایەکی تر، هەروەها بەرگریکردنی کوردەکانی ناوچەکە وایکرد زەرەروو زیانێکی زۆری ماڵیو گیانی بەکوردستانی ڕۆژهەڵات بگات.

کاریگەری ئەو جەنگە لەسەر کوردستانی ڕۆژهەڵات هەموولایەنەکانی

گرتــەوە، ئــەوەتا لــە ڕووی ئــابوری، لەبەرئــەوەی كوردســتانی ڕۆژهــەلات ناوچــەیەكی بــەپیت وبەرەكــەت بــوو لــەڕووی ئاوهــەوا و جــۆری خاكەكــەی هەروەها ژمارەیەكی زۆر لەخەڵكی ناوچەكە بەكشتوكاڵ كردن خــەریك بــوون، سەرەڕای ئەوەی كە پێش شەڕ زۆر لەشارەكانی بنكەیەكی بازرگانی بوون وە خەڵكانێكی زۆر پێوەی خەریك بوون[٢].

وەكاتێك شــەڕ هەڵگیرسا ڕاستەوخۆ زیانێكی زۆر بەكوردستانی ڕۆژهــەلات گەیشت ئەوەش لەبەر درێژی ماوەی شەڕەكە، هەروەها لەئەنجامی پێكدادانە سەربازییەكانی نێوان عوسمانیــەكان وروســەكان وایكرد كــەوا زۆر لەزەوییــە بەپیتەكان تووشی كەم پیتیوقاتوقڕی هاتن[٣].

هەروەها لەئەنجامی ئەو شەڕەدا زۆربــەی كێڵگــەوباغ وباخــچەكان تووشی سووتان بوون، ئەوەش وایكرد زۆربەی ناوچــەكانی كوردستانی ڕۆژهــەلات بــە درێــژایی ســالانی جــەنگ بەدەســت كــەمی بــەرووبوومی كــشتوكاڵی بنــاڵێنن، هــەروەها زۆرێــك لەزەوییــە كــشتوكاڵییەكان ببــوون بــەزەوی بیابــان وپیــت وبەرەكەتی نەمابوو، هەموو ئەمانــە بوونــەهۆی ئــەوەی كــە برسیــەتیەكی زۆر بلاوببێتەوە بەجۆرێك لەسالانی(١٩١٧-١٩١٨ن) زیاتر لە دەهەزرا كەس مــردن بــە هــۆی برسیــەتیەوە، وە لەئــەنجامی برسیەتیەی كــەوا لەنێودانیــشتواندا بلاوببــوەو وایكــرد زۆرێــك لەدانیــشتوانی بەناچــاری پەنابەبــنە بــەرخواردنی گۆشتی سەگ ومرۆڤە مردووەكــان[٤]. بــە درێــژایی ســالانی جــەنگ ســەربازانی لایەنە شەڕكەرەكان بژێوی ژیانیان لەسەرخەڵكی ناوچەكەبوو، وە شــتومەك و خورادنیــان بــەزۆری وبــەلاش لــە خــەڵكی دەســەند وەزۆرجــار تالانیــشیان دەكردن، لەئەنجامی ئەم كارانــە خــەڵكی ناوچــەكانیان ناچــار دەكرد شــوێنی

نیشتەجێ بوونی خۆیان بەجێ بهێڵن ئەوەش وای دەکرد زۆر لەزەوییە کشتوکاڵیەکان وشك ببن و بەکەڵکی کشتوکاڵ کردن نەیەن[٥].

هەرسەبارەت بەئاکامەکانی جەنگ لەئەنجامی ئەوگرانییەی کەلەسالانی جەنگ هاتبوە ئاراوە وایکرد نرخی شتومەك زۆر بەرزببێتەوە، ئەوەتا لە ساڵی (١٩١٥ز) نرخی گەنم دە ئەوەندەی پێشتر بەرز بووەوە، لە چاو ئەو نرخەی کەلەساڵی (١٩٠٠ز) هەیبوو. وە لەساڵی(١٩١٨ز) نرخی گەنموجۆ چوارئەوەندەی تر بەرزبووەوە، هەموو ئەمانەش بوونەهۆی ئەوەی کێشەی نەبوونی نان پەیدابێ، وەبرسەیەتییەکی زۆربڵاوببێتەوە[٦].

بە درێژایی سالانی جەنگ ئەو شتانەی پێشتر دەنێردرانە دەرەوە نرخیان بە ڕێژەی ٤/٣ دابەزی ئەوەتا داهاتی سالانەی ساڵی(١٩١٣–١٩١٤) نزیکەی (٨٣) ملیون قران بوو، بەڵام داهاتی سالانەی نێوان سالانی (١٩١٧–١٩١٨ز) بۆ (٢٥) ملێون قران دابەزی[٧].

هەم ئەمانە بوون هۆی ئەوەی کەوا زۆرێك لەدانیشتوانی کوردستانی ڕۆژهەلات پۆل پۆل سنور ببڕن بەرەو شاری سلێمانی بێن بە مەبەستی سوالکردن[٨].

سەبارەت بە وێرانکردن و کاولکاریەکان، لە نیوەی یەکەمی تشرینی یەکەمی ساڵی(١٩١٤) هێزێکی گەورەی عوسمانی یەکان هاتە ناوەوەی ئێران وە لە ناوچەکانی کوردستانی ڕۆژهەلات هەموو ئەو ناوچانەیان وێران کرد کە پێدا تێپەڕین لە ناوچەکانی هەورامانەوە تاوەکو تەورێز و ناوچەکانی موکریان و بانە[٩].

هەر سەبارەت بە کاولکاریەکان، لە ئەنجامی تێکدانی ماڵ و دێیەکانیش لەلایەن لایەنە شەڕەکەرەکان لە کاتی هێرشەکانیاندا زۆر لەو ناوچانەی کەوا

داگیریان دەکرد و یاخود پێدا تێدەپەڕین وێرانیان دەکرد وە کرداری ئەو کاولکاریانەش گەیشتە ئەو ڕادەیەیی کە مامۆستا محمد ئەمین زەکی بڵێ " بە بیست ساڵی تریش وەکو خۆی لێ نایەت"[١٠].

لە کانونی دووەمی ساڵی (١٩١٥) سوپای ڕووس شاری تەورێز و ئورمیە و شنۆو سابلاغ و بنەیان دەست بەسەرداگرت وە لە شوباتی ساڵی (١٩١٦) سوپاکەیان گەیشتە کرمانشا، ڕەفتاری چەکدارانی ڕوس بە گشتی وە تیپە چەکدارەکانی ئەرمەنی زۆر خراپ بوو بەتایبەتی لە کوشتنی خەڵك و تاڵانکردنیان[١١].

لە٢٢ی ئایاری هەمان ساڵدا ڕوسەکان کوردەکانی شاری شنۆیان بەجۆرێکی بێ بەزەییانە لەناوبرد کە ئیتر شاری شنۆ نەیتوانی تاوەکو چەندین ساڵی تر وەك خۆی لێ بێتەوە[١٢].

لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ تەنیا ڕوسەکان کوردیان نەچەوساندۆتەوە بەڵکو تورکەکانیش لەوانیان کەمتر پێنەکردن ئەوەتا لە کوشتنی کوردان درێغیان نەدەکرد سەرەڕای ئەوەی کە لەسەر ئەستۆی کوردان دەژیان، ئەوەش بە ڕوونی دیارە لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکانی کە بۆ وەزارەتی ناوخۆی ئێران بەرزکراوەتەوە کە تێدا هاتووە " کە لەشارێکی وەك خوی دا تورکەکان بە زۆر خۆراکیان لە خەڵك دەسەند، لە کاتێکدا ئەوان خۆیان لە توانایان دا نەبووە کە بژێوی ژیانی خۆیان بە دەست بهێنن"[١٣].

لەلایەکی تر سەبارەت بە بڵاوبونەوەی نەخۆشیوپەتا لە ئەنجامی بڵاوبونەوەی نەخۆشی و پەتا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك مردن، بەپێی بروسکەیەکی کونسوڵی بەریتانی سەبارەت بە بڵاوبونەوەی نەخۆشی دەڵێت:

(( نەخۆشی بەڕادەییەکی زۆر لە نێو دانیشتواندا بڵاوبۆتەوە لە ساڵانی شەڕدا، وە نمونەش شاری سنەیە کە یەکێکە لەو شارانەی کە نەخۆشی کۆلێرای تێدا بڵاوبۆتەوە))[١٤].

هەر سەبارەت بە شاری سنە کە یەکێکە لەو شارانەی کە پێش شەڕ یەکێك بووە لەو شارانەی کە ژمارەی دانیشتوانی بەرزبووە کە زیاتر لە ٢٢ هەزرا کەس بووە بەڵام دوای کۆتایی هاتنی شەڕ ژمارەی دانیشتوانەکەی دابەزی بۆ ١٢هەزار کەس لێرەدا بە دیاردەکەوێت کە زیاتر لە دە هەزار کەس بۆنە قوربانی ئەو شەڕە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیوپەتا[١٥].

هەروەها شاری ئورمیەش بە هەمان شێوە نەخۆشی کۆلێرای تێدا بڵاوبۆتەوە وە ژمارەییەکی زۆری دانیشتوانی بەهۆی تووش بوون بەم نەخۆشیە بوونە قوربانیوگیانیان لە دەستدا وە ژمارەی قوربانیەکانیش بە پێنج هەزار کەس مەزندە دەکرا[١٦].

بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر ئەو مەرگەساتانەی کەوا دەرهەق بەکوردستانی ڕۆژهەلآت کراوە، ئەوەتا شایەت عەیانێك بەچاوی خۆی بینیبووی و دەڵێ: (( زۆرێك لە دانیشتوانی کوردستانی ڕۆژهەلآت بە کۆمەڵ لە پیاووئافرەت بەرەو عێراق سنوریان دەبەزاند کە قۆڵ و لووت و گوێیان بڕابوو کاتێك سەربازانی ڕووس بەو کارە هەڵسابوون))[١٧].

بەو شێوەیە بە درێژایی ساڵانی جەنگ برسیەتی وگرانیەتی زۆر پەرەی سەندبوو تاوەکو گەیشتبووە ئەو ڕادەیەیێ کە خەڵکەکە ناچار بکات گۆشتی بۆگەن یاخود گۆشتی تۆپیووگۆشتی ئاژەڵی وەکو سەگ بخۆن[١٨].

لێرەدا دەکرێت ئامارەی بەوە بکرێت پاش ئەوەی شەڕکۆتایی هات

گۆڕانکاری زۆر لە جیهان و ناوچەکە هاتە ئاراوە لەدەرنجامی شەڕەکە، سەبارەت بە ناوچەکە، پاش ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕدۆڕا ئەوەبوو هاوپەیمانان بەپێی ڕێکەوتنامەی سایکس بیکۆ-سازانۆف لەساڵی (١٩١٦ز) کەوتنە خۆ بۆ دابەشکردنی میراتی دەوڵەتی عوسمانی، لێرەدا کوردستانی ڕۆژهەڵات لە چوارچێوەی ئێراندا مایەوە چونکە هەروەکو ئامارەمان پێکرد لەسەرەتادا ئێران بێلایەنی خۆی لەشەڕدا ڕاگەیاندبوو هەر بۆیە کوردستانی ڕۆژهەڵات لە چوارچێوەی ئێران مایەوە[١٩].

## پەراوێزەکان:

[١] فوزي خلف شويل: إيران في سنوات الحرب العالمية الأولى،البصرة،١٩٨٥،ص٥٦٢.

[٢] عەلی ئەسغەر شەسیمی هەمەدانی: جوگرافیای کوردستانی ئێران، و/عبدالرحمن محمد أمين، بغداد،١٩٨٠، ل٤٦.

[٣] محمد أمين زكي: خلاصة تاريخ الكردوالكردستان من أقدم العصور التاريخية حتى ألان، ت/محمد على عوني، قاهرة، ١٩٣٩، ص١٤٥.

[٤] سعدي عثمان: الحركة التحررية الوطنية في كردستان الشرقية(١٩٠٠-١٩٣٩)، القسم الأول، طولان العربي-مجلة، العدد٢٦، تموزى١٩٩٨.

[٥] محمد أمين زكى: المصدر السابق، ص١٤٨.

[٦] فوزي خلف شويل: المصدر السابق، ص١٣٤.

[٧] المصدر السابق، ص١٣٥.

[٨] رفيق حلمى: ياداشت(( شۆڕشەکانی شێخ محمودی نەمر، بەرطی یەکەم،١٩٩٨،ل٣٣٥.

[٩] سروه اسعد صابر: كردستان من بداية الحرب العالمية الأولى إلى نهاية مشكلة الموصل (١٩١٤-١٩٢٦)، رسالة ماجستير

منشورة، جامعة صلاح الدين،١٩٩٩م،ص١٩.

(١٠) محمد أمين زكي:المصدر السابق، ص٢٥٠.

(١١) صالح محمد أمين: کوردوعەجەم، مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران،ج١،بغداد،١٩٩٣،ل٢٠١.

(١٢) کامەران احمد محمدامين: کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی وناوچەییدا(١٨٩٠-١٩٣٢)،سلێمانی،٢٠٠٠،ل٩٩.

(١٣) هەمان سەرچاوە،ل٩٨.

(١٤) م.س لازاریف: کێشەی کورد (١٨٩٦-١٩١٧)، وەرگێڕانی لە ڕوسیەوە/کاوس قەفتان،ب١٩٨٩،١،ل٥٢٥.

(١٥) عەلی ئەسغەر شەسیمی هەمەدانی: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٩.

(١٦) صالح محمد أمين: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤٨.

(١٧) احمد خواجە: چیم دی، ب١، بەشی یەکەم، بغداد، ١٩٦٨، ل٣٠١.

(١٨) فوزي خلف شويل: المصدر السابق، ص١٣٤.

(١٩) د.احمد عثمان ابوبكر: كردستان في معاهدة سايكس بيكو-سازانوف باليولوك، شمس كردستان- مجلة، عدد(٩) ، مايس ١٩٧٢.

## سەرچاوەکان:


أ- عەرەبيەکان:

١- فوزي خلف شويل: إيران في سنوات الحرب العالمية الأولى،البصرة،١٩٨٥.

٢- محمد أمين زكي: خلاصة تاريخ الكرد،الكردستان من أقدم العصور التاريخية حتى ألان، ت/محمد علي عوني، قاهرة، ١٩٣٩.

٣- سروه اسعد صابر: كردستان من بداية الحرب العالمية الأولى إلى نهاية مشكلة الموصل (١٩١٤-١٩٢٦)، رسالة ماجستير منشورة، جامعة صلاح الدين،١٩٩٩م.

ب- کوردييەکان:

١- عەلی ئەسغەر شەسیمی هەمەدانی: جوگرافیای کوردستانی ئێران، و/عبدالرحمن محمد أمين، بغداد،١٩٨٠.

٢- رفیق حلمی: یاداشت(( شۆڕشەکانی شێخ محمودی نەمر، بەرگی یەکەم،١٩٩٨.

٣- صالح محمد أمين: کوردوعەجەم، مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران،ج١،بغداد،١٩٩٣.

٤- كامەران احمد محمدامين: كوردستان لـــــە نێـــــوان ململانێـــــی نێودەوڵەتیوناوچـــــەییدا(١٨٩٠-١٩٣٢)،سلێمانی،٢٠٠٠.
٥- م.س لازاریف: كێشەی كورد (١٨٩٦-١٩١٧)، وەرگێرانی لە ڕوسیەوە/كاوس قەفتان،ب١، ١٩٨٩.
٦- احمد خواجە: چیم دی، ب١، بەشی یەكەم، بغداد، ١٩٦٨.

گۆڤارەكان:

١- سعدي عثمان: الحركة التحررية الوطنية في كردستان الشرقية(١٩٠٠-١٩٣٩)، القسم الأول، طولان العربي-مجلة، العدد٢٦، تموز،١٩٩٨.
٢- د.احمد عثمان ابوبكر: كردستان في معاهدة سايكس بيكو-سازانوف باليولوك، شمس كردستان- مجلة، عدد(٩) ، مايس ١٩٧٢.

# دەوڵەتی عوسمانی دامەزراندن و فراوانبوونی

و: د. محمد عبدالله کاکە سور

## ١

١- دەوڵەتەکە بەگێڕدرانەوە بۆ دامەزرێنەری یەکەمی (( سوڵتان عوسمان)) ناونراوە بەدەوڵەتی عوسمانی.

ئەو سەر بەعەشیرەتی تورکی بەناوی ((قایی خان)) بوو، ولەناوچەیەکی سەر بەدەوڵەتی سەلجوقییەکانی ڕۆم دەژیان. لەدوای مردنی تەغروڵ بەگی باوکی عوسمان سەرۆکایەتی عەشیرەتەکەی گرتەدەست، ئینجا لەسوڵتانی سەلجوقی عەلائەدین متفاد پایەبی میری وەرگرت، ولەکۆتاییدا، ساڵی ١٢٩٩ بووە سوڵتانێکی سەربەخۆ، ئەمەش دوای نەمانی دەوڵەتی سەلجوقییەکان، وسەربەخۆبوونی چەندین لەمیرەکانی لەناوچە جۆربەجۆرەکانی وڵاتەکەدا.

٢- ئەوەی جێگای سەرنجە عەشیرەتی ناوبراو لەخەڵکی وڵاتەکە نەبوون، بەڵکو لەعەشیرەتە تورکەکانی تورکستان بوو، ئینجا لەوڵاتی ڕەسەنی خۆیان بەرەو ڕۆژئاوا چوو بوو، ئەمەش لەترسی ئەو پەشێوییە بوو کە شەڕەکانی

جەنگێزخان دروستی کردبوو.

مێژوو وزانیاری باوەڕپێکراوی لەسەر کار وچالاکیەکانی ئەم عەشیرەتە بۆ تۆمار نەکردووین هەموو ئەوەی لەوبارەیەوە دەزانرێ ئەوەیە: کە گەیشتبوە سەرووی جەزیرە، لەنێوان دیجلە وفورات دا، ئەمەش لەسەردەمی ((سلێمان پاشا))ی باپیری سوڵتان عوسمان. لەبەرئەوەی سەرۆکی ئاماژەپێکراو لەکاتی هەوڵی پەڕینەوەی لەڕووباری فورات دا نووقووم بوو، لەتەنیشت (قەڵای جەعبەر) نێژرا، لەدوایدا گۆڕەکەی بە( مەزاری تورک ) ناسرا.

٣- لەدوای مردنی سەرەك سلێمان، عەشیرەتەکە بۆ چەند لقێك دابەش بوو. وا دیارە یەکێك لە لقەکانی گەڕاوەتەوە شوێنی بنچینەیی خۆی، لقێکی تریشیان چۆتەوە ئەنازۆڵ، کە سەلجوقیە ڕۆمەکان فەرمانڕەواییان دەکرد.

ئەم لقە لەژێر سەرۆکایەتی تەغروڵ بەگی باوکی سوڵتان عوسماندا بوو. تەغروڵ بەگ یەکێك لەکوڕەکانی بۆ سوڵتانی سەلجوقی لەقۆنیە ڕەوانە کرد، بۆ ئەوەی لێی بپاڕێتەوە کە ناوچەیەك بدات بەعەشیرەتەکەی کە تێیدا بژی. سوڵتانی سەلجوقی لەباکوری وڵاتی ناوچەیەکی پێدان، کە (( سکودومانیج)) بوو و لەدەشت وچیا وگرد پێك دەهات، دەکرا شوێنی گەرمیان وکوێستانی عەشیرەتەکە بێت.

عەشیرەتی قایی خان چووە ناوچەی ناوبراو، کە دەکەوتە باکوری ڕۆژئاوای ئەنازۆل، لەو شوێنەدا ژیانێکی نوێیان دەست پێکرد.

## ٢

١- ئەمەش لەخۆشبەختی عوسمانلییەکان بوو: لەبەرئەوەی ناوچەکە لەسەر سنوری زەوییەکانی دەوڵەتی بیزەنتی بوو. لەم مێژووەش دا بیزەنتە

لەدارزانێکی گشتیدا بوو: پایەخت لەجیاوازیە مەزهەبیە (ئاینزا) توندەکان دا نوقوم ببوو، ودەسەلاتی خۆی بەسەر هەرێمەکاندا لەدەست دابوو، هەریەك لەشارە بچوك وگەورەکان، لەژێر دەسەلاتی یەکێك لەفەرمانڕەوا وماڵیە زۆرەکاندا بوو.

عوسمانلییەکان لەوێدا بوارێکی فراوانیان بۆ ئاراستەکردنی چالاکی عەشیرەتە لاوەکەیان بەرەو شەڕ وجیهاد دۆزییەوە، ئەمەش بۆ فەتح کردنی هەرێمە بێزەنتییەکان، وخستنە نێو چوارچێوەی بازنەی ئیسلام.

جیهادکردنیان بەم شێوەیە، ژمارەیەکی زۆری لەخۆبەختکەران بۆ کێش دەکردن، ئەمانەی لەمیرنشینە تورکیە ئیسلامیە جۆربەجۆرەکان دەهاتن کە لەسەر پاشماوەی دەوڵەتی سەلجوقی دامەزرابوون.

بۆیە سەرەڕای بچوکی عەشیرەتی بنەڕەتیان، عوسمانلییەکان توانیان دەسەلات بەسەر زۆر لەشارە بێزەنتییەکان دا بگرن.

هەموو فەتح کردنێك لەفەتح کردنەکانیان لە(( ولاتی کافران)) بەگوێرەی بێژەی ئەو سەردەم، دەبووە هۆی بەرزکردنەوەی پایەیان لەچاوی موسڵمانەکان وشەپۆلی خۆبەختکەرانی بەخزمەتی ئەوان بەهێز دەکرد.

٢- بەلام عوسمانلییەکان لەڕوویەکی ترەوە سودیان لەمە وەرگرت. لەدوای ئەوەی دەردەنێلیان بڕی ودەستیان کرد بەچوونە ناوەوەی کیشوەری ئەوروپی. لەو وولاتەی ناویان لێنا ((ڕۆم ئیلی)) واتە: خاکی ڕۆم.

ئەم ولاتە لەڕووی شەرعییەوە بەوولاتی شەڕ وجیهاد دادەنرا، کۆیلایەتی تێدا بلاوکرایەوە. بۆیە عوسمانلییەکان لەسەردەمی سوڵتانی دووەم(ئۆرخان) ڕێگایەکیان داهێنا کە گرێنتی پێکهێنانی سوپایەکی شارەزای شەڕ وجیهادی

دەکرد. لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر دەستیان کرد بەهێرشکردنە سەرپشت سنوریان، لەووڵاتی گاوران، ئەمەش بەمەبەستی بەکۆیلەکردنی منداڵان، لەم هێرشانەدا بەژمارەییەکی زۆری منداڵەوە دەگەڕانەوە، ودەخرانە دام ودەزگای تایبەتییەوە، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ئیسلامی عەسکەری پێبگەیەنرێن.

ئەو سوپایەی بەم شێوەیە لەمنداڵانی ڕفێندراو وبەکۆیلەکراوە پێك هێنرا، بەناوی ئینکشاری ناسرا.

( ئەو ووشەیە لەووشەی ((ینی تشری)) گۆڕدراوە وبەمانای جۆری نوێ، یان(( سیستەمی نوێ دێ)).

ئەندامانی ئەم سوپایە شتێکیان لەبارەی ڕەگەز ورەچەڵەکی خۆیان نەدەزانی، هەستیان بەهیچ جۆرە پەیوەندییەك بەخێزانەوە نەدەکرد، ئەمە بێجگە لەخێزانی سوپا کە سەر بەئەو بوون. ولەسەر ئاینی ئیسلام پێ دەگەیەنران. هەر لەتەمەنێکی بچوکیەوە بەبیرۆکەی جیهاد تێر دەکران. باوەڕیان بەوەبوو کە جیهاد لەفەرزەکانی ئیسلامە. دەچوونە گۆڕەپانی شەڕ ولەدڵی خۆیان دەیانووت(( یان غازی، ویان شەهید))، بەو مانایەیی لەسەریانە یان بەسەر دوژمنەکانیاندا سەربکەون وببن بەشەڕکەر(غازی)، وەیان لەکاتی شەڕدا بمرن،؟ بەمەش بچنە ڕیزی شەهیدەکان.

کورتەی ووتە: ئەو سوپایە هەر لەسەردەمی منداڵی ئەندامەکانی بەشێوەیەکی قەتیس کراو لەسەر شەڕ وجیهادکردن پێ دەگەیەنران، بۆ ئەم مەبەستەش لەهەموو ڕووە مادی ومەعنەوییەکان ئامادەکران.

ئەم سوپایە کە عوسمانلییەکان بەم شێوەیە سیستەمەکەیان دانا، یەکەم

(( سوپای هەمیشەیی)) بوو لەمێژوودا.

هێزی دەوڵەتی عوسمانلی لەبنەڕەتدا لەم سوپایەوە پەیداببوو. پێویست بەوەش ناکات بڵێین کە دەوڵەتی عوسمانلی تەنها بە ئەم سوپایەوە نەوەستا، بەڵکو سوپای تری پێك هێنا، کە خەڵکەکەی لەهەرێمەکانی دەوڵەت بوون، بەڵام تەوەرەی هێزی دەوڵەت لەسوپای ئینکشاری دا بوو.

بەم سوپایە ڕێکخراو ومەشق پێکراو وخۆنەویستە، عوسمانلییەکان توانیان بەخێرایی سنوری سەڵتەنەکەیان فراوان بکەن. ئەوان لەلایەکەوە چەند ولاتێکیان لەئەوروپا کە تاکو ئەوکات لەژێر قەڵەمڕەوی ئیسلامدا نەبوو فەتح کرد.

لەلایەکی ترەوە دەستیان بەسەر میرنشینە ئیسلامیە بچوکەکانی داگرت، کە لەسەر پاشماوەی دەوڵەتی سەلجوقی لەئەنازۆڵ دامەزرابوون.

٣- ئەوەی جێگای سەرنجە: هەرچەندە دەوڵەتی عوسمانلی لەکیشوەری ئەوروپاوە فراوان دەبوو، بواری هێرشکردنی بەمەبەستی فڕاندنی منداڵان وکۆیلەکردنیان بەرامبەر فراوان دەبوو، بەمەش تیپەکانی ئینکشاری زۆر دەبوو، هەروەها لەگەڵ ئەمەشدا هێزی فراوانخوازی زۆر دەبوو.

فەتح کردنەکانی عوسمانلی تاکو سەردەمی سوڵتانی چوارەم بایەزید بەخێرایی بەڕێوەدەچوو، ئینجا ماوەیەك تووشی وەستان بوو، ئەمەش بەهۆی ئەوشەڕەی لەنێوان دەوڵەتی عوسمانلی وتەیمورلەنگ دا ڕوویدا، وەکو زانراوە تەیمورلەنگ لەشەڕی ئەنقەرد دا بەسەر سوڵتان بایەزید سەرکەوتنی بەدەست هێناو، بەدیلی گرت. لەئەنجامی ئەم ڕووداوەش کوڕەکانی سوڵتان لەسەر عەرشی سەڵتەنەت تووشی ناکۆکی بوون.

بەڵام دوای کۆتایی هاتنی ئەو ماوەیە کە مێژوونوسە عوسمانلییەکان بەناوی ((جیاکردنەوەی سەڵتەنەت)) ناویان ناوە، بەسەرکەوتنی سوڵتان مەحەمەدی یەکەم بەسەر براکانی دا، سەردەمێکی نوێ لەفەتح کردن دەستی پێکرد. وە عوسمانلییەکان چوونە ناوەوەی نیمچە دوورگەی بەڵقان، تاکو توانیان هەموو بەشەکانی فەتح بکەن، هەروەها قوستەنتنیەشیان فەتح کرد، وبەشێوەیەکی کۆتایی دواییان بەدەوڵەتی بیزەنتی هێنا.

لەهەمان کاتدا فراوانخوازییان لەئەنازۆل ئەنجامدابوو، ودەستیان بەسەر مێرنشینەکانی داگرتبوو، تاکو سنوری سەڵتەنەتەکەیان گەیاندبووە چیاکانی تۆرۆس، لەپاش بوونە هاوسنوری دەوڵەتی مەمالیك کە فەرمانڕەوایی مصر وسوریا وحیجازی دەکرد. ئەمەش لەسەردەمی سوڵتان بایەزیدی دووەم بوو.

٣

تاکو ئەو مێژووە، سەڵتەنەتی عوسمانلی هاوسنوری ناوچە عەرەبییەکان نەبوو، بەڵام بەتەواویش لێی دانەبڕابوو. بازرگانەکان وحاجیەکان لەنێوان ناوچە عوسمانلییەکان وناوچە عەرەبییەکان هاتووچۆیان دەکرد، هەروەها سوڵتانەکان بەشێوازی جۆربەجۆر وبەهۆی جۆربەجۆر پەیوەندیان بەیەکتری دەکرد ونوسینیان بۆ یەکتری دەنوسی. سوڵتانە عوسمانلییەکان بەتەواوی پەرۆشی بوون بۆ ئەوەی هەواڵی سەرکەوتنەکانیان لەناوچە ئیسلامیە جۆربەجۆرەکان دا بڵاوبکەنەوە.

ئەوان هەرچەند بەسەر دەوڵەتێکی گاوردا سەر بکەوتابانایە، وهەرچەندە شارێکی ئەورووپیان فەتح کرد بایە... بۆ ئاگادارکردنی شا موسڵمانەکان، لەوانەش سوڵتانەکانی مەمالیك لەمیسر، شاندی تایبەتیان دەنارد.

ئەم پەیوەندی کردن ونوسینانە لەگەڵ سوڵتانە ئاماژە بۆکراوەکان، تاکو سەردەمی سوڵتان سەلیم، بەزمانی عەرەبی ئەنجامدەدرا.

مێژووی عوسمانلییەکان، هەندێك لەو نوسینانەیان بۆ پاراستووین. کارێکی بەسوودە کە تیشك بخەینە سەر هەندێکیان، ئەمەش بۆ ئەوەی ئاگاداری بنەمای ئەو سیاسەتە بین کە عوسمانلییەکان لەسەری دەڕۆیشتن، پێش ئەوەی کە دەست بەسەر ناوچە عەرەبییەکاندا بگرن.

نوسراوێك لەسوڵتانی شەشەم موڕادی دووەم بۆ عەزیزی میسر شا ئەشەرف بریسبای، (( تیایدا مژدەی فەتح کردنی قەڵای (کوکرجینلك)، لەڕووباری(دانوب)ی پێ دەدات ومێژووەکەی ٨٣١ك (١٤٢٧ز).

و تیایدا هاتووە، لەدوای بەدیارخستنی گەیشتنی نوسراوی پێشووە ولە دوای ئاماژەکردن بۆ ناواختنی لە(( بەسەرکردنەوەی بارودۆخی سەربازە موسڵمانەکان، ئەو شەڕکەرە یەکتاپەرستانە، خودا بیان کات بەسەرکەوتوویی ئەبەدی وسەرمەدی، دوژمنەکانیشیان بکات بەهەڵتوو، وهەواڵ پرسین سەبارەت بەکافرەکانی انکرس وئەوانەی لەدوژمنانی ئاین دوایان کەوتوون، خودای بەرز وبالاً تاکو ڕۆژی زیندووکردنەوە ویەقین پێ پشت وپەنایان بکات)):

(( لەزانینی بەرزتان ناشاردرێتەوە کە شایەکەیان هەموو کافرەکانی لەدوورترین وولاتی کوفر وپارتەکانی شەیتان کۆکردۆتەوە، ئامانجیان هەبوو هێرش بکەنەسەر خەڵکی ئیسلام، پەنا بەخوای بەرز، بۆیە خۆشەویستی پیشت بەستوو بەخودا لەگەڵ سەربازە یەکتاپەرستە موجاهیدەکانی ڕوویان کردە جیهاد، وبەرزکردنەوەی هەق وسەرخستنی ئاین.....

(( .... سەربازە موحەمەدییەکان بەڕێکەوتن وگەیشتنە دوورگە تاوانبارەکە، کە دوورگەیەکە لەناوەڕاستی ئاوی تۆنە، لەهەموو لاشەوە دوو قوولەی قایم هەیە. سواری کەشتی وئابلوقەکەیان دا، بەسەرخستن لەلایەن خوداوە فەتحیان کرد. هەموو کەشتی وئامێرەکانیان کە قەڕاڵ بەدرێژایی ڕۆژەکان وساڵەکان بەمەبەستی زیان گەیاندن بەخەڵکی موسڵمان ئامادەیکردبوو لەلایەن موسڵمانانەوە بردران، ئەمەش سەبارەت بەخودا ئاسانە، ودەسکەوتی زۆریان هەبوو وژن ومنداڵەکانیان بەدیل گرتن، وگەورە ونێرکانیان کوشتن وخانوو وکۆشەکەکانیان وێرانکردن....

((... توقینیان خستەدڵیانەوە. بەرەو دوورترین شوێنی وڵاتیان هەڵاتن. لەترس وپارێزەوە پەرتەوازە بوون، بەو شێوەیەی کە شەیتان لەسێبەری شمشێری عومەر ڕەزای خوای لەسەر بێت ڕاو دەکات. کاتێکیش کە خۆمان ئامادەکردوو لەگەڵ سەربازەکانمان قۆڵمان لێ هەڵماڵی بۆ بەدواداچونیان لەهەر کوێیەك بن، گوێبیستی بووینە کە شای شانشینە لازەریەکان توسباتی کوڕی لان. کاتێك هەواڵی جیهادکردنی سەربازە یەکتاپەرست وبەرزکردنەوەی هەق ویەتین بیست، بەبەرەکەتی خودا لەناکاودا مرد. ئەمەش پەیجوەکی موحەممەدی، وشکۆیەکی ناوبانگی ئیسلامییە.( بۆ ئەمەش لەبەرهەست کردن بەتوانای خودا سوپاسگوزاری بووین).نۆ نامەی تر هەیە لەنێوان سوڵتان مورادی دووەم وشا برسبای.

٢- کارێکی باشە ئەگەر نوسراوی ناردراو لەسوڵتان مورادی دووەم بۆ عەزیزی میسر لەکاتی فەتح کردنی سەلانیك بخوێنینەوە. نوسراوەکە بەم دەربڕینە دەست پێدەکات:(( سوپاس بۆ ئەو خودایەیی ناودارانی ئاینی

ئامـادەکردووە، بەسەرخـستنی هـەقی دیـار، وئـالآی خـەڵکی بـاوەڕداری بەتیـشکی شمـشێرەکانیان بەسـەر تاریکـایی کافرەکـان دا بەرزکردۆتـەوە، بەشـکاندنی پارتـەکانی شـەیتان، و وڵاتـانی کـافرە نـەفرەت لێکراوەکـان، دەرگاکانی سەرکەوتن وبردنەوەی بۆ کردوینەوە.....)).

لەپاش بەردەوام بوون لەدوعاکردن، دەڵێ:

(( ئـەم نوسـینە بـۆ جـەنابی پایەبـەرز خـودا بەشـێوەیەکی هەتاهـەتایی وسـەرمەدی بەرزبکاتـەوە ونـاردراوە، دوو مانـا بـەخۆوە دەگرێت: یەکـەمیان مژدەدان بەسەرخستنی ئالآکانی ئیسلام بەبەرەکەتی ئایاتی مـەزن، و بـەفتح کردنی میرنشینی زۆر کە قەڵای سەختیان هەبووە، وخـاوەن زەوی تۆبـەرەن، ئەمـــەش بەشـــالآوی ئاگـــاداربونی خـــودای چـــاودێر، وپـــشتگیریـــکردنی ئەو...دووەمیشیان دانـــانی مـــەرجـەکـانی تـــازیە بـــۆ ئاوابـــوونی خۆری سەڵتەنەت...



## سەرچاوە:

ساطع الحصری، البلاد العربیة والدولة العثمانیة، بیروت، مطابع دار العلم للملایین، ١٩٦٠م.

# کورتەیەک لە مێژووی زانستی لێکۆڵینەوەی بەڵگەنامەکان*

ن: سالم الالوسی
و: توانا رشید کریم

باسمان کرد کە زانا وڕاهیبی بەندیکیتی[1] جان مابیون Jan Mabillon- (١٦٣٢-١٧٠٧ز) لەساڵی (١٦٨١ز) پەرتوکێکی بەناوی "De re diplomatic لەکاروباری دیپلۆماتیک" دا لەدێری "سان جەرمان دی بەریە" بلاوکردەوە، بەر لەوەش باسێکی لەفەرهەنگی "شاکارەکانی قەدیسەکان Acta Santorum" بلاوکردبوە، کە بەدواداچونی لەسەر ووتارێك کردبوو کە لەساڵی (١٦٧٥ز) بەپێنوسی زانای بولاندیستی[2] دانیل ڤان پاپنبرۆك Daniel van papinbroeckی، سەرنوسەری (ئەکتاسنکتورم) بلاوکرابووە هەر وەك پێشتر باسمان کرد، ئەم ووتارەی گوزارشت لەباسێکی دوور ودرێژ دەکات کە دەستپێکی دەرکردنی بەرگی دووەمی تایبەت بەمانگی نیسانی ئەم فەرهەنگەی پێکرابوە لەلایەن پاپنبرۆك. کە تیایدا ڕەسەنایەتی وڕاستێتی زۆرینەی بەلگەنامە میروفینجیەکانی[3] پۆچەلکردبووە وهەروەها بەلگەنامەکانی دیکەش(Charters)، ئەوەی کە گەنجینەی بەلگەنامەکان لەدێر وکەنیسەکان پڕیبوو لێی وەك ئەو بەلگەنامە پارێزراوانەی دێری(دنیس St.Denis)ی ڕەهبانە بەندیکتییەکان لەنزیك پاریس.

مابیون لەم باسەیدا لێی هاتە وەڵام بۆ بەرپەچدانەوەی ڕاکانی پاپنبرۆك وپوچەڵکردنەوەی، پاپنبرۆك زانیاری وئاگایی وردی نەبوو لەمەڕ گەنجینەی بەڵگەنامەکان، بۆیە بەنیسبەت مابیونەوە زۆر ئاسان بوو ڕووبەڕووی پاپنبرۆك بێتەوە بەپشت بەستن بەبەڵگەنامەکان، ئەم بەرپەچدانەوەیە تەنها بیانووبڕ وبنبڕنەبوو، بەڵکو لەلایەن پاپنبرۆکەوە دەنگۆی باشی هەبوو وقبوڵیکراو وە دانیپێدانرا.

بەکۆی ڕا، چاکە وباشە لەچەسپاندنی ڕێسا زانستییەکانی دپلۆماتیك لەسەر بنەمایەکی ڕوون وچەسپاو دەگەڕێتەوە بۆ پەرتوکەکەی مابیون( لەکاروباری دپلۆماتیك)دا، لە ئاکامی ئەمەدا ململانێی پەیدابوو لەنێوان هەردوو دەستەی بەندیکیتی ویەسوعییەکان، ئەم ململانێیەش کارادانەوەیەکی پۆزەتیڤانەی هەبوو بەجۆرێك بەردی بناغەی بنیادنانی هەوڵ وکۆشش وکارەکان بوو کە درا بۆ دامەزراندنی زانستی بەڵگەنامەکان ولێکۆڵینەوە وەرگرتن لێی، وە لەپێشەنگی ئەم زانستانەش، زانستی (دپلۆماتیك).

کاری پێشەنگ وپێشدەستی مابیون ڕێخۆشکرد بۆ زۆرێك لەزانایانی ئەوروپی لەبەدەستهێنانی جۆرایەتی وسەرکەوتنی زۆرتر لەم بوارەدا. ئەوەش بەدەرکردن ودەرچوونی لێکۆڵینەوە ودەرکراو لەژمارەیەك لەووڵاتانی ئەوروپی ڕەنگدەداتەوە کە شوێنپێی (مابیون)یان هەڵگرت، وەکو دەبینین.

**ئینگلتەرا:**

لەئینگلتەرا تۆماس مادوکس Thomas Madox لەساڵی (١٧٠٢ن پەرتوکێکی بەناونیشانی (کۆمەڵێك ڕێسای ئەنگلیکانی Formolare Anglicanum, ١٧٠٢)ی،دانا. وپاش ئەویش جۆرج هیکس George

Hickes لەساڵی (١٧٠٥ز) دانراوە بەناوبانگەکەی بەناوی (گەنجینەی زمانە کۆنەکانی ڕۆژهەلات Linguarum vetrum septentrionalium Theasarus)ی، دانا.

**فەرەنسا:**

بەڵام فەرەنسا کە بەلانکی یەکەمی پێگەیشتنی زانستی دپلۆماتیک دادەنرێت، پارێزگاری لەپیشەنگی خۆی کرد وکاریکرد بۆ چاودێریکردن وپەرەسەندنی، ئەوەی شایەنی ئاماژەکردنە لێرەدا ئەوەیە کە پەرتوکەکەی (مابیون) لەهەڵە بەدوور نەبوو بەڵکو تیری ڕەخنەگرتن گەیشتە ئەویش. مابیون زانیارییەکی ورد ووریکی نەبوو بەو بەلگەنامانەی کە بۆ چاخەکانی پێشتر لەسەدەی سێزدەی زاینی دەگەڕایەوە، لەبەرئەمە دانراوەکانی کە پاش مابیون نوسران وهاتنە بلاوکردنەوە وردتر وگشتگیرتر وڕاستربوون.

لەساڵی (١٦٧٨ز)،قەشەی فەرەنسی(ریشارد سیمون) دانراوێکی داهێنانەی لەچاپدا کە ڕەخنەی لەتەورات گرتبوەخۆ[٤]، سیمون شێوازی ڕەخنەی دەقەکانی تێدا جێبەجێی کرد کە ئەوانی تر لەسەر دۆکۆمێنت ودەقە ئاینییەکان جێبەجێ یان دەکرد، لەوەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە چاخی کۆن هەر وەك لەمرۆدا ناسراو ویاوە، پشت بەو دەستنوسانە دەبەستێت کە دەگەڕێنەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست، بۆچون وڕاکانی سیمون لەلایەن کەنیسە وپاشا لویسی چواردەهەم جیگای بەرهەڵستی بوو.

دیارترین کار لەم بوارەدا دەرچوونی ئینسکلوپیدیای دپلۆماتی (لێکۆڵینەوەییەکی نوێ لەدپلۆماتێك Nouveau Traite de Diplomatique) بوو، کە لەشەش بەرگ پێك دەهات ودەرچونیشی

ماوەی نێوان ساڵانی (١٧٥٠-١٧٦٥ن) خەیاند، ئەم ئینسکلۆپیدیایە لەکاتی خۆیدا بەگرنگترین تفاقی مەعریفی دادەنرا، شایەنی باسە دوو لەڕاهیبە بەندیکیتییەکان بەم کارە پڕبایەخ وشکۆمەندە هەڵسان، ئەوانیش:

١- رینیە پروسپیر تاسان Rene Prosper Tassin کە کورتەی ناوەکەی بە (دون تاسان Dom Tassin)(*) ناو دەبرێت.

٢- شارل فرانسوا توستان Charles Francois Toustain، وە کورتەی ناوەکەشی ( دون توستان Dom Toustain)ە.

ئینسکلۆپیدیای (لێکۆڵینەوەییەکی نوێ لەدپلۆماتیك) بەمەزنترین ئینسکلۆپیدیا دادەنرێت کە چارەسەری شێوازەکانی پەیڕەوکراو لەڕەخنەی بەڵگەنامەکان دەکات، بابەتەکانیشی تەنها لەو بوارەدا کۆنەبووبوە، بەتایبەتی پاش ئەوەی لێکۆڵینەوەی تری پەیوەست بەنوسین ونوسراوە کۆنەکان پالیوگرافیا(palaeography) لەخۆگرت، بەشێوەیەکی تایبەتی پەرتوکە لاتینییە کۆنەکان ولقەکانی وشیکردنەوەی هێما وتەم ومژاوییەکانی، هەروەها لێکۆڵینەوەی مۆر وئارمەکان ئەوەی بە سجیلوگرافی(sigillography) ناسراوە، کە ئێستا بەزانستێکی سەربەخۆ لەزانستە یاریدەدەرکان لەلێکۆڵینەوەی زانستی دپلۆماتیك دادەنرێت. لەگەڵ ئەوەی ئەم دوانە بەکارێکی مەزن هەڵسان بەلام لەهەڵە بەدوور نەبوون، ئەوەش لەبەها وئەرزش وگرنگی کارەکەیان کەم ناکاتەوە بەهۆی ئەوەی ئەم ئینسکلوپیدیایە مەسەلەگەلێك وزانیاری پر بایەخی لەخۆگرتبوو، وە سەرچاوەییەکی دەوڵەمەند وبوارێکی بەپیتیش بوو بۆ توێژەر ولێکۆڵەر وخوێنەرە دوایینەکان بە جۆرێك ئەوان باشترین وگەورەترین سود وبەرهەمیان

لێکۆڵینەوە.

بەهەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی لەساڵی (١٧٨٩ز) گەنجینەی بەڵگەنامەکان (ئەرشیفەکان)و، وە ئەو بەڵگەنامانەی کە تێیدابوو مێژووەکەی دەگەڕایەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست، ئەمەش وای لێکردبوو بەها وگرنگی وبەهێزی خۆیان لەدەستدابوو لەچەسپاندنی خاوەندارێتی (قەواڵەی خاوەندارێتی) لەگەڵ ئەوەی بەهای مێژوویی خۆی لەدەست نەدابوو، وە پارێزرابوو وەك ئەدەبیاتێکی مێژوویی بەهادار وسودەمەند وسەرچاوەیەك لە سەرچاوەکان کە توێژەر ولێکۆڵەر بەبەردەوامی پشتی پێ دەبەستێت، لەبەرئەم هۆیە دەبینین کە (ئەکادیمیای فەرەنسی بۆ نوسینە کۆنەکان Academie des Inscription) گرنگی وبایەخ وچاودێری پێویستیان پێدا.

لەساڵی (١٨٢١ز) کۆلێژی بەڵگەنامەکان Ecole des chartes دامەزرا لەپاریس کە بەیەك لەمەڵبەندە چالاکەکانی خوێندنی زانستی دپلۆماتیك دادەنرێت، ئەم کۆلێژە هەوڵ وکۆششێکی نایابیدا لەم مەیدانەدا، هێشتا ساڵی (١٨٢٩ز) نەهاتبوو، کە بزوتنەوەی گرنگی وبایەخدان بەئەرشیف بەرەو پێشەوە هەنگاوی فراوانی هەلگرت تا گەیشتە بالاترین پلە. هەروەها پاڵی بەئەرشیفەوە نا بۆ پێشەوە بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوتی مەزن لەم بوارەدا، لەشوێنەواری ئەوەش دەرکردنی فەرمانی پاشایەتی بوو لە(سەردەمی پاشا شارل) بەدووبارە ڕێکخستنەوەی ئەرشیف لەسەر بناغە وڕێسای نوێ، ئەم کۆلێژە ڕۆڵێکی گرنگی بینی لەخوێندنی زانستە ئەرشیفییەکان وهانی لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆری پەیوەست بەدپلۆماتیکی دا، ئەم بزوتنەوەیە

سەراپای وولآتی فەرەنسا گرتەوە ودەنگۆی هەبوو وە لەسەر ئاستی وولآتانی تریش ڕەنگدانەوەی هەبوو وەکو ئەڵمانیا ونەمسا وئیتاڵیا وئەوانی تر، بەجۆرێك دەزگا وفەرمانگە فەرمی وزانستییەکان لەو وولآتانە زۆر بەپەرۆشەوە پێشوازییان لەلێکۆڵینەوەی بەڵگەنامەکان کرد. لەوەوە لێکۆڵینەوەی ڕێباز وپرۆگرامی ئەرشیفی دیلۆماتی دروست بوو بەپاڵپشتی حکومەت ودەوڵەت.

لەئەڵمانیا و وولآتانی زیانگۆ بەزیانی ئەڵمانی هەمان دەسکەوتیان بەدەستهێنا، هەروەها لەفەرەنساش، بەدەرکردنی دانراو ولێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی لەمەڕ بەڵگەنامەکان. لەوانە:

**فەرەنسا:** ڕستەیەك لەسەرچاوەی گرنگ لەم بوارەدا دەرچوو لەوانە:

١- پەرتوکی ( ڕێبەری کار بەدیلۆماتیك ) کە لەساڵی (١٨٩٤ز) لەلایەن (ئەرسەر جیری)یەوە، دانرا.

Arthur Giri Manual. De Diplomatique (١٨٩٤)

٢- پەرتوکی ( یاساکان ودیلۆماتی پەیوەست بەمێژووی فەرەنسا)

Charter et diplomas relation al histoire de france

٣- زانای فەرەنسی (دوکانج Du Change) لەساڵی (١٦٨٨ز) فەرهەنگێکی لەبارەی لاتینی لەسەدەکانی ناوەڕاست دانا، کە تائێستاش بەکاردێت ودەستاودەستی پێدەکرێت.

**ئەڵمانیا:**

١- یەکەم پەرتوک لەبارەی دپلۆماتیک لەئەڵمانیا لەلایەن زانای ئەڵمانی (باسیل Bassel) لەساڵی(١٧٣٢ز) دانرا بەناوی (Chronicom Gotwicense ) کە جێگای بایەخ وگرنگی بوو.

٢- پەرتوکی دووەم کۆمەڵەی ئەڵمانی مێژوویی لەساڵی(١٨٢٦ز) دەریکرد بەناوی بەڵگەنامە مێژووییەکانی ئەڵمانیا Monumenta Germanica Historica (١٨٢٦)

٣- بەر لەکۆتایی هاتنی سەدەی نۆزدەهەم ئەرکی پربایەخ ومەزن لەم بوارەدا بەدەستهاتوو لەمیانەیدا لێکۆڵینەوە وتوێژینەوەی بەهێز ورەوان وگشتگیر لەم مەیدانەدا هاتەبڵاوکردنەوە وبوون، ئەوەبوو لەساڵی(١٨٨٩ز) بەشی یەکەم لەپەرتوکێك بەناونیشانی (پەرتوکی دپلۆماتیکی ئەڵمانیی وئیتالی Henry Bresslau.handbuch der unkundenlehre fur deutshland und Italien) دەنرا لەلایەن هنری برسلاو[٦] Henry Bresslau. شایەنی باسە لەم ماوەی دواییدا ئەم پەرتوکە بەچاپێکی بژاردکراو چاپکرایەوە.

**ئەمسا:**

پەیمانگای لێکۆڵینەوەی مێژوویی لەئەمسا Institut fur Oesterreichisch Geschichts forschinuy ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا لەم بوارەدا، ئەم پەیمانگایە لەساڵی(١٨٥٤-١٨٥٦ز) دامەزرا ویەکەم بەڕێوبەری ئەم پەیمانگەیەش زانای بەناوبانگ تیودور شیفالیە دی سیکل[٧] بوو.

**ئیتالیا:**

لەئیتالیا، زانا(مافی Maffi) پەرتوکێکی دانا، کە لەساڵی(١٧٧٢ن) بەناونیشانی: ( بەلگەنامە مێژوویی یەکان Historia Diplomatica) دەرچوو، وە لەساڵی ١٧٤١ز (موراتوری Muratori) هەڵسا بەبڵاوکردنەوەی زنجیرەیەك لێکۆڵینەوە وتوێژینەوە لەمەڕ دپلۆماتیك، لەدانراوێکی بەبایەخدا بەناوی (شوێنەواری ئیتالیا Antiquitates Italioe).

**ئیسپانیا:**

لەئیسپانیا زانای بەندیکیتی ( پیریس Perez) لەساڵی(١٦٨٨ن) هەستا بەکارکردن لەلێکۆڵینەوەی بەلگەنامەکان.

**ئینگلتەرا:**

لەئینگلتەرادا، ئەگەرچی کارکردن لەئەرشیف دا کەمێك درەنگ دەستی پێ کرد، بەڵام هەوڵ وکوششی ئەوانەی کار لەبەلگەنامەکان دەکەن، چ بەرێکخستن یان گرنگی پێدانی، قەرەبووی ئەو فەرامۆشیەیان بۆ کردەوە کە بەسەریدا تێپەڕیبوو. پەیمانگە تایبەتی وگشتییەکان پێکەوە بەم کارە هەڵسان ولەم بوارەدا ئیشیان کرد وهەوڵی تایبەتیاندا بۆ گرنگی دان بەسەرچاوە بەلگەنامەییەکان بەسەربرد، ئەوەبوو دەق ووێنەکانیان لێ بڵاوکردەوە. لەسەرەتای ساڵی(١٨٠٠ن) لیژنەی بەلگەنامەکان Record Commission گرنگی دانی بەبەلگەنامە گشتییەکان گرتە ئەستۆی خۆی، ئەم شێوازە کارە بەردەوام کاری پێکرا تا بەرپرسیاریەتی بەلگەنامەکان خرایە ژێر چاودێری وئەستۆی فەرمانگەی بەلگەنامە گشتییەکان Puplic

Record Office(PRO) کە لەساڵی(١٨٣٨ز) دامەزرابوو، سەرباری بایەخدان پێیی لەلایەن فەرمانگە زانستی ودامەزراوە ڕۆشنبیری وکۆمەڵە زانستییەکان و، وە کورسی تایبەت بۆ ئەم بوارە لەکۆلێژ وزانکۆکان تەرخانکرا.

ئەگەر بڕوانین ووردبینەوە، لەو قۆناغە زانستییانەی دپلۆماتیک پێداتێپەڕبووە، دەبینین هەر لەسەردەمی (مابیون)ەوە بگرە، هەنگاوی مەزنی بڕیووە، ئەگەر چی لەڕووی شێواز وڕێگا پەیڕەوکراوەکان لەلێکۆڵینەوەی بەڵگەنامە وەکو پێشان مابووە، وەك لێکۆڵینەوەی شێوەی بەڵگەنامەکان وبەرووارکردنیان بەوێنە ڕەسەنەکەی، بەڵام لەڕووی بابەتەکانیەوە جۆرایەتی وتەشەنە وبەربڵاوبووە بەشێوەیەکی فراوانتر وبەهێزتر وچەسپاوتر، وە گۆڕانی بەسەرداهات، بەڵام ئامانجەکانی ئەم زانستە تەنها لەتوێژینەوە ولێکۆڵینەوەی چەسپاندنی ڕەسەنایەتی بەڵگەنامەکان کۆنەبوویوە، بەڵکو ئەوەی تێپەڕاندوو بەرەو کارێکی تری پەیوەست بەو بابەتانە وەکو جەختکردنەوە لەڕاستێتی بەروار ومێژوو وشێوازەکانی کاری بەڵگەنامەکان ومەبەست لێی ولەو چەشنە مەسەلانەی پەیوەست بەو بوارە سەری کێشا، بەتێپەڕبوونی کات وزەمەن وهەڵگۆزینی هۆیە نوێ وجۆراوجۆرەکان، ئاسۆی زانستی دپلۆماتیکی بەرفراوانبوو لە ئاکامی پەرەسەندنی مێژووی کارگێڕی، بە ووشەیەکی ڕوونتر بڵێین ئەو پەرەسەندنە بەدەستهاتووانەی کە لەبوار وکاری کارگێڕی ڕوویدا.



## پەراوێزەکان:

* ز.

[1] بەندیکیتی : دەستەیەکن ودەدرێنە پاڵ قەدیس بندیکت Bendict (٤٨٠-٥٤٣).

[2] بولاندیست : کۆمەڵەیەکی یەسوعین، ودەدرێنە پاڵ زانای بەلژیکی یەسوعی (یوحنا بولاند John Bolland) یان (بولاندس Bollandus) کە لەماوەی سالآنی(١٥٩٦-١٦٦٥) ژیاوە ودامەزرێنەری پرۆژەی بلاکراوەی دپلۆماتی (ئەکتاسنکتۆرم)ە واتە: شاکاری قەدیسەکان یان شاکاری پیرۆز. کۆمەڵە کارێکی زانستی مەزنە، زانیاری وبەڵگەنامەی مێژووی لەمەڕ ژیان ورێژین (سیرە)ی قەدیسەکان لەخۆگرتبوو.

[3] میروفینجیەکان Merovengian : لەبنەماڵە دەسەلآتدارەکانن لەفەرەنسا (٤٨٦-٧٥٢ز)، لەبەناوبانگترین فەرماندەکانیان (شارل مارتل)ە، کە لەشەڕی تور بەسەر عەرەبدا سەرکەوت.

(٤) Richard Simon: Critical History of the Old Testament.

[5] دون تاسان (رینیە پرۆسپیر): بە(دوم) دەنوسرێت وبە(دون) گۆ دەکرێت، رۆشنبیرێکی فەرەنسیە لەدەستەی بەندیکیتی(Benedictine)یە، لەلونلای لابی Lonely LAbbaye لەناوچەی ئۆرن Orne لەسالی(١٦٩٦) لە دایکبووە و لەسالی(١٧٧٧) لەپاریس مردووە. رینیە کاری لەکەنیسەی جومیجJumiege کردوە، وە پەیوەندی بەزانا (دون توستان)ەوە کردووە ولەگەڵ ئەم زانایەدا پەیوەندییەکی مەتین بەیەکیەوە بەستوون وهەردووکیان پێکەوە هەستاون بە بلاوکردنەوەی دانراوەکەی (تیودۆر ستودیت Theodore Studite). پاشتر بواریان بۆ رەخسا بەسەفەرکردن بۆ رۆما، لەوێ ماوەیەک مانەوە وئینجا گەڕانەوە و لەکەنیسەی سنت ئوین Saint Ouen لەناوچەی رۆن Roun جێگربوون، وە لەسالی(١٧٤٧) سەرپەرشتیاری گشتی کۆمەڵگەی کەنیسی هەردوکیانی بانگکرد وبلاوکردنەوەی ئینسکلۆپیدیای (لێکۆڵینەوەی نوێ لەدپلۆماتیک)ی پێسپاردن، ئەوە بوو بەو

کارە بەشێوەیەکی باش هەڵسان ئەمەش بەگەورەترین تفاقی مەعریفی دادەنرێت، کارەکەشیان ماوەی نێوان سالآنی (١٧٥٠-١٧٦٥)ی خەیاند. زانستی دپلۆماتیک قەرزاری هەوڵ وکۆششی ئەم دوو زانایەن لەوەی کە بەدەستیان هێناوە و نوسیویانە لەتێبینی و لێدوان (تعلیقات) لەسەر دەستنوسەکانی کتێبخانەی مەترانیەیی شاری ڕۆن. وە هەروەها تێبینی نوسینی لەسەر پەرتوکی ڕاهیب(ریز Rais) کە لەلێکۆڵینەوە ووردبینکردنی بوونەوە لەساڵی(١٧٤٧). هەروەک کتێبی مێژووی وێژەیی بۆ کۆمەڵگەی کەنیسی سنت مور Saint Maure لەساڵی (١٧٧٠) یان دانا (بگەرێوە بۆ ئینسکلۆپیدیای لارۆس بە فەرەنسی Larrousse du xxe Siecle).

(٦) هنری برسلاو Henry Bresslau: مێژونووسێکی ئەڵمانییە، لەهانۆڤەر لەدایک بووەو وە لەهیلدبرگ مردووە، لەزانکۆی ستراسبۆرگ لەساڵی(١٨٩٠) لەمێژووی سەدەکانی ناوەڕاستی دەست بەکاربووە. وەک زانایەکی پسپۆڕ لەزانستە یاریدەدەرەکان ناوبانگی دەرکردبوو، وە ژمارەیەک دانراوی لەمەڕ مێژوو وئەرشیفی ئەڵمانیا بلاوکردەوە. هەروەها ناویشی نزیکە بەو بلاوکراوە دپلۆماتیەیی کە لێکۆڵینەوەی لەمەڕ مێژووی ئیتاڵیا وئەڵمانیا گرتبوەخۆ وبلاودەکردەوە.

(٧) تیودۆر شیڤالیە دی سیکل (١٨٢٦ – ١٩٠٨ Theodore Chevalier de sickle): ئەم مێژوونووسە ئەڵمانیە لەشاری ئاخن Aken لەدایك بووەو لەمیران Meran مردووە، لەزانکۆی ڤینا وەك مامۆستا دەست بەکاربووە، وەبەشداریکردووە لەنوسینی سفری مەزنی ناسراو بەبەڵگەنامە مێژووییەکانی ئەڵمانی Monumenta germanica Historica. پاشتر لەساڵی(١٨٩٠ – ١٨٩٢) وەك بەرپرسی ئیدارەی پەیمانگای نەمساوی بۆ مێژوو دانراوە ودیاریکراوە. ژمارەیەك دانراوی بایەخداری لەمەڕ زانستی مێژوو ولێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی بەڵگەنامەکان (زانستی دپلۆماتیك) بەپشت بەستن بەبەڵگەنامەکان داناوە (بگەڕێوە بۆ ئینسکلۆپیدیای لارۆس بە زمانی فەرەنسی).

## سەرچاوە:

سالم عبود الالوسي ، علم تحقيق الوثائق المعروف بعلم الدپلوماتيك، بغداد، ص١٧–٢٣.

# ڕۆژانی هەفتە
# هەفتەژمێری کەی دەستپێکردووە؟

ئەحمەد کەسرەوی
و: موسی محەمەد

سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین کە لەئێرانی دێرین دا هەفتەژمێری باوی نەبوو، بەلکو هەر مانگێکیان سی ڕۆژ داناوە وهەر ڕۆژێکیش ناوی جیای خۆی هەبووە، ئەو شێوە ونەریتە لەکتێبەکانی پەهلەوی وزەردەشتی دا کە ئێستا لەبەردەستمان دان دیار وئاشکرایە، بۆنموونە: لەکتێبی (اندرزهای اذربادما روسپندان) کە نوسراوێکی پەهلەوییە ولەچاپدراوە، لەوێدا بەم شێوەیە ناوی ڕۆژەکانی دیاریکردووە، وبۆ هەر ڕۆژێکیش ئەرکێکی دادەنێ.((هورمەزد، بەهمەن، ئوردیبەهیشت، شەهریوەر، ئیسپدارمەذ...)) لە نووسینی ڕێکەوتی ڕووداوە مێژووییەکانیشدا، ڕۆژ ومانگ یان بەو ناوانە نیشاندەدا، بۆ نموونە(تەبەری) مێژوونووس، کە لەساڵی (٣١٠ك/٩٢٢ز) مردووە، لەبارەی کوژرانی خوسرە وپەرویز بەفەرمانی کوڕەکەی شیرویە نوسیویەتی(( کوژرانی ئەو لەمانگی ئازاری ڕۆژی مانگ بووە)) لەبارەی کوشتنی ئەردەشێری کوڕی شیرویە بەفەرمانی شەهر بورازدا دەنوسێ: (( ساڵی دووەم مانگی بەهمەن شەو ورۆژی ئابان بووە)) هەروەها لەبارەی کوشتنی شەهر بوراز بەهۆی

زادان فەڕۆخ نووسیویەتی: ئەو کارە لەئەسفەند مانگ وڕۆژ دیبیدین بووە، وشە وگوزارەکانی (تەبەری)ی جگە لەوەی شێوازی ئێرانییەکان لەئەژمارکردنی ڕۆژ ومانگ نیشان دەدات، ئەو بەڵگەکاریەشی هەیە، کە نەریتی لەمێژینە تاکۆتایی سەردەمی ساسانی بەردەوام بووە وتا ئەو کات نیشانەیەك لەڕیزبەندی هەفتەژمێری وەکو ئەوەی ئەمڕۆ لەئارادا نەبووە.

کەواتە دەبێ ئەوە بزانین ئەو ڕیزبەندیەی هەفتەی ژمێری لەکەیەوە دەستی پێکردوە؟ ڕەنگە هەندێك وەلاّم بدەینەوە و بڵێین(( دوای هاتنی ئیسلام))بووە.

ئەمە وەلاّمێکی ڕاستە، بەلاّم دەبێ چەند پێشەکیەکی بۆ زیاد بکەین.

سەرەتا ڕیزبەندی ئەژمارکردنی هەفتە بەپێی نوسراوەکانی ڕۆژهەلاّتناسانی ڕۆژئاوایی یادگاریی کەلدانیەکان وئاشورییەکانە.

ڕیزبەندی ئەژمارکردنی هەفتە ژماریش هاوکاتە لەگەڵ ئەو پەرەسەندنە ئاینیە، بەلاّم جولەکەکان وەکو لەکتێبی تەورات دا باسی لێوەکراوە ناوبانگێکی جیهانیان بەو ڕیزبەندیە هەفتەژمێریە بەخشیوە وناونیشانێکی ئاینیان بۆ دەستەبەرکردووە.

دواتر ئاینی مەسیحی سەری هەڵدا ولەجیهاندا بلاّوبوەوە وپەرەیسەند وگەیشتە هەموو شوێنێك، کەواتە بنچینەی هەفتەژمێری لەلایەن هەرکەسێك بوبێت، بلاّوبوونەوەی لەسەر ئاستی جیهاندا بەهۆی جوولەکە و(یەهودی) ومەسیحیەکان بووە.

پێشەکی دووەم، کە لەکۆنەوە کە جوولەکەکان نیشتەجێی ئێران بوونە، ڕەنگە ئەو کاتەی کە کۆرش پادشای هەخامەنشی سالّی (٥٣٥ پ.ز)مردووە،

بابلی گرت وئەو جوولەکانەی، کە بوخت ئەلنەسر لەساڵی (٥٦٢ پ.ن) بەدیلی گرتبوون، ڕزگاری کردن ومۆڵەتی پێدان تاکو بگەڕێنەوە شاری خۆیان، هەندێك لەوانە ئێرانیان بەنیشتمانی خۆیان هەڵبژارد وتیایدا ئاکنجی بوون، دیرۆکی ئەسترۆ موردەخای لەتەورات یەکێك لەبەڵگەکانە کە جوولەکە لەسەردەمی هەخامەنیشیدا لەئێران زۆربوونە و، جگە لەوە وەکو دیارە جوولەکە لەوڵاتی ئێران زاراوەی تایبەتی فارسیان هەبووە لەهەمەدان کە زانیاری لەلایەن نووسەر هەیە، خۆی ئەوە دەگەیەنێ کە بیرەوەری سەردەمانێکی کۆنە وئەوە بەڵگەیەکی ترە، کە جوولەکەکان لەسەردەمانێکی زۆر کۆن لەو وڵاتەدا ئاکنجی بوونە. لەسەردەمی ساسانی زانیاری زیاتر هەیە ودەزانرێ کە ئەو کات جوولەکە لەئێران زۆربوونە، بەتایبەت لەشارەکانی هەمەدان وئەسفەهان، لەهەموو شارەکان زیاتر نیشتەجێ بوونە. بێگومان جوولەکەکان ڕیزبەندی هەفتەژمێری خۆیان هەبووە، هەروەکو بۆ کاروباری تری خۆیان زمانی فارسیان بەکارهێناوە بۆ هەفتە وبۆ ڕۆژانی هەفتەش ناوی فارسیان دروست کردووە. لەلایەکی تر مەسیحیەکانیش لەسەردەمی ساسانیەکاندا لەئێران زۆربوونە، کە چیرۆکی ئەوان لەکتێبە مێژووییەکاندا هاتووە، هەرچەندە جارجار پاشاکانی ساسانی ئازاریان داون، بەڵام لەسەردەمی زۆر لەشاکان لەژیانێکی ئاسودە وئازادی دا ژیاون. هەرچۆنێك بێت لەکاروباری ئایینی خۆیاندا ئازادبوونە، ناچار ڕیزبەندی هەفتەیان ڕاگرتووە وڕۆژانی شەممە ویەکشەم لەکەنیسەکان دا کۆدەبوونەوە. جگە لەئەرمەنیەکان، گورجیەکانیش وئەرانیەکان، کە هەرسێکیان لەگەڵ ئێرانیەکاندا، پێکەوە گەلێك پێك دێنن بەیەکەوە لکاون، بەڵام لەسەر ئایینی

مەسیحی بوونە وناچار ڕیزبەندی هەفتە لەنێوانیان ڕەواجی هەبووە. کورتیەکەی ئەوەیە کە چەندین سەدە بەر لەئیسلام ڕیزبەندی هەفتەژمێری لەئێران ناسراوبووە وڕەواجی هەبووە.

دەستەیەك لەئێرانیەکان بەرگری وپارێزیان لێکردوە، هەرچەندە پاشاکان ودەستەیەکی زۆرینەی خەڵکەکە زەردەشتی بوون، پابەندی ئەو ڕیزبەندیە نەبوونە وخۆیان ڕیزبەندی تایبەت بەخۆیانیان بۆ ئەژمارکردنی ڕۆژان هەبووە، تا ئەو کات کە ئیسلام سەری هەڵدا وعەرەبەکان گەیشتنە ئێران. لەبەرئەوەی ئەوان ڕیزبەندی هەفتەژمێریان بەکاردەهێنا بۆ نوێژی هەینی، کە گرنگی زۆری لەئایینی ئیسلام هەبووە، بۆیە گرنگی زۆریان بەهەفتەکان دەدا، لەبەرئەوەی کە ڕیزبەندی زیاتر ڕەواجی پەیداکرد ودواتریش هەرچی ئایینی ئیسلام زیاتر پەرەیسەند وبڵاوبوەوە ژمارەی موسڵمانان زۆرتربوو. بەهەمان ڕادە وئەندازە ڕیزبەندی ڕۆژمێری پێشووی بەتەواوی نەهێشتەوە.

کەواتە ڕیزبەندی هەفتەژمێری لەئێران چەندەها سەدە پێش ئیسلام هەبووە، بەڵام لەسەدەکانی ئیسلامیدا زیاتر پەریسەند و وردە وردە بووە ڕیزبەندێکی گشتی.

### (شەممە) چ پەیڤێکە و مانای چییە؟

لەعیبریدا کە زمانی جوولەکەیە ناوی شەممە (شبت) یا (شبات) ماناکەی وەکو نووسیویانە بریتییە لە(ئاسودەیی)، چونکە ئەو ڕۆژە بۆ پشوودان وئاسوودە بوون دانراوە. هەر ئەو پەیڤە ولەزمانی ئەرمەنی دا(شاپات)ە، کە مانای (شەممە) و (هەفتە)یە وبۆ هەردوکیان بەکاردێت لەزمانی فارسیشدا ئەو پەیڤەیان وەرگرتووە، بەڵام پێش پیتی (باء)و پیتی (کاف)، (نون)ێك بۆ

هەندێك واژە زیاد کراوە[1].

باشترین نمونە واژەی (تەنباکۆ)یە، کە لە(تاباکۆ)ی ئەوروپییەکان[2] وەرگیراوە ولەجیاتی (تەباکۆ) پێیان گوتووە (تەنباکۆ)، دواتریش (نون)ی پێش (با) زیادکراوە وکردویانە بە(تەنباکۆ) بۆ (شبت) نون زیاد کراوە و(شنبت)یان لێ دروست کردووە ڕەنگە سەردەمانێکی دوور ودرێژ ئەو واژەیە بەو شێوە بەکارهێنرابێ، بەڵام چونکە (تاء) لە سەردەمی ساسانی لەزۆر ووشەدا بونەتە (ذال) ئەو (شنبت)ەش، بۆتە (شنبذ). هەروەکو لە هەندێك شوێن دا ئێستاش هەر بە (شنبذ)[3] بەکاردەبرێت. بەڵام لە زمانی خەڵکی شار ونوسراوەکاندا بۆتە (شنبە)[4]. کورتیەکەی (شنبە) هەمان واژەی (شەبەت)ی عیبرییە، کە جوولەکە ومەسیحییەکان لە ئێراندا ناساندیان، کە لەزمانی فارسیدا نییە کە (شەبەت)ی عیبری بەکارهێنراوە، هەفتەژمێری چوبێتە هەر شوێنێك ئەو واژەیەی لەگەڵ خۆیدا بردوە، هەر وەکو ئێمە لەزمانەکانی ڕوسی وئینگلیزی وفەرەنسی وئەڵمانیدا دەیبینین[5]. هەروەها لەعەرەبیشدا ووشەی (السبت) بۆ شەممە، وەرگێڕانی هەمان واژەیە. دوای ئەوەی کە مانای شەممەیان باس کرد مانای (یەکشەممە- دووشەممە- سێشەممە-چوارشەممە- پێنجشەممە) خۆی لە خۆیدا بە دیار دەکەوێ، لەبەرئەوەی جوولەکەکان ومەسیحییەکان تەنیا گرنگیان بەڕۆژی شەممە داوە وئەو ڕۆژەیان هەڵبژاردووە، ڕۆژانی تریشیان بەلاوە ئاسایی بووە. بۆیە بۆ ڕۆژانی تر ناوێکیان دانەناوە، بەڵام هەندێك جار ناچار بوونە ناوی ئەم ڕۆژانە ببەن بەوە لێگەڕاون، کە ئەوان بەهۆی نزیك ودووربونیان لەشەممە دەردەبڕن[6].بنچینەی یا ڕیشەی واژەی یەکشەممە (یەك لەدوای شەممە)بوو

بوو بێت کە دواتر بۆتە (یەك لەشەممە) پاشان بووە بەیەکشەمبە وەهەرچۆنێك بێت ئەو ڕیزبەندییە لەلایەن جوولەکەوەیە ولەزمانی ئەوانەوە ڕاگەیشتۆتە زمانەکانی تریش هەر وەکو ئێمە جگە لەزمانی فارسی زمانەکانی عەرەبی، ئاشوری، ئەرمەنی، پێدەزانین، کە ڕۆژانی هەفتەیان بەو شێوەیە ڕیزبەندی کردووە. بەلاّم لەزمانە ئەوروپیەکاندا هەر ڕۆژە وبۆ خۆی ناوی جیای هەیە. گوایە دەستەیەك لەخەڵکی دێرین، کە لەسەر ئاینی ئەستێرەپەرستی بوونە، ڕۆژەکانیان لەنێوان هەفت ئەستێرە گەڕۆکەکاندا دابەشکردوون وهەر ڕۆژێکیان تایبەت بۆ یەکێك لەو ئەستێرانە داناوە وبەناوی ئەو ئەستێرەیەوە نراوە ولەوانەشە کە ناوەکانی هەفتانەی هەفت ڕۆژ کەوتۆتە سەر زمانی ئەوروپایی. بۆ نمونە تەنیا ناوەکانی زمانی فەرەنسی دێنینەوە.

– دوو شەممە (Lundi) ڕۆژی مانگ. – سێشەممە (Mardi) ڕۆژی بەهرام (تیر). – چوارشەممە (Mereedi) ڕۆژی تیر (عەتارد). – پێنج شەممە (Jevdi) ڕۆژی برجیس (مشتەری). – ئادینە (Rendredi) ڕۆژی ناهیدە (زوهرە)[٧].

شەممەش بەناوی کەیوان (زوحەل) گۆڕاوە و(samedi)ی پێگوتراوە ونوسیوومانە کە مانای (ڕۆژی سبت)ە. یەکشەممە بەهۆکاری کە دواتر دەینووسین پێیدەڵێن(dimanche) ماناکەی ناوی ڕۆژی خودا[٨]. دەگەیەنێ بۆ وەبیرهێنانەوە دەبێ ئەو خاڵەش ئامازە پێبدەین مەسیحییەکان وا دەزانن مەسیح ڕۆژی یەکشەممە لەنێو خەڵکیە ورادەبێ

وەدەچێتە ئاسمان لەبەرئەوە ئەو ڕۆژە بە(کوریاکی) ناونراوە کە ماناکەی بە گریکی (خودایی)یە.

بەمانایەکی تر ئەو ڕۆژەیان لەڕۆژانی خودا داناوە وبەناوی ئەویش ناوی دەنێن. ئەو پەیڤە کەوتۆتە سەر زمانی ئەرمەنیش، کە ئەرمەنیەکان لەجیاتی یەکشەم (گێراگی) یا (گوراگی) بەکاردێنین، هەروەها ئارانیەکان (خەڵکی ئەران)، ئەو بەشە لەقەفقاز کە ئێستا بەناوی ئازەربێجان ناوی دێنین، کە لەسەر ئایینی مەسیحیەت بوونە، بەڵام زمانیان لقێك بووە لەزمانی فارسی، ئەو واژەیان لەنێو زمانی خۆیان هەبووە. (ئوستەخری) داستانێکی نووسیوە کە لەسەردەمی ئەودا لەدەرەوەی (بەردەع) (کورسی کۆنی ئەڕان) یەکشەممەدا بازاڕێکیان داناوە وپێیانگوتوە (گراگی بازان)[9]. هەروەها لاهیجان کە گروپێکن لەئەرانیە کۆنەکان، ئێستاش زمانی خۆیان پاراستوە ڕۆژانی هەفتە بەوشێوەیە دەژمێرن: (شمبی، گراگی، دوشمبی، سێ شەمبی، چهار شەمبی، پینجشەمبی، ارانە– ادینە–).

ئەوەش بەڵگەیەکی ترە بۆ ئەوەی کەوا (گراگی) لەنێوان ئارانیەکانیشدا ناسرابوو ولەشوێنی یەکشەممە بەکارهاتووە. گوایە لەلایەن ئارانیەکان[10] بوو وەك کە ئەو پەیڤە گەیشتۆتە ئازەربێجان ڕەنگە لەئازەریشدا کە زمانی کۆنی ئەوێیە لەشوێنی یەکشەممە(گراگی)یان بەکارهێنابێ چونکە نیشانەکانی لەناو ئاوایی ولادێکاندا دەبینین. لەوانە شوێنێك لەچەند کیلۆمەتری تەورێز هەیە بەناوی (گراگی بازار) ناسراوە، کە هەندێك ئەو پەیڤەیان بەتورکی داناوە و(قار قار بازاڕیان)ناو ناوە.

## (ئادینە) بە چ مانایکە؟

لەبارەی ڕۆژی هەینی ئەوەی کە لەفارسیدا (ئادینە)ی پێدەڵێن لەفەرهەنگی(ناصری)دا نوسراوە کە ئێرانیەکان (شش شنبە)یان پێ دەگووت، بەڵام کاتێ ئیسلام دەستی بەسەر ئێران دا گرت عەرەبەکان (جومعە) یان (یوم الزینە)یان ناونا، لەفارسیشدا کە لەڕیشەی (ئازین) بەمانای خەملاندن وڕازاندنەوەیە ناوی ئادینەیان دروست کرد.

ئەو واتایە نزیکە لەڕاستی، بەڵام تاکو بەڵگەیەك لەبەردەست نەبێ تەنیا وەك گریمانە سەیری دەکەین. ئەوەی سەرەوە باسێکی بچووك بوو، لەهەفتەژمێری، بەڵام ئێمە لەبارەی ساڵنامە وکات وسەردەم ژمێرییەوە باسێکی ترمان هەیە، کە نەختێك لێرەدا دەیهێنینەوە وباسی دەکەین:

ئێمە دەڵێین ئەو (هەفتە) و(مانگ)ە چونکە هیچ پایەکیان لە سوڕاندنەوە وخولانەوەدا نییە، دەبێ نەمێنن.

(هەفتە) هەر وەکو نووسیومانە داهێنانێکی جوولەکانە وئەوانیش لەکلدانیەکان وەریانگرتووە. هەرچۆنێك بێت بنچینەکەی بریتی بووە لەئەستێرەپەرستی کلدانیەکان. هەر ڕۆژێکیان بەناوی یەکێك لەئەستێرە گەڕۆکەکان زانیوە وپەرستویانە، بەپێچەوانە لەسوڕاندنی زەوی وهاتن وچوونی شەوان وڕۆژان (بەشێك هەفت ڕۆژە) نییە ونەبووە. بەڵام مانگ سی ڕۆژە بووە، ئەوە کاتێك بووە کە خەڵك پەیڕەویان لەسوڕاندنەوەی مانگ کردووە وساڵی کۆچییان بەکارهێناوە، ئێستاش، کە ئێمە ئەوەمان وەلاناوە، دەبێ لەژمارکردنی مانگ چاوپۆشی بکەین. ڕاسترین وسادەترین ڕێگە ئەوەی کە ساڵ بەبەهار دەست پێبکەین وبەچوار بەش دابەشی

سەر(بەهار،هاوین، پایز، زستان)ی بکەین وهەر بەشێکی لەیەکەوە بژمێرین تاکو ئەوەد بچینە پێش ولەجیاتی هەینی هەر دە ڕۆژ جارێك بکەینە پشووی فەرمی.

## پەراوێزەکان:

(1) ئەو _ن) باسێکی دوور ودرێژی هەیە، هەروەکو لەسەردەمی هەخامنشینی دا بوو ناوی (کەهوجی) یان بە (کەنبوجی)گۆڕیوە، هەروەها لەپەیڤی سێیەم ودووەم هەمان (ن) سمبوورەم دەبێ.

(2) گوایە یەکەمجار ئەو واژەیە لەزمانی ئیتالی لەئێران بیستراوە، کە زیاتر لەشێوەی ئیتالی بڵاوبۆتەوە.

(3) (شنبذ( یا (شنبە) لەشیعرەکانیش دا هاتووە وەکو لەفەرهەنگی (ناصری)دا شیعرێك لە(مەنوچەهری)یەوە بەو شێوەیە:

بفاك نيك و روز مبارك شنبذ نبيذ گير ومده روزگار خويش بيذ

شەممە ڕۆژێکی موبارەك وپیرۆزە وبژاردەیە، بۆ شادی وکەیفە، لەو ڕۆژەدا شەراب بنۆشە و ڕۆژگاری خۆت ناخۆش مەکە.

(4) چۆنیەتی کەوتنی (ذال) لەکۆتایی ئەو واژە روون نییە، دەتوانرێ گومان بکرێ کەسانێك (تا)ی (شنبت) یان بەکاف گۆڕیوە و(شنبك) یان پێگوتووە، دواتر کاف بۆ(ها)گۆڕاوە.

(5) لەفەرەنسا جگە لەوەی کە لەتەورات وئینجیل واژەی Sabot بەکاردێت خۆە واژەی Samedi لە بنەچەSobbtaidies بووە کە مانای ڕۆژی شبت لەئەڵمانی هەمان تەرتیبی نزیك ڕوویداوە. لەئینگلیزی واژەی sabboth لەڕووسی پەیڤی یوبوتاybbota بەکاردێت لەزمانەکانی تری ئەوروپای واژەی (شبت) بەچەند شێواز بەکارهێنراوە.

(6) لەئینجیلی مەتا بتەوێت ناوی یەکشەممە بهێنی بەناوی یەکەمین هەفتە ناودەنێن، لێرەدا بەدیاردەکەوێ کە تا ئەو کات ڕۆژەکان ناویان نەبووە.

(7) لەعەرەبیدا دەڵێن (الاحد، الاثنین، الثلاثاء، الاربعاء، الخمیس، الجمعة، السبت).

(8) لەبەر نزیکی زمانی ئینگلیزی لەبنەڕەت دا، ناوی ئەم ڕۆژە (ڕۆژی هەتاو)بووە.

(9) نوسەخری وا تێگەیشتووە کە (گیراگی) ناوی شوێنی ئەو بازاڕەیە کە ئەو بۆچوونە ڕاست نییە وبۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ کتێبی (شهرها ودیهها) لە نوسینی دانەرەکە لەچاپ دراوە.

(10) پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین وشایەنی گوتنە، کە لەئاران دا جگە لەئەرمەنیەکان، وەکو هەرێم وشوێنی کوردی شەدادی بووە، کە لەسەدەی چوارەمی کۆچی/دەیەمی زاینی دا توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ وگرنگترین میرنشینی کوردی لەوێ پێك بهێنێ. بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بگەڕێوە بۆ: ئەحمەد کەسرەوی: شهریاران گمنام، اسماعیل شوکر: الشدادیون فی بلاد اران(٣٤٠ك/٩٥١ز- ٥٩٥ك/١٠٩٨ز) نامەیەکی بلاونەکراوەیە، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلێژی ئەدەبیات، هەولێر، ١٩٩٤ز.؛ نیشتمان بشیر: کورد و سەلجوقییەکان، وەرگێڕانی: ئیدریس عەبدوللا، بلاوکراوەی موکریانی، ٢٠٠٦، هەولێر(وەرگێڕ)

# دادگاییکردنی کتێبی

# "لە شیعری جاهیلی" یان دادگاییکرنی تەها حوسێن؟

ن: جیهاد فاضل
و: د. محمد

ئەگەر کتێبی عەلی عەبدولڕەزاق(( ئیسلام وبنەماکانی فەرمانڕەوایی)) هەرایەکی ڕاگەیاندن وسیاسی لەمیسر لەبیستەکان نابێتەوە، ئەوا کتێبی دکتۆر تەها حوسێن "لەشیعری جاهیلی" بووە مایەی بوومەلەرزەیەك بۆ چەمکەکان وپەرلەمان وتەنانەت شەقامیش. شەش ساڵ مەسەلەکە لەدادگاکاندا مایەوە وبەوە کۆتایی هات کە تەها حوسێن لەڕاگرایەتی کۆلێژی ئاداب دەرکرا.

لەساڵی١٩٢٦ دکتۆر تەها حوسێن لەتەمەنی سی‌وحەوت ساڵی دابوو، ومامۆستای ئەدەبی عەرەبی لەزانکۆی میسری بوو. ئەمە لەکاتێکدا کە کتێبەکەی "لەشیعری جاهیلی" دەرکرد، وگەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە شیعری جاهیلی لەڕاستیدا دروستکراوە، ناکرێ کە ژیانی ئاینی وسیاسی. عەقلی وئابوری سەردەمەکەی بنوێنێ. وزمانی حیمیری کە لەباشوردا باوبوو، وزمانی عەدنانی بەشێوەزارە لەیەکتری جیاوازەکانی کە لەباکوردا باوبوون،

بەشێوەیەکی ڕاستگۆیانە لەشیعری عەرەبیدا نەنوێندراون، لەبەرئەوەی ئاین وشعوبیەت وسیاسەت وجیاوازی گێڕەوەکان بووە مایەی دروستکردنی شیعر.

تەها حوسێن حیسابی ئەوەی نەکردبوو کە ئەم کتێبە قیامەتی بۆ سازدەکرێ، ومەسەلەکە دەبێتە مایەی گرنگی پێدانی کۆشکی شاهانە وحکومەت ودادگا، وڕای گشتی لەمیسر وجیهانی عەرەبی، بۆ ماوەی شەش ساڵی بەدوای یەکتری داهاتوو بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی فەرمی بەبەیانێکی کورت کۆتایی پێ بێت، کە ئیسماعیل سدقی پاشای سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران خۆی لە٢٠ی ئاداری١٩٣٢ بۆ نوێنەری ڕۆژنامەکانی خوێندەوە، ئەمەش دوای تەواوبوونی ئەنجومەنی وەزیران لەگوێبیست بوون لەڕاپۆرتی وەزیری مەعاریفی گشتی:

(( ئەنجومەنی وەزیران بڕیاریدا کە مامۆستا تەها حوسێن ئەفەندی فەرمانبەر لەوەزارەتی مەعاریفی گشتی، لەخزمەتی حکومەت لەسەر کار لابدات)).

لەنێوان دەرچوونی کتێبەکە لەساڵی ١٩٢٦ ودەرچوونی بڕیاری ئەنجومەنی وەزیرانی میسری لە ٢٠ی ئاداری میسر یەکێك لەمەترسیدارترین مەسەلە لەمەسەلەکانی فیکر لەمێژووی هاوچەرخی بەخۆوەبینی، مەسەلەیەك کە شوێنەوار وپاشماوەی لەسەر چەندین ئاستدا بەجێ هێشت، کە تاکو ئێستاش لەسەر نووکی قەڵەمی لێکۆڵەران دووبارە دەکرێتەوە، وەکو نیشانەیەکی ڕووناکی بەخش لەژیاری تەها حوسێن وفیکری عەرەبی بەتێڕوانینی هەندێك، و وەکو خراپیەك کە سەرزەنشت کردن پێویست دەکات لەتێڕوانینی هەندەکەی تردا. مەسەلەکە بەشێوەیەکی فەرمی بەبڕیارێك دەستی پێکرد کە سەرۆکی نیابەتی میسر دەریکرد:(( ئێمە موحەمەد نور

سەرۆکی نیابەی میسر لەو ڕووەوەی کە بەمێژووی ٣٠ی مایوی ١٩٢٦ شێخ خەلیل حەسەنین قوتابی بەشی باڵا لەئەزهەر شکاتی لەلای بەڕێز نائیبی گشتی کردووە وتیایدا دکتۆر تەها حوسێن، مامۆستا لەزانکۆی میسری تاوانبار دەکات بەوەی کە کتێبێکی نوسیوە وناوی ناوە (لەشیعری جاهیلی) وبڵاوی کردۆتەوە بۆ خەڵکی ولەم کتێبەدا تانە وتەشەرێکی ئاشکرا بەقورئانی مەزن هەیە.

لەقسەی شکاتکارەکان وا بەدیاردەکەوێت کە ئەوان ئەوە دەدەنە پاڵ دانەر کە لەچوار شوێنی کتێبەکەی تانە وتەشەری لەئاینی ئیسلامداوە:

یەکەم: دانەر سوکایەتی بەئاینی ئیسلام کردووە ئەمەش بەدرۆخستنەوەی قورئان لەهەواڵەکانی سەبارەت بەئیبراهیم وئیسماعیل، کاتێك نوسیبووی کە ((تەورات بۆی هەیە باسی ئیبراهیم وئیسماعیلمان بۆ بکات، قورئانیش بۆی هەیە باسیانمان بۆ بکات، بەڵام هاتنی ئەم دوو ناوە لەتەورات وقورئاندا بەس نییە بۆ سەلماندنی بوونی مێژووییان، ئەمە سەرەڕای سەلماندنی ئەو چیرۆکەی باسی کۆچکردنی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم بۆ مەککە وپەیدابوونی عەرەبی بەعەرەب بوو تیایدا دەکات، ئێمە ناچارین واببینین کە جۆرێك لەفێڵ لەم چیرۆکەدا هەیە لەسەلماندنی پەیوەست بوون لەنێوان جوو وقورئان وتەورات لەلایەکی تر)) تاکو کۆتایی ئەوەی لەم ڕووەوە هاتووە.

دووەم: باسکردنی حەوت خوێندنەوەکە کە لەلایەن موسڵمانان کۆك بوون لەسەری هەیە وسەلمێندراوە، ئەو باسکردنی بانگەشەی ئەوە دەکات کە لەلایەن خوداوە دابەزیوە، ئەو خوێندنەوانە بەگوێرەی توانای خوێندنەوەی عەرەب بووە نەك خودا بۆ پێغەمبەرەکەی سروش کردبێ، ئەمە لەگەڵ

ئەوەی سەرجەم موسڵمانەکان پێیان وایە کە هەموو ئەو خوێندنەوانە لەسەر زاری پێغەمبەر(د.خ) لەخوداوە گێڕدراونەتەوە.
سێیەم: ئەوە دەخەنە پاڵ دانەر کە لەکتێبەکەیدا بەشێوەیەکی ناشیرین تانە وتەشەری لەپێغەمبەر(د.خ) داوە لەڕووی ڕەسەنیەوە ئەوەتا نوسیویەتی:(( جۆرێکی تر لەکاریگەری ئاین لەدروستکردنی شیعر وخستنەپاڵی جاهیلییەکان پەیوەستە بەمەزنکردنی پایەی پێغەمبەر لەلایەنی خێزانەکەی وگێڕانەوەی بۆ قورەیش، بۆ کارێك لەکارەکان خەڵك قەناعەتی بەوە هێنا کە پێغەمبەر دەبێ لەسەر سەفەوەی بەنی هاشم بێ وبەنی هاشم دەبێ لەسەر سەفەوەی بەنی عبدولمەناف وبەنی عەبدولمەناف دەبێ لەسەر سەفەوەی بەنی قوسەی بن، وقوسەی دەبێ لەسەر سەفەوەی قورەیش بن، وقورەیش لەسەر سەفەوەی مەزەر بن ومەزەر لەسەر سەفەوەی عەدنان بن، وعەدنان لەسەر سەفەوەی عەرەب بن وعەرەب لەسەر سەفەوەی هەموو مرۆڤایەتی بن)) وتیان کە دەستدرێژیکردنی دانەر بۆ سەر ڕەسەنی پێغەمبەر وکەمکردنەوەی پایەی ودەستدرێژکردنە سەر ئاین کەتنێکی گەورەیە وخراپەیە کە بەرامبەر موسڵمانان وئیسلام، ئەو بوێری کردووە لەخۆ لەکاریکدان کە کافرێك یان هاوتا پەیکەرێك بۆ خودا پێش ئەوە نەیکردبێ.
چوارەم: دانەر ئەوەی ڕەتکردەوە کە ئیسلام بەرایی لەووڵاتانی عەرەبدا هەبێت وئاینی ئیبراهیم بێت ئەوەتا دەڵێ: (( هەرچی موسڵمانەکانن ئەوە ویستیان ئەوە بسەلمێنن کە ئیسلام بەرایی بوونی لەولاتی عەرەباندا هەبووە ئەوەش پێش ئەوە بووە کە پێغەمبەر بنێردرێ وکورتە وسەفەوەی ئاینی ئیسلام کورتەی ئەو ئاینە هەقە بوو کە خودا بەسروش وپێشتر بۆ

پێغەمبەرانی ناردبوو، تاکو ئەوەی ووتی(( لەکاتی سەرهەڵدانی ئیسلام ولەدواییدا ئەو بیرۆکەیە باویبوو کە ئیسلام ئاینی پێغەمبەر ئیبراهیم نوێ دەکاتەوە لێرەوەش دەستیان پێکرد کەوا بزانن ئەم ئاینەی ئیبراهیم لەسەردەمێك لەسەردەمەکان ئاینی عەرەب بوو ئینجا پشتیان تێکرد بەهۆی سەر لێشێواندنیان لەلایەن سەرلێشێوێنەرەکان وروویان کردە بت پەرستی)) تاکو کۆتایی ئەوەی لەبارەی ئەو بابەتەوە باسی کرد.

هەرچی دکتۆر تەها حوسێن ئەوە وادیاربوو نەیدەویست ((بەو ڕادەیە بابەتەکە فراوان بکات)) تا ئەو ئاستەی کە دژەکانی خستبوویانە پاڵی، سەرجەم ئەوەی کە ئەو ویستبووی لەکتێبەکەیدا بیسەلمێنێ ئەوە بوو کە(( زۆربەی هەرە زۆری ئەوەی بەناوی ئەدەبی جاهیلی ناوی دەنێن، هیچ پەیوەندییەکی بەجاهیلیەتەوە نییە، بەڵکو لەدوای پەیدابوونی ئیسلام دروستکراوە، ئەوە ئیسلامییە ژیانی موسڵمانان وئارەزووەکانیان دەنوێنێ زیاتر لەوەی ژیانی جاهیلییەکان بنوێنێ. ئەوەندە نییە کە گومان لەوە بکەم کە لەئەدەبی جاهیلی ڕاستەقینە ماوەتەوە زۆر کەمە هیچ شتێك نانوێنێ ودەلالەت لەهیچ شتێك ناکات وناکرێ پشتی پێ ببەسترێ بەمەبەستی دەرهێنانی وێنەی ئەدەبی ڕاستەقینەی ئەو سەردەمە جاهیلیە)).

بێگومان تەها حوسێن پێشبینی (( ئەنجامە مەترسیدارەکانی ئەو تیورەی دەکرد))، بەڵام ئەوە زیاد دەکات لەگەڵ ئەوەشدا دوو دڵنیم لەسەلماندنی وبڵاوکردنەوەی)). وا دیارە شێوازی لە لێکۆڵینەوە بووە مایەی ووروژاندنی دژەکانی زیاتر لەوەی کە تێبینی ئاینییە تێیەڕەکان لەکتێبەکەدا ووروژاندویانە، ئەوەی وەکو هەندێ لەڕەخنەگران دەڵێن زیاتر نەبوو لە(( تان

وپۆی ئەو دەرئەنجامەی پلە دووانەی)) کە لەکۆتاییدا پێیگەیشت.

شێوازی تەها حوسێن لەکتێبەکەیەدا شێوازێکی ئەوروپی بوو کە لەمیسردا نەناسرابوو، وە نەباو بوو. ڕێبازێکی زانستی بوو لەسەر بنەمای گومان کردن بنیات نرابوو لەپێناو گەیشتن بەیەقین. وتەها حوسێن بەکاری هێنا دەستی کرد بەگومان کردن لەبڕیارە پێشووەکان کە لەسەر شیعری جاهیلی دەرچوو بوون (هەندێکی کەلەپوری عەرەبی کۆنن) وتوێکڵی زەمەنی لەسەر لادا وخستیە بەردەم ڕووناکی، ئینجا لەژێر ڕۆشنایی ڕۆشنبیریی سەردەمیانە گەشەکردوو نویێ بووەکەی دووبارە سەیری کردەوە، ئەوە لەکتێبەکەی رایدەگەیەنێ (( لەوانەیە هەق بێ من حەز بکەم بیربکەمەوە، وحەزبکەم کە لێکۆڵینەوە بکەم وحەزبکەم ئەوەی دوای لێکۆڵینەوە وبیرکردنەوە پێیگەیشتووم، بەخەڵکی بگەیەنم، ورقم لەوە نابێتەوە کە پشکی خۆم لەڕای بوونی خەڵك یان تورەبونیان لێم وەربگرم لەکاتێکدا کە ئەوەیان پێ ڕادەگەیەنم کە حەزیان لێیەتی یان ڕقیان لێدەبێتەوە. ئێمە لەنێوان دووشت داین: یاخود بەئەوە لەئەدەب ومێژوو ڕازی بین کە کۆنەکان دەربارەی وتوویانە، تەنها ئەوەندە ڕەخنەی لێ بگرین کە لەهەموو لێکۆڵینەوەیەك بەدەرە، یاخود ئەوەی کە زانستی پێشینانمان هەمووی بخەینە بەردەم لێکۆڵینەوە. لەیادم کرد. نامەوێ بڵێم لێکۆڵینەوە، بەڵکو دەمەوێ بڵێم گومان کردن. دەمەوێ هیچ شتێك قبوڵ نەکەم کە پێشینان دەربارەی ئەدەب یان مێژوو ووتویانە، تەنها لەدوای لێکۆڵینەوە وچەسپاندن بێ، ئەگەر بە یەقین کۆتاییان پێبێنێ ئەوە لەوانەیە بەوا زانین کۆتاییان پێ بێت.

بەم شێوازە لەبیرکردنەوە تەها حوسێن چووە لای شیعری جاهیلی

ببیشکنێ

. ئەو دەیەوێ کە (( وا پێشوازی لەو ئەدەب ومێژوو بکەین کە خۆمان دابڕانین لەهەموو ئەوانەی لەپێشتر سەبارەتیان ووتراوە، وخۆمان ڕزگارکردبێ لەهەموو کۆت وبەندە قورسەکان کە لەدەوری دەست وقاچ وسەرمانە. وهەروەها دەبنە ڕێگر لەنێوانمان ولەنێوان بزوتنەوەی ئازادی لەشدا)).

تەها حوسێن ئەم کتێبەی دەرکرد وئینجا کۆچی کرد بۆ فەرەنسا بۆ ئەوەی پشووی هاوینی تیادا بباتەسەر. وپێش چوونی کە لەئیتالیا بوو بروسکەیەکی کورتی ترسناك ڕووبەڕووی بووە، وە کە موحەممەد مەرسفی هاورێی بۆی ناردبوو تیایدا هاتبوو:

(( دوا کتێبت خرایە بەردەم پەرلەمان، پەرلەمان گفتوگۆی لەسەر دەرکردنت لەزانکۆدا کرد، سەرۆك وەزیران هەڕەشەی دەست لەکارکێشانەوەی کرد، سەعد زەغلول هاتە ناو بابەتەکەوە، بابەتە خرایە بەردەم نیابەتی گشتی، نیابەت داوات دەکات بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەت لەگەڵدا بکات، تکایە یەکسەر ئامادە ببە)).

لە ئامادەنەبوونی تەها حسێن لەئەوروپا، خۆپیشاندانێکی گەورە سازکرا قوتابیانی زانکۆی ئەزهەر بەشدارییان تیادا کرد ورووی کردە ماڵی سەعد زەغلول. لەخانەی میللەت چوونە لای سەعد زەغلول وەکو سەرۆکی پارتی زۆرینە لەپەرلەمان پارتی وەفد داوایان لێکرد کە ڕێوشوێنی دژ بە تەها حوسێن بگرێتەبەر.

شا فوئاد هاتە ناو مەسەلەکە وداوای کرد کە ئەنجومەنی نوێنەران سزاییەکی توند دژی تەها حوسێن بگرێتەبەر، وماوەیەکی درێژ گفتوگۆیەکان

لەپەرلەماندا بەردەوام بوون.

ئەنجومەنی زانکۆی میسری کۆبونەوەیەکی تایبەتی بەست بەبۆنەی داوایەك کە زاناکانی ئەزهەر خستبوویانە ڕوو وتیایدا داوای ئەوەیان کردبوو دەست بەسەر کتێبی (لەشیعری جاهیلی) دا بگیرێ ودکتۆر تەها حوسێن لەزانکۆ دووربخرێتەوە وبخرێتە بەردەم دادگا، کۆبوونەوەکە چوار کاتژمێری خایاند بەوە کۆتایی پێهات کە بڕیارێك دەرچوو بەڕێوبەری زانکۆ لوتفی سەید دەبوایە مەسەلەی دکتۆر تەها حوسێن لەگەڵ دەسەڵاتدارە پەیوەندیدیدارەکان چارەسەر بکا، بەو مەرجەی لەبنەما بنەڕەتییەکانی خوێندنی زانکۆیی وشەرفی زانستی دەستەی فەرمانبەرانی خوێندن لەزانکۆ ڕەچاو بکات)).

لوتفی سەید دەستی کرد بەپەیوەندی کردنەکانی لەگەڵ دەسەڵاتدارە پەیوەندی دارەکان" شا وسەرۆك وەزیران وپەرلەمان ئەنجامبدات.

لەپەرلەمان خرۆشانێکی توند دژی کافر، وزەندیق، هەبوو، وەزیری مەعاریفی ئەو ڕۆژانە، عەلی شەمسی پاشا، هیچ وەلامێکی نەبوو بیلێ بێ جگە لە: (( ئێمە بە هیوای ئەوەین کە زانکۆ ببێتە جێگایەکی کراوە بۆ لێکۆلینەوەی زانستی ڕاست)) بەلام خرۆشانەکە بەردەوام دەبوو.

تەنگژەکە فراوانتر بوو، فەرمانڕەوایی نهێنی میسری ئەو ڕۆژانە بالیۆزی بەریتانی هاتە ناو مەسەلەکە.

عەبدولخالق سەروەت پاشای سەرۆك وەزیران لەناکاودا لەڕۆژێکدا بینی کە سەفیری بەریتانی دێت نوسینگەی و پێی دەلێی: ئەوە مەسەلەی تەها حوسێن چییە؟ سالی ڕابردوو مەسەلەی عەلی عەبدولڕەزاق بوو ئەو سالەش

مەسەلەیەکی تر تەها حوسێن. دەبێ چارەسەرێك بدۆزنەوە.. چارەسەریش بەڕای هەردووکیان خڕکردنەوەی بابەتەکە بوو، ولەکۆتاییدا تەها حوسێن لەبەردەم خەڵکیدا نەکرێ بە پاڵەوان.

سەرۆك وەزیران چووە ئەنجومەنی نوێنەران بۆ ئەوەی مەسەلەکە بەخۆشی چارەسەر بکات. بەڵام بۆی دەرکەوت کە ئۆپۆزسیۆن بەهێزبووە وداواییان لەئەنجومەنی نوێنەران کردووە کە پێشنیاری ئەوە بۆ حکومەت بکات کە ئەو ڕێوشوێنانەی خوارەوە بگرێتەبەر:

یەکەمین: دەست بەسەرداگرتن وفەوتاندنی کتێبی لەشیعری جاهیلی تەهاحوسێن.

دووەمین: نیابەتی گشتی ئەوەی پێ بسپێردرێ داوایەك دژی دانەری کتێبەکە بەرزبکاتەوە

سێیەمین: هەڵوەشاندنەوەی وەزیفەکەی لەزانکۆ، ئەمەش بەڕازی نەبوونی بەوەی کە بۆی داندرابوو.

ڕووداوەکان وا دەڵێن کە کاتێك عەلی شەمسی پاشای وەزیری مەعاریف ووتی کە وەزارەت ڕێگرنییە لەبەردەم فەوتاندنی کتێبەکە، ئۆپۆزسیۆن هێورنەبووەوە. نوێنەرانی ئۆپۆزسیۆن داواییان کرد کە تەها حوسێن وەزیفەکەی لەزانکۆ دەربکرێ. لەم ساتەدا سەرۆك وەزیران ووتی ئەگەر ئۆپۆزسیۆن سووربێ لەسەر ئەم داوایەی ئەوا وەزارەت متمانەی خۆی لێ دەسێنێتەوە...لەو کاتەدا سەعد زەغلول پاشا سەرۆکی پارتی وەفد هاتە ناو مەسەلەکە لەوکاتەدا پارتی وەفد پارتی زۆرینەی بوو، وەزارەتەکەشی تێهەڵکێش بوو لەپارتی وەفد وئازادنی دەستوری سەعد داوای لەئەندامانی

وەفــدی لەوەزارەتەکــەی کــرد کــە ڕازی نــەبن بەمەســەلەی متمانــە خستنەڕوو. وتەها حوسێن بەردەوام بوو لەکارکردنی لەزانکۆدا.

وەکو مەسەلەیەکی گەرمیش لەبەردەم پ.لەمان ورای گشتی بەردەوام بوو. لەدانیشتنی ١٢ی سیپتەمبەری ساڵی ١٩٢٦ نوێنەران هێرشێکی توندیان کردە سەر وەزیران بەهۆی(( بێ دەنگی بەرامبەر بەو کوفرو بێ باوەڕییە کە ئەو پیاوە تەهاحوسێن دەیخاتە مێشکی گەنجانەوە وداواییان کرد کە ڕێوشوێنی توندوتیژ دژی بگردرێتەبەر.

سەروەت پاشا دەستی لەکارکێشایەوە وحکومەتێکی نوێ پێك هات بەسەرۆکایەتی عەلی یکن پاشا وتەنگژەی تەها حوسێن سەرووتر دەبوو بووە بابەتێکی ورۆژاو لەهەموو ماڵێکدا.

دەنگۆکان دەستیان بەبڵاوبوونەوە کرد: کە تەها حوسێن ڕقی لەئیسلام وموسڵمانان دەبێتەوە. هەر لەبەرئەو هۆیەش ناوی لەکوڕەکەی ناوە کلود وکچەکەشی ناوی مارگرێتە. هەندێ ڕۆژنامەی میسری نوسیان کە کچێکی بچوکی هەبووە ومردووە لەگۆڕستانی فەرەنسییەکانی ناشتوە، وهەردوو کوڕەکەی تەعمید کردووە.

هاوڕێیانی تەها حوسێن بینیان کە ئێستا پێویستە هەڵبستێ بەدەست پێ کردن بەقەناعەت پێهێنان خەلکی بەهەلەی ئەو دەنگۆیانەی گومانیان دەخستەسەر بیروباوەڕی ئاینی. بەم شێوەیەش نوسراوێك لەتەها حوسێنەوە گەیشتە بەڕێوبەری زانکۆ بۆ ئەوەی لەرۆژنامەکان بڵاوببێتەوە ناواخنەکەی ئەمەی خوارەوە بوو:

(( قسە زۆر بووە لەسەر ئەو کتێبەی پێش ماوەیەك بەناوی (لەشیعری

جاهیلی)یەوە دەرم کرد)). وتراوە کە من بەئەنقەست تانە وتەشەرم لەئاین داوە و لەئاین دەرچووم، ومن بێ باوەڕی لەزانکۆدا دەڵێنەوە. من بۆ بەڕێزانتان جەخت لێدەکەمەوە کە ئەم ویستوە تانە وتەشەر لەئاین بدەم ولەئاین دەرنەچووم وناشێ کاری ئاوەهاش بکەم بەتایبەتی کە من موسڵمانم وباوەڕم بەخودا ومەلائیکەتەکانی وکتێبەکانی وپێغەمبەرانی وڕۆژی دوایی هەیە.. من تکا دەکەم کە بفەرمون کە ئەو بەیانە بەو کەسانە بگەیەنن کە دەتانەوێ وبڵاوی بکەنەوە، لەگەڵ سڵاوی تەواو وڕێزی مەزنمدا)).

لەگەڵ ئەوەشدا گەردەلوولە کە هێور نەبووەوە، ئەوە بوو سەر لەنوێ لەساڵی ١٩٢٧ مەسەلەکە لەئەنجومەنی نوێنەران وروژێندراو وەزارەتی مەعاریفی لیژنەیەکی نوێی بۆ نوسینی ڕاپۆرتێکی نوێ لەسەر کتێبەکە پێکهێنا، ئەمەش دوای ئەوەی تەهاحوسێن ناونیشانەکەی گۆڕی وکردی بە(لە ئەدەبی جاهیلی)، لەم ڕووەوەش بەشێکی لێ دابوو وچەند بەشێکی بۆ زیادکردبوو، بەڵام لیژنەکە وای بینی کە کتێبە نوێیە هەموار کراوەکە لە دوازدە جێگادا کتێبەکە تانەوتەشەر لەئاین دەدات وڕووبەڕوو گێڕایەوە. وەڵامدانەوەی تەها حوسێن بەکتێب ونامەش فراوان بوو. لەم کتێبانەی کە دەریشچوون کتێبی (( هەڵتەکاندنی کتێبی لەشیعری جاهیلی )) دانانی شێخ محەمەد خدر حوسێن مامۆستای کۆلێژی شەریعە لەئەزهەر. وهەندێ کتێبی تری محەمەد فەرید وەجدی ومحەمەد لوتفی جومعە ومحەمەد خوزەری وهی تریش.

لە ٥ ئایاری ساڵی ١٩٣٠ ئۆپۆزسیون لەئەنجومەنی نوێنەران داوای داوای خۆیان نوێ کردەوە سەبارەت بەدەرکردنی تەهاحوسێن لە زانکۆ.

ئینجا جارێکی تر ساڵی ١٩٣٢ بابەتەکە سەر لەنوێ لەئەنجومەنی نوێنەران کرایەوە، ئەمەش دوای ئەوەی تەها حوسێن بووە عەمیدی کۆلێژی ئاداب، ودوای ئەوەی ئیسماعیل سدقی پاشا بووە سەرۆکی وەزیران. ئۆپۆزسیون داوای ئامادەبوونی وەزیری مەعاریفیان کرد ودەستیان کرد بەسوپاس کردنی لەسەر هەڵوێستی لەچاودێری کردنی زانست وەکو دەروازەیەك بۆ دوو تاوانبارکردن کە خرابوونە پاڵ تەها حوسێن ئەوانیش :
یەکەمین: وێنەیەکمان لەرۆژنامەی ئەهرام بینی کەوێنەی قوتابیانی کۆلێژی ئادابە لەزانکۆی میسری لەدەوروبەری عەمیدیان تەها حوسێن وتیایدا هەر کچێك لە پاڵ کوڕێك دانیشتبوو. چۆن ئەمە ڕوویدا؟ وچۆن وەزارەتی مەعاریف بەردەوام دەبێ لەسەر ڕێز نەگرتن لەهەستی ئاینی وئادابی نەتەوەیی؟
دووەمین : هێشتا کتێبی لەشیعری جاهیلی بەناوی کتێبی لەئەدەبی جاهیلی لەزانکۆدا دەخوێندرێ، گۆڕینی ناونیشان هیچ شتێکی لەڕوحی نا ئاینی نەگۆڕیوە. ئەو ژەهرانەی دکتۆر ویستی لەکتێبەکەی بڵاوی بکاتەوە هێشتا لەزۆربەی بەش وپارەکانی دا هەن. چۆن وەزارەتی مەعاریف بەرامبەر بەهەموو ئەوە بێدەنگبووە ونەجوڵاوەتەوە؟ وچۆن ڕێگا دەدات کە ئەو پیاوە ڕاگری کۆلێژی ئادابی زانکۆی میسربێت؟

تاوانبارکردنی یەکەم وەزیر وەڵامی دایەوە وهەرچی تاوانبارکردنی دووەم ئەوە بوو تەوەری گفتوگۆکردنی جیابوو لەنێوان نوێنەران بەڵام بەدووکەوتنی تەهاحوسێن تەنها لە٢٠ی ئاداری ساڵی ١٩٣٢ کۆتایی پێهات کاتێك کە ئەنجومەنی وەزیران بەسەرکردایەتی ئیسماعیل سدقی پاشا کۆبووەوە ئەو

کەسە کە بەمستی ئاسنین ناسراو بوو، بەتایبەتی دژی فیکر وخەڵکی فیکر، ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەنجومەنی فەرمانبەر لەوەزارەتی مەعاریفی گشتی لەخزمەتی حکومەت دەربکات)).

لەئەنجامی ئەو بڕیارە وەکو ناڕەزایی دەربڕینێك ئەحمەد لوتفی سەید دەستی لەکاری بەڕێوبەرایەتی زانکۆ کێشایەوە. بەڵام دەست لەکارکێشانەوەکەی لەناو خۆشی تۆمارکردنی سزا بەسەر تەهاحوسێن ونبوو.

چەند ساڵێك بەسەر ئەو بڕیارەدا تێدەپەڕی بێگومان شوێنەوار وپاشماوەی وای دەبێت کە نازمێردرێ. لەدوا ڕۆژەکانی تەهاحوسێن ڕۆژنامەنوسێکی میسری لێی دەپرسێ کە بۆچی ئەو ڕووداوە درێژبووەوە. بۆچی بڕیاری دەرکردن تەنها لەم ساڵەدا دەرچوو. ساڵی ١٩٣٢ لەگەڵ ئەوەی مەسەلەکە زۆر پێش ئەوە دەستپێکردبوو؟

تەهاحوسێن وەڵام دەداتەوە لەبەرئەوەی لەو ساڵەدا هۆی نوێ لەپاڵ هۆی کۆن سەریان هەڵدا. لەو هۆیانە هەڵوێستێکم لەگەڵ وەزیری مەعاریفی گشتی ئەوکات حیلمی عیسا ئەو داوای لێکردم کە لەنوسینگەکەی سەردانی بکەم، لەگەڵ عەبدولوەهابی عەزام چووینە لای، لەکاتی سەردانەکە وەزیری مەعاریف پێگوتم: ئەی دکتۆر، بەو پێی یەی کە تۆ ڕاگری کۆلێژی ئادابی لەتۆمان دەوێ کە پێشنیازێك پێشکەش بەزانکۆ بکەی سەبارەت بەبەخشینی دکتۆرای فەخری بۆ ژمارەیەك لەگەورە پیاو ماقوڵان: یەحیا ئیبراهیم وعەلی ماهیر وعەبدولحەمید بەدەوی وعەبدولعەزیز فەهمی هی تریش، بەڵام یەکسەر بەوەزیری مەعاریفم ووت: ئەی پاشا، ڕاگری کۆلێژی ئاداب عومەدەیەك نییە فەرمانی لەوەزیرەوە بۆ دەربکەی. من ڕازی نابم بەوەی دکتۆرای فەخری

بەکەسێك بدرێ تەنها لەبەرئەوەی لەپیاوماقوڵانە وناتوانم تەنانەت ئەم شتەش بخەمە بەردەم ئەنجومەنی کۆلێژی ئاداب، لەبەرئەوەی ئەنجومەنەکە رازی نابێت.

تەهاحوسێن دەڵێ لەو ساتەدا تورەبوون لەدەنگی وەزیری مەعاریف بەدیارکەوت ووتی: باشە تۆ گوێ لەقسان ناگرێ. دەبینی کێ قسەکەی جێبەجێ دەکەوێ. بەراستیش وەزیر کارەکەی خستەبەردەم ئەنجومەنی کۆلێژی ئاداب وئەنجومەنەکە رازی نەبوو کە دکتۆرای بەو پیاو ماقووڵە ناوبراوانە بدات.

هەروەها تەها حوسێن لەوەلامدانەوەی هۆیەکی تری زیادکرد. کەمێك دوای ئەو رووداوە شا فوئاد هات بۆ ئەوەی سەردانی زانکۆی میسری بکات وکۆلێژەکانی بکات. پێش هاتنی مامۆستایانی کۆلێژی ئاداب لەعەمیدەکەیان تەها حوسیەنیان پرسی، ئایا بەبۆنەی سەردانی شا موحازەراتی تایبەتی پێشکەش بکەین؟ تەها حوسێن ووتی: نەخێر، هەموو موحازەرەکانیش وەکو خۆی دەبێت وهەموو مامۆستایەکیش لەموحازەرەی ئاسایی دەبێت.

کاتێك کە شا گەیشت وچووە یەکەم هۆڵەوە لەناکاودا بینی کە قوتابیان گوێبیستی موحازەرەیەك دەبن سەبارەت بەسیستەمی دەستوری، تورەبوو. ئینجا جارێکی تریش تورەبوو کاتێك کە عەلی پاشا سەرۆکی ئەنجومەنی پیرانی ئەوکات هاتەژوورەوە، وقوتابیان زیاتر لەئەوەی شا چەپڵەیان بۆ لێدا، لەراستیدا ئەوان هەر چەپڵەیان بۆ شا لێنەدابوو. لێرەدا شا فوئاد ووتی: چۆن قوتابیان بۆ عەلی پاشای لێدەدەن وبۆ منی لێنادەن؟ گووتی لەودا نییە کە ئەو کارە لەبن سەری تەها حوسێنی نەفرەت لێکراودایە.

بەم شێوەیەش کەش وهەواکە پتر لەباربوو بۆ سزادانی تەهاحوسێن ودارشتنی دەرکردنی، ئەم مەسەلەیەش لەماوەی خۆیدا فیکری میسری عەرەبی داگیرکردبوو، وتاکو ئێستاش زۆر عیبرەت وبیرەوەری دەوروژێنێ.



## سەرچاوە:

مجلة الجيل، حزيران ١٩٨٢، المجلد٣ ، العدد٦.



# دیدار

## سەد ساڵەی شۆڕشی مەشرووتە (دەستوور)

*لە وتووێژێک لەگەڵ ئیسماعیل عەبدولرحمان سەعید*

قوتابی ماستەر لەکۆلێژی ئاداب- زانکۆی سەلاحەدین



**سازدانی: مەهدی میهر پەروەر**

١٤ی گەلاوێژی ١٣٨٥ هەتاوی بەرامبەر بەئابی ٢٠٠٦ بەسەر شۆڕشی مەشرووتەی ئێران سەدساڵ تێپەڕی، بەم بۆنەیەوە وبەبیرەوەری ئەم ڕووداوە مێژوویییە گرنگە وهەڵسەنگاندنی هەندێ لایەنی ئەم شۆڕشە گۆڤارەکەمان وتوێژێکی لەگەڵ ئیسماعیل عبدالرحمان سەعید پێک هێناوە، ڕەوتی ئەم وتووێژە، کە لەسەر کاسێت تۆمارکراوە دەخەینە بەردەستی خوێنەران.

**مەهدی میهر پەروەر: هۆکار یان هۆکارەکانی دروست بوونی شۆڕشی مەشروتە چی بوو؟**

**ئیسماعیل عەبدولرحمان:** سەرەتا پێم خۆشە دیمەنێکی ئەم کاتەی کۆمەڵگای ئێران بخەمە بەرچاو، کۆمەڵگای ئێران لەسەرەتای سەدەی بیستەم، کۆمەڵگایەکی نیو موستعمەرە وفەلامەتی بوو، حەشیمەتی لەنێوان ٩ تا١٠ ملیۆن کەس دەخەملێنرا، پتر لەنیوەی ئەم حەشیمەتە لەدێهات

وگوندەکان دەژیان، ١/٥ ئەم حەشیمەتە لەشارەکان دەژیان وژمارەی گەورە شارەکانیش زۆر کەم بوو، وە ژمارەی ١/٤ بەشێوەی خێلایەتی واتە: کۆچەر بوون، وگەرمیان وکوێستانیان دەکرد وبەبەخێوکردنی مەڕ ومالآت خەریك بوون.

وولآتی گەورە وبەهێزی ئەم کاتی جیهان واتە: بەریتانیای مەزن وڕوسیا لەسەدەی نۆزدە جێ پێی خۆیان لەو وولآتە قایم کردبوو وە دەسەلآتی حکومەتیان خستبووە ژێر ڕکێفی خۆیان، ئەم حەشامەتەی کە باسم لێکرد کەمتر لە١٠٪ خوێنەوار بوون، فەقیری وهەژاری ئابوری شپرزەیی ولآتیش بەجێی خۆی، ڕژێمی سیاسی ئەم کات لەژێر دەسەلآتی بنەماڵەی قاجاری دابوو کە ڕژێمێکی سیاسی سەرەڕۆ بوو، وە پاشا ئەم دەسەلآتەی جێبەجێی دەکرد، شا خۆی بەخاوەنی گیان ومال وناموسی خەلك دەزانی ولەبەرامبەر کەسدا وەلآمدەرنەبوو، هیچ دامەزراوەیەکی وەك پەرلەمان یا حزب و ڕێکخراوێك نەبوو، کە شا خۆی بەوەلآمدەریان بزانێ.

ئێستا بەلەبەرچاوگرتنی ئەم وێنە گشتییەی کۆمەلگەی ئێران دەچینە سەر وەلآمی پرسیارەکەت، بەبێ شك شۆڕشی مەشرووتە شۆڕشێکی کتووپڕ ولەناکاو وبەڕێکەوت نەبوو، کە هەروا لەسەر زەویەکی ڕووت وقووت هەلقولابێ، بەلکو کۆمەلێك هۆکار دەستیان دایە دەستی یەکدی وهەلومەرجی سەرهەلدانی ئەو شۆڕشەیان پێك هێنا، دەکرێ ئەو هۆکارانە بەم جۆرە دابەش بکەین:

هۆکاری نێوخۆیی وهۆکاری دەرەکی، لەپەیوەندی لەگەل هۆکاری نێوخۆیی سەرەتا پێم باشە ئاماژە بەنارەزایی توندی کۆمەلانی خەلك لەزولم

وزۆری دەسەڵاتدارانی قاجاری لەپێشەوەی هەموانیێ کیفایەتی پاشاکانی قاجاری بکەم، ئینجا وەزعی شپرزەی ئابوری وولآت وزۆربوون وفشار وزەختی مالیاتی، کە بەشێوەی باج وخەراج لەخەڵکیان دەساند.

وه هەر لەپەیوەندی لەگەڵ هۆکاری نێوخۆیدا جێی خۆیەتی باس لەهۆکاری فکری بکەین کە بیێ ئەم لاونەولا لەبەرپابوونی ئەم ڕووداوە مەزنەدا دەوری بەرچاوی گێڕا.

ئاشنا بوونی بەشێك لەکۆمەڵانی خەڵك لەگەڵ کەلتور وشارستانیەتی ڕۆژئاوا وچونەسەر ڕادەی ووشیاری گشتی وچالاکی بەرچاوی ڕووناکبیرانی ئازادیخواز وپێشکەوتوو کە بەهۆی ڕێکەوتنیان بۆ دەرەوەی وولآت لەگەڵ بیرو ئەندێشەی ئازادیخوازی ئاشنابوون وەك مولکم خان، عەبدول ڕەحیمی تالبوفی تەبریزی، میرزا یوسفی موستەشار وچەندانی تر بەبانگەشەیان بۆ قبولکردنی بیرو باوەڕ وبایەخە نوێیەکان لەکۆمەڵ دا دەکرد وهەروەها شکستی پرۆژەی چاکسازی وریفۆرم لەنێو حکومەتدا کە بەهۆی هەندێك لەکاربەدەستانی نێو حکومەت بەڕێوەدەچوو وەك قایمقام فراهانی، عەباس میرزا وئەمیر کەبیر وسوپاسالارو ....بەهۆی سەرەڕۆیی ملهوری سیاسی واتە پادشاکانی ودواکەوتوویی ئاینی (ئاخوندە شیعەکان)، سەرئەنجام کۆمەڵگای ئەم کاتی ئێرانیان بەرەو ئەو ئاڵووگۆڕە مەزنە پاڵ پێوەنا. شایەنی باسە کە دوو ڕووداوی دەرەکی (خارجی)ش، لەخێراترکردنی بەستنی شۆڕشەکەیدا کاریگەریان هەبوو:

یەکەم: شۆڕشی بورژوا دیموکراتیك ـ ڕوسیا کە لەساڵی ١٩٠٥، کە لەئاکامی ئەم شۆڕشەدا تێزار ڕوس پاشەکشەی کرد وملی بۆ پێکهێنانی پەرلەمان

(دوّما) ڕاکێشا، ودووەهەم شکستی ڕوسیا لەبەرامبەر یابان لەهەمان ساڵدا ١٩٠٥.

لەنێو کۆمەڵانی خەڵکی ئێران دەنگدانەوەی بەرینی هەبوو بەم چەشنە هۆکاری سەرکەوتنی وولاّتێکی بچووك بەسەر ئیمپراتۆرێکی وەها زەبەلاحدا، کە تائەو کات دووجار بەسەر وولاّتەکەیان سەرکەوتبوو لەچیدا بدۆزنەوە.

**مەهدی میهر پەروەر: شۆڕشی مەشرووتە چەند قۆناغ یا چەند فازی تێپەڕکرد، دەکرێ بەکورتی ئامارەیان پێبکەی؟**

**ئیسماعیل عەبدولرحمان:** قۆناغی یەکەمی شۆڕش کە بیست مانگ وبیست ڕۆژی خایاند بەڕووداوی موجازاتی هەندێ لەبازرگانانی شاری تاران(عەلائودەولە) حاکمی تاران بەهۆی گرانکردنی نرخی قەند لەبازاڕدا دەستی پێکرد، هەڵبەت هەندێك مێژونووس دەستپێکی ئەم شۆڕشە بەڕووداوی تر دەگێڕنەوە، کە ئەمەش خۆپیشاندان ومانگرتن بەست دانیشتنی خەڵکی بەدواداهات وموهاجەرەتی سوغرا وکوبرای لێکەوت، سەرئەنجام پاشەکشەی ڕژێم لەبەرامبەر نمایشی عەزم وئیرادەی کۆمەڵایەتی خەڵك و واژووکۆکردنەوەی فەرمانی مەشرووتە بەهۆی موزەفەردین شا ودامەزراندنی پەرلەمان ونووسینی قانوونی ئەساسی دەستور و هەڵبژاردن، هەموو بەکورتی لەم قۆناغە جێ دەگرێ، قۆناغی دووەم بەهێرشی ناحەزانی شۆڕش ودارودەستەی پادشای تازە ( محمد علی شا )، وە بەشێك لەئاخوندەشیعەکان ( شێخ فەزڵوڵای نوری) بۆ سەر مەشرووتەخوازەکان وپەرلەمان دەستیپێکرد. لەم هێرشەدا پەرلەمان بەر تۆپ دراو کودەتا لەمەشرووتە کرا(کۆلۆنێلێکی ڕووسی بەناوی لیاخۆف کەفەرماندەی بریگادی

قەزاف بوو دەوری سەرەکی بینی، ئەم قۆناغەش ١٤ مانگی خایاند کە تیایدا مەشرووتە تیکەوە پێچراو وسەرلەنوێ سەرەڕۆیی زاڵبوو، ئەم قۆناغە لەمێژوودا بەئینتیدابی صغیر بەناوبانگە، قۆناغی سێیەم سەرکەوتنی دووبارەی مەشرووتەخوازەکان وشکستی لایەنگرانی سەرۆك خوازەکان لەخۆدەگرێ، کە تیایدا مەشرووتەخوازەکان سەرلەنوێ لە١٩٠٨ توانیان شاری تاران بەدەستەوەبگرن وپەرلەمان کەداخرابوو، دامەزرێننەوە وسەر لەنوێ مەشرووتەیی زیندوبکەنەوە، هەڵبەت لەم سەرکەوتنە دەورونەخشی خەڵکی شاری ئازەربێجان وبەتایبەت شاری تەورێز، کەسایەتیەکانی وەك (سەتار خان وباقر خان وحەیدەر عموئوغلی) بەرچاوبوو. کۆتایی ئەم قۆناغە لەڕوانگەی هەندێ مێژوونوس تاساڵی ١٩١١وە لەلایەن هەندێکی تر تا کودەتاکەی ڕەزا خان لەساڵی ١٩٢١ کە بەرامبەر ئینگلیستان بەڕێوەی برد لەئەنجامدا هەموو ئاسەوار وئامانجێکی مەشرووتەی سڕییەوە، دەخایەنێ.

هەر لەم پەیوەندییەدا پێم خۆشە باسی شێوازەکانی خەبات لەم شۆڕشە بکەم کە سەرنج ڕاکێشە تەقریبەن هەموو شێوازەکانی شۆڕش لە خۆپێشاندان، مانگرتن، لەخەباتی پەرلەمانیەوە بگرە تا بەرزترین شێوەی خەبات کە خەباتی چەکدارییە لەم شۆڕشەدا تەجروبە کرا.

**مەهدی میهر پەروەر:** ئەم ڕوانگە وئەندێشانەی کە لەپشت شۆڕشی مەشروتەدا بوون چ بوون؟

**ئیسماعیل عەبدولرحمان:** دەکرێ ئێمە باسی سێ ڕوانگەی سەرەکی وبنەڕەتی بکەین لەڕەوتی ئەم شۆڕشەدا. یەکەم: ئەم ڕوانگە وشێوە بیرکردنەوەیەیی کە کەوتبوە ژێر کاریگەری لیبراڵ ودیموکراسی ڕۆژئاوا، وە

لـەم شـێوە فکـرە ئیلـهامی وەرگرتبـوو، هەڵبـەت بـا ئـەوەش بڵـێم ئـەو ڕووناکبیرانەی کە ئەم بۆچونەیان تەرویج وتەبلیغ کرد بەتەواوی دەرکیان یان تێگەیـشتنێکی قوڵیـان لەئەندێشەی ئـەوروپا نـەبوو، بـەڵام هەرچـۆنێك بـێ کەوتبوونە ژێر کاریگەری، لەم پەیوەندیانەدا پێم خۆشە نمونەیـەك بێنمـەوە: ئـەو دەستورەی(قـانوونی ئەساسـی) کـە پەرلـەمان پەسـەندیکرد بەتـەواوی لەدەستوری وولاتی ( بەلژیکا) وەرگیرابوو.

دووەم : ڕوانگەی دووەم ئەو ئەندێشەیە بوو، کە سۆسیال دیموکراسـی وڵاتـی دراوسێ واتە: ڕوسیا شوێنی لەسەر دانابوو دەکرێ بڵێن ئەمـە تەفـەکورێکی چەپ وسۆسیالی ڕادیکالی بوو. ئەو کەسانەی کە بەدوای ئیش وکار لەناوچەی قەفقاس گیرسابوونەوە، هەر لەوێ کەوتبوونە ژێر کاریگەری بیروڕای سۆسیال دیموکراتەکانی ڕوسیا، وە لەم ڕێگایەوە ئـەم بیروباوەڕەیـان بـۆ نـاو شۆڕش گواستەوە. ڕوانگەی سێیەم: مەلا شیعەکان بوون، کە خوازیـاری دامەزرانـدنی حکومەتی شەرع بوون.

**مەهدی میهر پەروەر: باست لەڕوانگەی شیعە کـرد، دەکـرێ دەوروونەخـشی روحانیەتی شیعە لەشۆڕشی مەشرووتەدا بکە؟**

**ئیسماعیل عەبدولڕحمان:** سەرەتا با ئامازە بەوەبکـەم کـە بـەهۆی هەنـدێك لایەن، دەور ونەخـشی ڕوحانیـەتی شـیعە لـەم شۆڕشـەدا زۆر زەقکراوەتـەوە واتـە زۆر زۆرتـر لـە پێوانـەی خـۆی. تەنانـەت خومـەینی ووتـی: شۆڕشـی مەشرووتە، ئاخوندکان هەڵیان سـاندەوە ودواتـر ڕووناکبیرەکـان لێـان دزیـن. دیـارە ئـەم ئیدعایـە بەپێچەوانەی ڕاسـتیە مێژوویەکانـە، چـۆنیەتی ڕوداوە مێژووییەکان پێشاندەدەن، کە ڕوحانیەتی شیعە لـەبیری سـەرەتای سـەدەی

بیستەم، واتـە: لەساڵی ١٩٠٠ وە بـەم لاوە واتـە لـەم کاتـەوە کـە مەشـرووتە وئازادیخوازی وویستی بەڕێوەچوون ونـەزم وقـانون وعەدالـەت لەچوارچێوەی بـیر وئەندێشەی شۆڕشـگێری بـوو بـە جوڵانـەوەی نارەزایـەتی وئیعتیـزازی خەڵکی کۆڵان وبازاڕ، کێشرانە مەیدانی خەباتەوە واتە ئـەو کاتـەی کەشـۆڕش لـەقۆناغی فکرییـەوە چـووە قۆنـاغی پراکتیکیـەوە، بـیر وئەندێـشەی مەشرووتەخوازی نیـو سـەدەبوو کـە بـەهۆی ڕوناکبیران ونـەریتی کۆمـەڵگای ئەوکاتی ئێران پروپاگەنـدەی بـۆ دەکرا، ڕۆژنامـەکانی(حبـل المتین، اختر، قـانوون ، حکمـت، پریـا، بـرورش، کـە لـەدەرەوی وولاَت دەردەچـوون وە لـەنێوخۆی وولاَت بلاَودەبوونـەوە مەگـەر گـەورەترین دەوریـان نـەبوو لەوەبەخەبـەرهاتنی کۆمـەلاَنی خـەڵك ورووونکردنـەوەی بـیروڕای گـشتی وئاسانکردنیان بەبیروباوەڕی ئازادیخوازی مەشـرووتەخوازی، ئێستا پرسیار ئەوەیـە کـە ئایـا ئـەو ڕۆژنامـە وبلاَوکراوانـە لەلایـەن ڕوحانیەتـەوە چـاپ وبلاَودەکرانەوە؟

بەلاَم ڕوحانیەتی شیعە لـەڕەوتی ئـەم شۆڕشـە هەڵوێستی یـەك دەستی نەبوو، دەستەیەکیان بەڕێبەری شێخ فەزڵولاَ نوری هەر زۆر زوو ڕیزی خۆیـان لەمەشروتەخوازەکان جیاکردەوە ولەگەڵ داردەستەی محمد علی شا ودژی شۆڕش کەوتن، ئەم دەستەیە لەدژایـەتی کردنـی شـۆڕش لـەهیچ کردەوەیـەك نەدەسڵمینەوە، شێخ فـەزڵولاَ خوازیاری بـەڕێوەبردنی شـەرع بـوو دەیگوت دەبێ(مشروعە) لەجێی مەشرووتە بێ، ئـەو ویـست وئـارەزوو وئاواتـەی شێخ فەزڵولاَ ئەو کات وەدینەهات وهەڵبەت پاش ٧٣ ساڵ لـە سـاڵی ١٩٧٩ بـەهۆی ڕوحانیەتی شـیعە لـەئێران وەدیهات وەحکومـەتی شـەرعیان لەتاران هێنایە

سەرکار، بەشەکەی تری ڕوحانیەتی شیعە بەڕێبەری (تەباتەبایی ویهبەهانی) لەگەڵ ڕەوتی شۆڕش ڕۆیشتن تا ئەوکاتەی شۆڕش بەرەو قوڵبوونەوە و ڕادیکالیزم ڕۆیشت، ئینجا لێکشانەوە، وە ناوەڕۆکی کۆنسیرڤاتیڤی خۆیان دەرخست، کەوابو دەگەینە ئەو ئاکامەی کە شتێك بەناوی ڕوحانیەتی مەشرووتەخواز بێجگە لەوەهم هیچی تر نیە.

**مەهدی میهر پەروەر: خاڵە لاوازەکانی شۆڕشی مەشرووتە کامانە بوون؟**

**ئیسماعیل عەبدولرحمان:** شۆڕشی مەشرووتە شۆڕشێك بوو کە هەر لەشارەکان بوو، ئەوکات بەشی زۆری کۆمەڵگای ئێران هەروەك پێشتر وێنەیەکم پێشاندا، دەبینین لەسەدا هەشتای خەڵك لەدێهات وگوندەکان دەژیان یان بەشێوەی خێڵایەتی گەرمیان وکوێستانیان دەکرد، ئەو حەشیمەتە زۆرە هیچ ئاگادارییەکیان لەشۆڕش نەبوو بەشداریان تێدا نەکرد، شۆڕش هیچی بۆ ئەوان پێ نەبوو، لەڕەوتی شۆڕشی مەشرووتەدا. سەرەڕای ئەوەی بۆ یەکەم جار بوو کە ژنان لەجوڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتی وسیاسیدا بەشداریان دەکرد وتەنانەت ڕێکخستنی تایبەت بەخۆشیان پێکهێنا وشان بەشانی پیاوان هاتنە مەیدان، بەڵام لەهەڵبژاردن خاوەن دەنگ نەبوون بێجگە لەمە لە یەکەمین پەرلەماندا نوێنەرانی چین وتوێژەکانی وەك شازادەکان، ڕوحانیەکان، ئەشراف، خاوەن زەوییەکان، توجارەکان و ئەو ئەسنافانەی هەڵبژێردرابوون، نوێنەری چین وتوێژە هەژار وزەحمەتکێشەکانی کۆمەڵ وەك کرێکاران و جوتیاران هیچ نوێنەرێکیان نەبوو. هەڵبژاردنەکان بێجگە لەتاران لەشوێنەکانی تر بەشێوازی دوو قۆناغی بەڕێوەچوو ڕەنگە ئەمانە گرنگترین خاڵە لاوازەکانی شۆڕش بن، هەرچەندە کەم وکوڕی تریش هەبوو بەتایبەت

لەگەڵ چارەسەرنەکردنی کێشەی نەتەوایەتی بۆ وڵاتی فرەنەتەوەی ئێران.

**مەهدی میهر پەروەر: باست لەکێشەی نەتەوایەتی کرد، پەیوەندی کورد ومەشرووتە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

**ئیسماعیل عەبدولرحمان:** لەیەکەم دەستوری وڵاتی ئێران کە بەرهەمی شۆڕشی مەشرووتەیە ولەساڵی ١٩٠٦ نووسرا، لەو دەستورەدا باس لە شوناسی یەکگرتووی ئێرانی دەکا، شوناسێك کە لەسەر بنەمای زمانی فارسی، کولتوری فارسی ومەزهەبی شیعە دامەزراوە وبەم جۆرە دەبینین بەئاشکرا نکۆڵی وحاشا لەبوونی نەتەوەکانی دیکە، کە لەو وڵاتە دەژین دەکرێ و یەك لەوان نەتەوەی کورد. ئەمە سەرەتای دامەزراندنی ناسیونالیزمی ئێرانیە(فارسە) واتە: گەرای ئەو ناسیونالیزمە لەم شۆڕشەدا چێنراو ودواتر ١٥–٢٠ ساڵی تر بەهۆی ڕەزا شاوە موتوربە کرا. کەوابوو شۆڕشی مەشرووتە بۆ نەتەوەی کورد هیچی پێ نیە وهەرچەندە لەهەندێك لەشارەکانی کوردستان وەك مەهاباد وسەقز وبەتایبەتی کرماشان کە خۆی ئەو دەم شارێکی گەورە بوو، ئەنجومەنەکانی لایەنگیری لەشۆڕش پێك هاتبوون. بەڵام کورد نەك هیچی پێ نەبڕا بەڵکو حاشا لەبوونی شوناسی سەربەخۆشی کرا. بەڵام بەداخەوە ئەو کات نوخبە وئیلیتی کورد لەو ڕادەیەی وشیاری نەتەوەییدا نەبوو کە بەگژ ئەو حاشا لێکردنەوەدا بچێ.

**مەهدی میهر پەروەر: کەوا بوو دەکرێ بڵێم دەسکەوتەکانی شۆڕش چی بوون؟**

**ئیسماعیل عەبدولرحمان:** بەبێ گومان هەرچەندە شۆڕشی مەشرووتە جوانە مەرگ بوو بەهەموو ئەو ئاوات وئامانجانەی کە مەبەستی بوو وەخەڵك بۆی

هاتبوونە مەیدان نەگەیشت وبەتایبەتی لەو نێوەندە دا با ئاماژە بە"نهادینە"کردنی دیموکراسی بکەم واتە: دیموکراسی وەك دامەزراوەیەك جێی نەگرت، بەڵام دەکرێ ئاماژە بۆ ئەم دەسکەوتانە بکەین: بۆ یەکەمجار کۆمەڵانی خەڵك توانیان لەرێگای پەرلەمانەوە لەدیاریکردنی چارەنووسی خۆیان دا دەخالەت وبەشداری بکەن، خودی دامەزراندنی پەرلەمان کە نوێنگەی ئیرادەی خەڵك بوو، دەسکەوتی مەزن بوو، قودرەت وسوڵتەی رەها وموتڵەقی شا بەریەست وسنووردار کرایەوە وبەپێچەوانەی رابردوو ئەم جارە دەبوایە لەبەرامبەر پەرلەماندا وەڵامدەربێ، هەروەها کورتکردنەوەی دەستی ئیستعماری رووس وئینگلیس ورەخسانی هەلی لەبار بۆ چاپەمەنی وبلاوکراوە وەك کتێب وگۆڤار ورۆژنامە وهەروەها بۆ یەکەمجار لەمێژوودا یاسا وقانوون دێتە ئاراوە وجێی بەشەرع لێژ دەکا ودادگانی میری (دادگستری) جێگای محاکمی شەرع دەگرنەوە وئەمەش سەرەتای رەوتی بەعەلمانی بوون وسکولاربوونی کۆمەلگایە، ودامەزراندن وپێکهاتنی حزب ورێکخراوە سیاسیەکانیش کە بۆ یەکەمجار لە پەرلەمانی دووەهەمدا (١٩٠٨) خۆیان دەرخست بەرهەمی تری ئەم شۆڕشە بوو. بەکورتی وبەپوختی دەکرێ بڵێم شۆڕشی مەشرووتە لەمێژووی ئەم وولاتەدا نوختەیەکە بۆ تێپەربوونی کۆمەلگا لەکۆمەلگایەکی تەقلیدی وترادیسیونی وداخراوی ژێر سەرەرۆیی شا وئاخوندەکانەوە بۆ کۆمەلگایەکی نوێ وکراوەترە وئازادتر.



# دیدار

## گفتوگۆیەك لەگەڵ

## د. حەسەن جاف



**سازدانی: ئەهرۆ زەندی**

**ئەهرۆ زەندی: یەكەمجار حەز دەكەین بزانین ڕێكەوت ڕووی بەرەو بایەخدان بەمێژوو لێ وەرچەرخانیت یان ئارەزوو وهەڵبژاردەی خۆت بوو؟**

**د. حەسەن جاف:** لەوكاتەوەی خۆم ناسیوە وحەزم لەمێژوو كردووە، بەهیچ جۆرێك بەڕێكەوت بایەخم بەمێژوو نەداوە وهەمیشە لەو خولیایەدا بوومە مێژووی نەتەوەكەم تێروتەسەل بكەم ولەم ڕێگەیەوە بەپێی توانام خزمەتی دۆزی میللەتەكەم بكەم، وا بزانم نووسینەكانم گەواهی ئەم هەقیقەتەن. زۆربەی نووسینەكانم سەبارەت بەمێژوو وفەرهەنگی كوردە، بەندە لەم بارەیەوە هاوبیری فەیلەسوفی مەزنی ڕۆمیم ئەوەی مێژووی میللەتەكەی بە باشی نەزانێ، هیچ نەزانە ونەخوێندەوارە.

**ئەهرۆ زەندی: یەكێ لەسەركردە مێژووییەكان، ببورە ناویم لەیاد نەماوە مێژوو وا وەسف دەكات ودەڵێت: مێژوو لەنوختەی ئەو سنورەوە دەست پێدەكات كە سوپاكەم دەیگاتێ. تۆ بڵێی ئەمە مانای ئەوەبێ مێژوو هێز دروستی دەكات یان مێژوو گێڕانەوەی شارستانیەتی ئینسانیە**

بەهەموو بەرزیی ونزمییەکانی قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتییەوە؟

**د. حەسەن جاف:** لەو بڕوایەدا نیم مێژوو هێز دروستی بکات، ئەگەر مەبەست لەم پرسیارەش ئەخشی کەڵەپیاوان وهەڵکەوتوان بێ لەمێژوودا یەعنی دەوری تاکەکان دیارە ئەمە هەقیقەتێکە ناتوانین چاوی لێی بپۆشین، ئەوەی ڕاستی بێ ئەم کەڵەپیاوانە لەمێژوودا زۆرجار بوون بەمایەی سەربەرزی وشانازی وسەرفرازی نەتەوەکەیان، بگرە بووشنەتە مایەی پێوەنازینی مرۆڤ لەم جیهانەماندا چونکە وەك هیگڵ فەیلەسوفی ناسراوی ئەڵمانی دەڵێ:" ئەمانەن، کە دەنگی بانگی ڕوحی جیهان ڕۆشنتر و باشتر لە خەڵکی تری دەبیستن".

بێگومان لەم قسەیەدا مەبەستم ئەو تاکە ملهوڕانە نییە، کە جێ پەنجەی خوێناوییان بەڕوونی لەمێژوودا دیارە لەنموونەی ئەسکەندەری مەکدۆنی یا وەك جەنگیزخان، هۆلاکۆ، تیمورلەنگ، شاه ئیسماعیلی سەفەوی یا سەلیمی عوسمانی، ئاغا محمد خانی قاجار، هتلر ومۆسۆلۆنی وهەزاران خوێنڕێژی تر، بەڵکو مەبەستم ئەو کەڵەپیاوانەن کە لەڕێگای خەباتی بێ وچانیانەوە میللەتەکانیان لەکوێرەوەری وچەوساندنەوە ڕزگارکردووە یا وەك لەڕێی زانستەوە خزمەتێکی شایان وگرنگیان بەمرۆڤایەتی ئەنجامداوە. لەمێژوویی کۆندا لەم دوو حاڵەتەدا ئاماژە بۆ سپارتاکۆس وسوقرات دەکەم، یەکەمیان کۆیلەکانی ئیمپراتوریەتی ڕۆمی هەژاند وهانیدان شۆڕشێکی سەرتاسەری لەزۆربەی ناوچەکانی ئەو ئیمپراتوریەتەدا دژ بەچەوسێنەرەکانیان هەڵگیرسێنن هەروەك شۆڕشەکە بەشێوەیەکی خوێناوی سەرکووتکرا وخودی سپارتاکۆسیش سەری تیاچوو، بەڵام بەدنیای ئەو قۆناغەی ڕاگەیاند کە زۆری

وستەم توانای لەناوبردنی ئازادی وسەربەستیان لەم زەمینەدا نییە.

دووەمیان سوقراتە ئەو فەیلەسوفە مەزنەی کەسەری لەبەر بیروباوەڕی وهۆشیار کردنەوەی مرۆڤدا بەشانازییەوە دۆڕانی ولەمێژوو نوێ هاوچەرخدا لەحاڵەتی یەکەمدا پەنجەی بۆ عومەر موختار وشێخ سەعیدی پیران وشێخ عوبەیدوڵلای نەهری ودکتۆر فوئاد وقازی محەمەد ومەلا مستەفای بارزانی وگیڤارا ونلسۆن ماندێلا ڕادەکێشم ولەحاڵەتی دووەمدا ئاماژە بۆ ئەدیسۆن گراهام بێل، باستۆز کوخ وسەدان زانای مەزنی تر دەکەم.

بێگومان بەپێویستی دەزانم ئەم ڕاستیەش بخەمە بەرچاو لەگەڵ ئەوەشدا بڕوامان بەنەخشی تاکەکان لەمێژوودا هەیە دەڵێین جەماوەریش نەخشێکی سەرەکییان لەپێشکەوتن ودامەزراندنی مێژووی شارستانیەتدا هەبووە وهەیانە ئەگەر سەرکردایەتییەکی ڕاست ودڵسۆز وکارامەیان بۆ ڕەخسابێت.

بەکورتی مێژوو، هێز دروستی ناکات ئەوانەی جێ پەنجەی خوێناوییان لە مێژوودا دیارە، نە ئەم وەچە، ونە وەچەکانی دوارۆژ بەباشی باسیان دەکەن، بەڵکو نەفرەتیان لێدەکەن.

مێژوو لەڕاستیدا گێڕانەوەی شارستانیەتی ئینسانییە بەهەموو بەرزیی ونزمییەکانی قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتییەوە وتۆمارکەری تەجروبەکانێتی بەدرێژایی مێژوو.

**ئەهرۆ زەندی: مێژوو چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

**د.حەسەن جاف:** مێژوو یەکێکە لەزانستە سەرەکییەکانی زانستی مرۆڤایەتی ئەتوانین بەڕاشکاوی بڵێین مێژوو نەخشی مرۆ لەژیاندا دیاری دەکات، چ لەڕابردوو، وچ لەحازر، و چ لەئایندەدا.

ولا المجتمع الدولي تقبل بمثل هذه الأفكار.

وأخيراً، أن الإتزان السياسي والعقلانية هما الدواء الأنجح في حل قضية كركوك طبقاً لمواد الدستور وأهل مكة أدرى بشعابها، بارك الله في إمرى عرف حده ووقف عنده، وانهى هذه المقالة بالمثل الصيني الذي يقول: من داره من الزجاج لايرمي بالحجارة الى بيوت الآخرين.

---

* الأستاذ في قسم التاريخ- كلية الأداب- جامعة صلاح الدين



# ليثرى

د.مهدي قادر خضر
كلية التربية الأساس

ماكانت الانتفاضة الباسلة في نيسان ١٩٩١ حادثة عابرة، بل كانت تمثل مرحلة مشرقة ونادرة في تاريخ كوردستان، أعقبها تغيرات وتطورات هامة شملت جميع الميادين، حيث انفتح على الجميع الباب على مصراعيه، لاسيما أمام المفكرين والمبدعين، مماحدى ببعض المعنيين بالتأريخ وعلى وجه الخصوص نخبة من أساتذة الجامعات في إقليم كوردستان، أن يستثمروا هذه الفرصة في توظيف مشروع كان حلماً يراودهم منذ زمن إلا وهو تأسيس (جمعية ثقافة التأريخية للكوردستان) في الإقليم لتضاف إلى مثيلاتها كي يرفرف أسوة بغيرها في سطوح المباني في مدننا لاسيما في اربيل العاصمة التي تعد أقدم مدينة عامرة في التأريخ وكان من قبل ذلك خرقاً خطيراً وخطيئة كبرى.

لم تتوقف الطموح إلى هذا الحد فحسب، بل إن عزيمة ذوي الأقلام قد ظهرت قوة لايستهان بها، إذ أقدموا على إصدار (مجلة التاريخ) كخطوة مباركة لتزين الجمعية كما تتزين العروسة بالحلي والمجوهرات.

لاشك كان ذلك عملاً جباراً، لأن تاريخنا يعتريه بعض الغموض والنظريات الغريبة جاءت من قبل بعض المؤرخين عن قصد وغير قصد، شوهت معالم

وحقائق شعبنا، ونأمل من مجلتنا أن يخوض معركة لرسم الأفكار والوقائع بشكل موضوعي ورصين لإماطة اللثام عن واقع المجتمع الكوردي وخصائصه التي تعطيه هويته المتميزة المستقلة. ولتكون منبراً حراً طليقاً لأقلام المفكرين و المؤرخين ليدلوا بآرائهم وأفكارهم عن الكورد والكوردستان، معززاً بالأدلة والفرائض والاستشهاد.

ومن حسن الحظ جاءت هذه المبادرة في ظرف ملائم، وسوف تخرج مجلتنا إلى ايدى القراء الأعزاء، بعد الخطاب الكوردي الواحد، ويجب أن لاننسى إن كل ما تحقق وما يتحقق هو ثمرة من ثمار دماء شهدائنا الأبرار وأبناء شعبنا البررة، وكذلك يجب أن لايغيب عن بالنا بان النضال الحالي ماهو إلا صراع في أروقة المؤسسات والحكومات، والمنضربها من كان له اليد الطول في مخزون العلم والثقافة والتاريخ، حتى يتسنى أن يخوض ثمار هذه الحروب الطاحنة.

والنجاح كفيل أولا وقبل كل شيء يدعم حكومة الإقليم على مشاريع الحضارية و المواكبة التطورات للشعوب المتقدمة لأجل تحقيق أهدافنا في إحقاق العدل والمسا وات وتهيئة مجتمع مخزن قادر على فهم الواقع واستيعاب المتطلبات العصرية.

ونأمل عن عزوجل أن يذلل لنا الصعاب، ويوفقنا في سعانا والله من وراء القصد.



# هەرەمە ئەمەریکیەکان

ژمارەیەك لەمیللەتە کۆنەکان لەئەمەریکای ناوەڕاست وباشوور هەرەمیان دروستکردووە، ئەوەبوو هەرەمەکانی خان خانەیی کۆتا ڕاستیان دروستکردووە، وە بەرزترین شوێنی هەرەمە ڕاستەکەیان وەکو سەکۆ بۆ بنیاتنانی پەرستگاکانیان بەکارهێناوە.

بۆ نموونە: مۆتشیکا لەپیرۆ هەرمی گەورەیان لە(طوب) بنیات ناوە. پەرستگای خۆر لەنزیك ترجیلۆی ئێست لەسەر کەناری باکوری پیرۆ، هەرەمێکی پلەپلەیی تێدایە، کە لەسەر بنکەیەکی پلەپلەیی بنیاتنراوە. هەروەها مایا کۆنەکان لە ئەمەریکای ناوەڕاست چەند گۆڕستانێکی کەڵەکەبویان لەسەر شێوەی هەرەم دروستکردوە، لەسەریشی پەرستگایان بنیاتناوە.

هەروەها تولتیك لەناوەڕاستی مەکسیك چەندەها هەرەمی گەورەی پلەپلەییان دروستکردووە، یەکێك لەم هەرەمانە لە شکولایە ویە یەکێك لەگەورەترین دامەزراوەی جیهانی دەژمێردرێت.

هەروەها کۆمەڵێك هەرەمی دی کە دەگەڕێنەوە سەر تولتیك هەرەمە گەورەکانی ڕۆژ ومانگیان دروستکردووە، کە تاکو ئێستاش ماون لەتیوتیواکان نزیك مەکسیکۆسیتی.

ئیسپانەکان زۆربەی هەرەمەکانی ئیمپراتۆریەتی ئەزەتیکیەکانیان لە مەکسیك ڕووخاند. ئەم هەرەمانەش بەهەمان شێوەی هەرەمە ئەمەریکیەکانی

تـر بەخانەخانـە وسـەکۆدار دروسـتکرابوون، کـە لەبـەرزترین ئاسـتی ئـەم سـەکۆیانە پەرستگا دامـەزرابوون. وە گـەورەترینیان دووانیـان بـوو، کـە لـە تینوشتیلان(مەکسیکوسیتی ئێستا) دروستکرابوون.

## چینییەکان بەر لە کریستۆفەر کۆلۆمبس هەردوو ئەمەریکایان دۆزیوەتەوە:

بـەپێی ئـەو نەخـشەییەیی کـە لەمەدواییانـە دۆزرایـەوە لـەبێجین لەچـین پـسپۆران وا دادەنێن کـە چـینییەکان پـێش کریـستۆفەر کۆلـۆمبس(columbus) هـەردوو ئەمـەریکا(بـاکور وباشـور)یـان دۆزبێتـەوە، گوایـە یەکـەمجار لەلایـەن عەمیدی چینی Zhengدۆزرابێتـەوە نەك لەلایەن کۆلۆمبسەوە کە ئێمە لەکتێبەکانی مێژوودا وا فێربووین لەلایـەن کریستۆفەرەوە لەساڵی ١٤٩٢ دۆزراوەتەوە.



لەم نەخشە نوێ یـەدا زۆر بـەجوانی و وردێکـی مـەزن نەخـشەی ئەفـەریقا وهەردوو ئەمـەریکا (باکور و باشور) وئوسـترالیا تێدا بـەڕوونی دیارە. ئـەم نەخشەیە بە بڕی ٥٠٠ کڕاوە لەبازرگانیکی کتێب فرۆش لەشـەنگای، لەگـەڵ ئەوەی ئەم نەخشەیە لەساڵی ١٧٦٣ دروسـتکراوە، بـەڵام ئـەو دەڵێت: ئەمـە دانەیەکی کۆپێکراوی ئەسڵەکەیەتی کە دەگەڕێتـەوە بۆ سـاڵی ١٤١٦ واتـە زیاتر لەحەفتا ساڵ بەر لەدۆزینەوەکەی کۆلۆمبس.

زانایـان ئـەم نـەخشـەیـە بەئەسڵ دەزانـن، وە سـەلـماندوشیـانە کـە

نەخشەیەکی ئەسڵە.

جینیە ستیڤن لەگۆڤاری ئابوری دەڵێت: ئەم نەخشە نوێیە پارچەیەکی گرنگ وەسف دەکات ودەڵێت: لەناو نەخشەکەدا جیهان بەجوانی ورووني دیارە، وە زۆر بەئاسانی دەتوانین کیشوەرەکان لێکدی جیابکەینەوە.

سەرچاوە:

سایتی BBC Online.

## چەند زانیارییەك لە مێژووی فێرکردن لە عێراقدا

### بنیادنانی هەندێ قوتابخانە بە بەرتیل:

ئەم چیرۆکە خوالێخۆشبوو حکمت سلێمان خوی بۆی گێڕامەوە، لەڕاستیدا ئەم چیرۆکە ئەوە دەردەخات کە چۆن توانیویەتی سێ بینای قوتابخانە بەپارەی بەرتیل دروست بکات، ئەو کاتە حکمت سلێمان بەڕێوبەری مەعاریف بوو لەبەغداد، کە ئەو هەڵساوە بەپێشکەشکردنی بەرتیل بەجاوید پاشا والی بەغداد.

- ووتی: لەنێوان من وجاوید پاشای والی بەغداد دۆستایەتیەکمان هەبوو، من ئێوارەی هەموو ڕۆژێك سەردانم کردووە.

لەیەك لەئێوراەکان بینیم زۆر غەمبار بوو وە توڕەیی بەڕوویەوە دیاربوو، کە بەو جۆرە بینیم پرسیم لێی:

ئەمڕۆ توڕە دەتبینم پاشا، هەواڵ چییە؟

– ووتی(جاوید پاشا): ڕازی دەبیت بەرتیل خۆر بم.

– ووتم(حکمت پاشا): نەخێر، بەڵام چ باسە؟

– پاشا ووتی: ئەمڕۆ دوو کەس لەخەڵکی نەجەف هاتوون بۆ لام بڕی (٤٠٠٠)لیرەی ئالتونیان بۆ هێناوم، داوایان لێدەکردم کە یەکێکیان هەڵبژێرم بە(کلیلدار) لەنەجەف لەبەرامبەر ئەو بڕە پارەیە.

– ووتم: ئەی تۆ چیت کرد؟

– ووتی: یەکسەر دەرم کردنە دەرەوە.

– ووتم: نەخێر پاشا تۆ هەڵەیەت، من وادەبینم ئەو بڕە پارەیەیان لێ وەرگری.

– ووتی: واتە تۆ دەتەوێت بەرتیل بخۆم!

– ووتم: نەخێر گەورەم، لێیان وەرگرە و بیسپێرە بەمن تاوەکو هەندێ بینای قوتابخانەی پێ دروست بکەم.

– ووتی: خۆ وەڵڵا ئەوەش بیرێکی باشە.

– ووتم: ئەو کارە لێگەڕێ بۆ من، من بەدوایاندا دەگەڕێم، پێیان دەڵێم والی ئێوەی دەوێت تا ئەوەی کە هاتن بۆ نوسینگەکەت پاش ماوەیەکیش منیش دێمە نوسینگەکەت وئەو کات لەبەردەمیاندا دەڵێیت: حکمت ئەو بڕە پارەیە هەڵگرە و بینای قوتابخانەی پێ دروست بکە.

بەم شێوەیە پیلانەکە تەواو بوو پارەکەم وەرگرت وبە بانکم سپارد ولیژنەیەکم لەخۆم وعەبدلقادر خضری وعزت فارسی بۆ سەرپەرشتی تێچوەکانی پێك هێنا، بەم بڕە پارەیە سێ بینای قوتابخانەم دروستکرد کە تا ئێستاش ماون. ئەو قوتابخانانەش بریتین: لەقوتابخانەی خاتونیە ودار

بعثات(خانەی نێردەکان) وقوتابخانەی ئیتیجاد کە دواتر بەمەئمونیە ناونرا.

## 📖 مێژووی فێرکردنی کچان لە عێراقدا:

لەگەڵ ئەو هەموو بۆڵەبۆڵە وتانە وتەشەرەی خەڵکی، دەنگی هەندێ لەڕۆشنفکران بەرزبویەوە لەناو بەغداد بۆ کردنەوەی قوتابخانە، وداوایان دەکرد قوتابخانە بۆ کچانی موسڵمان بکرێتەوە، بەڵام دەسەڵات لەبەرامبەر ئەو داوایە کەوتبوە تەنگژەوە لەلایەك بەهۆی تێڕوانینی خەڵکی ولەلایەکی دی نەبوونی مامۆستایان وفێرکارانی ئافرەت کە بەتوانا بێت بۆ وتنەوەی وانە لەکاتی کردنەوەی قوتابخانە.

پاش گەڕان، پەروەرشیاری ئینگلیزی مس کلی خۆی پێشکەشکرد تا بەڕێوبەرایەتی ئەو قوتابخانەیە بگرێتە ئەستۆ.

لەسەرەتاکانی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٩ مس کلی گەیشتە بەغداد ودەست بەکاربوو لەبارەگای (نظارة معارف) وە لەمێژووی ١٩١٩/١١/٧ لەڕۆژنامە ڕاگەیاندنێك بڵاوبووە وتێدا ئامارەی بەوەکردبوو کە بەم نزیکانە قوتابخانەی فەرمی بۆ کچان دەکرێتەوە، ئینجا ئەو خانووەیەی کەدەکەوێتە گەڕەکی مەیدان کردیانە بارەگای قوتابخانەکە.

وە لەڕۆژی ١٩٢٠/١/١٩ ئاهەنگێکی گەورە بۆ کردنەوەی ئەم قوتابخانەیە سازکرا بەئامادەبوونی مس بیل وژمارەیەك لەئافرەتانی عێراقی وبیانی، کە هەندێ وتاری تێیدا درا، کە تێکڕای وتارەکان جەختی لەسەر هاندانی فێرکردنی ژنان وکچان دەکردەوە.

سەرباری هاندان وفریودان وئارەزوومەندکردن، کەچی ژمارەی ئەو کچانەی کە ناوی خۆیان تۆمارکرد لەهەشت کەس تێنەدەپەڕی. ئەم دەستە

نوێیە نوێنەری پۆلی یەکەم بوون لەکچان لەمێژووی فێرکردن لەعێراقدا ئەمەش ناوەکانیانن:( پاکیزە واصف- صفیە واصف- حسیبە الشێخ داود- صبیحە الشێخ داود- سلیمەخضر- مدیحە توفیق الخالدی-عفیفە توفیق الخالدی- مدیحە صالح)، شایەنی باسە لەرۆژی ١٩٢٠/١/٢١ خوێندن لەم قوتابخانەیە دەستی پێکرد.

📖 خوێندن لەقوتابخانە سەرەتاییەکان چوار ساڵ بوو، پاشان ئەزمونێکی میری(حکومی) بۆ قوتابیانی پۆلی چوارەم ئەنجامدەدرا.

وە یەکەم تاقیکردنەوەی میری (حکومی) کە بۆ ئەو قوتابیانە ئەنجام درا، کە بە(بەکەلۆریا) ناسرا لەرۆژی ٢٦-٢٩ مایسی ١٩١٧ بوو، و لەو کاتەوەش بەم ناوە ناودەبرێت.

سەرچاوە:

عبدالرزاق هلالي، حقائق وطرائف من تاريخ التعليم في العراق، مجلة افاق عربية، عدد١١، تموز١٩٧٨، ص٩٨-١٠٥.



# میرنشینی سۆران

✍ نەورۆز عەلی کاکە ئەمین

یەکێکە لەمیرنشینە کوردییە کۆنەکانە، دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ پێش سوڵتان سەلیم. دامەزرێنەرەکەی عیسای کوڕی کەلۆسە. شاری هەولێر پایتەختی ئەم میرنشینە بووە لەسەردەمی میر (عیزەدین شێردا) کە لەلایەن سوڵتان سلێمانی قانوونی لەساڵی ١٥٣٤ز دا، لەسێدارەیدا. پایتەختەکانی

ئەم میرنشینە بریتین لەهەولێر وخەلیفان ودوین ورەواندز. بەناوبانگترین میری ئەم میرنشینە میر محەمەدی گەورە بوو کە لەساڵی ۱۸۱۳ز، نازناوی پاشایەتی لەخۆی ناوە. میر پاش وەرگرتنی فەرمانڕەوایی میرنشینەکەی دەستی دایە بەهێزکردنی میرنشینەکەی، لەگرنگترین کارەکانی:

۱- دامەزراندنی چەند لیژنەیەك بۆ سەرپەرشتی کاروباری ئیداری میرنشینەکە وەکو ئەنجوومەنی سەروەری کە خۆی سەرۆکی بوو.

۲- دامەزراندنی لیژنەی سەربازی بەسەرۆکایەتی ئەحمەد بەگی برای.

۳-پێکهێنانی لیژنەی زانایان بۆ سەرپەرشتی کردنی حوکمەکانی شەریعەت.

٤-لیژنەی بنیاتنان و دروستکردن بۆ دروست کردنی پرد وشووره وسەنگەر.

٥-لیژنەی بازرگانی بۆ سەرپەرشتی کردنی کاروباری بازرگانی وبازاڕ.

سکەی پوولی دەرکرد کە لەسەر ڕوویەکی پوولەکە مۆری میر محەمەد دیارە، لەدیوەکەی تریشی نووسراوە لەئەستەنبول لێدراوە.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش هەستاوە بەدروستکردنی خەنجەرو دانانی سنوور بۆ دزی و ڕاو ورووت وتالانی. سەرەڕای ئەوانەش سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە نامەکاری هەبووە لە نێوان میر محەمەد و ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشای میسر بۆ یەکخستنی هەوڵەکانیان دژی عوسمانییەکان، بەلام ئێمە هیچ بەلگەیەکمان لە بەردەستدا نییە، جگە لەوەی کە حسێن حوزنی لەملێخاوە گێڕاویەتیەوە.

میر محەمەد زۆر دەسەلاتی فراوانبوو تا وای لێهات ڕووبەرێکی گەورەی کەوتە بەردەست، عوسمانییەکان لەم هەنگاوانەی میر نیگەران بیون دەستیان دایە هێرشێکی گەورە، کە سەرکردایەتیان دایە دەست سەرۆك

وەزیران سەدری ئەعزەمی پێشوو محەمەد ڕەشید پاشا. سەرەڕای ئەمەش ئێران هێزەکانی کۆکردەوە بۆ لێدانی میر لەدیوەکەی ترەوە. لەدوایدا میر ناچار بوو خۆی بەدەستەوە بدات بۆ ئەوەی قەسابخانە لەمیرنشینەکەیدا ڕوونەدا ودوای نێردرا بۆ ئەستەنبول لەڕێگەی گەڕانەوەدا کوژرا. لەدوای میر محمد وورده وورده میرنشینەکە بەرەو ڕووخان چوو تاوای لێهات لەساڵی ١٨٣٦ز دا ڕووخا. هۆکارەکانی ڕووخانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١-گردبوونەوەی هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەسێ لاوە بەسەرکردایەتی هەریەکە لەمحەمەد ڕەشید پاشا و محەمەد پاشای بەیرەقدار والی موسڵ وعەلی ڕەزا پاشای لازی والی بەغدا بەپشتیوانی هێزێکی گەورەی ئێران.

٢- پشتگیری بەریتانیا بۆ لایەنی عوسمانی.

٣- نەبوونی هیچ پشتیوانیەك بۆ هێزەکانی محەمەد پاشا.

٤- نەبوونی هاوکاری لەنێوان میرنشینی سۆران ومیرنشینەکانی تردا بۆ فریاکەوتنی یەکتری لەکاتی پێویستدا.

هۆکاری دیکەش هەن بۆ ڕووخانی میرنشینەکە وەکو ئەوەی هەندێك دەیگەڕێننەوە بۆ فەتوای مەلای خەتێ، وە هەروەها نەبوونی نەخوێندەواری ورۆشنبیری.

## سەرچاوەکان:

١- شەرەفخانی بەدلیسی: الشرفنامە، ترجمة: ملا جمیل بندی ڕۆژبەیانی، بغداد، ١٩٥٣.
٢- صالح قەفتان: مێژووی گەلی کورد لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، بەغداد،١٩٦٩.

٣- د.عبدالله عەلیاوەیی: کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان.

ﮪﮪﮪ

## فەرهەنگی ئاینەکان

# هیندۆسی

هیندۆسی ئاینێکی بت پەرستیە، وزۆربەی خەڵکی هیندستان باوەڕیان بەم ئاینە هەیە وئاینی زۆربەی گەلە، ئەم ئاینە لەکاروانێکی دوور ودرێژ لەسەدەی ١٥پ.ز، و بگرە تا ئێستا فۆرمەلە بووە ودروست بووە، ئاینێکە بەهای گیانی(روح) وکردەیی لەخۆگرتوە سەرباری بنەمای یاسایی وڕێکخستن. چەند خواوەندی (فرە خواوەندی) دەپەرستن بەپێ جۆر وپەیوەستی کار هەموو ناوچەیەك خواوەندێك و هەموو کارێك یان دیاردەیەك خواوەندێکی هەیە.

**دامەزراندن:**

- دامەزرێنەرێکی دیاریکراوی نییە وزۆربەی نوسراوەکانیشی دانەرێکی دیاریکراوی نییە.
- ئارییەکان کە بەرەو هیند کشان لەسەدەی ١٥پ.ز، بەدامەزرێنەری بەرایی ئەم دینە دادەنرێن.
- لەسەدەی ٨پ.ز، ئاینی هیندۆسی لەسەر دەستی کاهینە بەراهیمەکان کە وایان دادەنا سروشت وتوخمێکی خواوەندیان هەیە.
- دووبارە ئەم ئاینە پەرەیسەند لە سەدەی ٢پ.ز لە ڕێگای یاساکانی

(منوشاستر).

**کتێبەکانیان:**

١- ویدا (ڤیدا) ٢- یاساکانی منوشاستر ٣- هەندێ پەڕاوی تر.

١- ویدا(ڤیدا): لەژیانی ئارییەکان دەدوێ وپلەبەندی باڵابونی ئەقل لەسادەگیەوە بۆ هەستی فەلسەفی دەخاتەڕوو، وە نزای تێدایە کە کۆتایی بەگومان دێت. لەپێنج کتێب پێك دێت:

ا- ریج ویدا: دەگەڕێتەوە بۆ ٢٠٠٠ساڵ پ.ز، و باس لەخواوەندەکانی ئەندرا وفارون ..هتد دەکات.

ب- یساجور ویدا: ڕەهبانەکان لەکاتی پێشکەشکردنی قوربانی دەیخوێنن.

ج- ساما ویدا: کۆمەڵە سرودێکە لەکاتی نوێژ ونزادا دەخوێندرێت.

د- ئەثار ویدا: بۆ لابردنی سیحر وخورافیات..هتد. کە کۆمەڵە ووتارێکە. وە هەریەك لەمانە دابەش دەبن بۆ چوار بەش:

ا- سمیهتا: نوێنەری ئاینزای سروشت ونزای گەلانی هیندیە بەر لەکشانی ئارییەکان بۆ ئەم وڵاتە.

ب- بەراهمن: بەراهیمەکان بۆ نیشتەجێبوانی ووڵاتی خۆیان پێشکەشی دەکەن لەجۆرەها قوربانی.

ج- ئارانیاك: نوێژ ونزایە شێخەکانیان لەکاتی مانەوەیان لەئەشکەوت ودارستان دەیخوێنن.

د- ئابا نیشادا: نهێنی و بینینە دەروونییەکانە. بۆ عارفانی سۆفی.

٢- یاساکانی منوشاستر: لە سەدەی ٣پ.ز، لەسەردەمی ویدی دووەم دانراوە، سەردەمی سەرکەوتنی هیندۆسی بەسەر ئیلحاد(بوزی- جینی).

٣- هەندێ پەڕاوی تری: وەك:

أ- مهابهارتا: داستانێکی هیندییە و دانەرەکەی (ویاس کوڕی بوسرایە) لەساڵی ٩٥٠پ.ز.

ب- کیتا: وەسفی جەنگی نێوخۆی نێو ئەمیرەکان لەیەك بنەماڵەی پاشایەتیدا دەکات. دەدرێتەپاڵ کرشنا. ودیدگای فەلسەفی وکۆمەڵایەتی لە خۆدەگرێت.

ج- یوجا وئەسستها: باسی لاهوتی وفەلسەفی لەخۆدەگرێت بە شەست وچوار هەزار بەیت.

د- ڕامایانا: گرنگی بەهزری سیاسی ودەستوری دەدات و وتارێکی پاشا (ڕاما)ش، لەخۆدەگرێت.

**تێڕوانینی هیندۆسی بۆ خواوەند:** هیندۆسەکان سێ ڕوانگەیان هەیە بۆ خواوەند:

ا- یەکتاپەرستی ب- فرەیی ج- تەسلیس(التثلیث)

ب- فرەیی: بڕوایان وایە هەموو سروشتێك سود وزیانی هەیە.

ج- تەسلیس(التثلیث): لەسەدەی ٧پ.ز، کاهینەکان خواوەندەکانیان لەیەك خودا کۆکردەوە:

- براهما: لەبووندا. - فشنو: هاندان. - سیفا: هەپرونکردن و بەهەلاکەتبردن.

## چینەکانی نێو کۆمەڵگەی هیندۆسی:

ئەم چینانە ئەزەلین و لەدروستکراوی یەزدانن:

١- بەراهیمە ٢- کاشتر ٣- ویش ٤- شودەر.

**بیروباوەڕییان:** بیروباوەڕیان لەچوار ڕەگەزدا خۆ دەنوێنێ، ئەوەش ئەمانەن:
١- کارما ٢- دۆنادۆن(تناسخ ارواح) ٣- یەکبونی بونەوەر(وحدة وجود) ٤- دەرچوون(انطلاق).
١- کارما: یاسای پاداشت، سیستەمی گەردوون لەسەر یەکسانی و دادپەروەری تەواو وەستاوە.
٢- دۆنادۆن: ئەگەر یەکێك مرد گیانی دەردەچێت وجەستەکەی لەناو دەچێت وگیانەکەشی دەچێتە جەستەی یەکێکی دی.
٣- دەرچوون: چاکەکار وخراپەکاریش ژیانی نوێ و دووبارەی لێوە بەرهەم دێت تاوەکو گیانی(روح) پاداشت یان سزا بدرێت و وەربگرێت، لەسەرئەوەی لەخولی پێشوو پێشکەشیکردووە.
٤- یەکبونی بونەوەر(وحدة وجود): مرۆڤ لەتوانایدایە بیروباوەڕ وسیستەم و دامەزراوە دروست بکات و پارێزگاریشی لێبکات وبیشیڕوخێنێ، بەمەش مرۆڤ بەرەنگاری یەزدان دەکات. وگیانیش ئەزەلیە وبەردەوامە وخەلقێنراوە وپەیوەندی نێوان خواوەند ومرۆڤیش وەك پەیوەندی ئاگر وپرشکی ئاگر وایە.

**هەندێ بیروباوەڕی تریشیان هەیە:**

- جەستە دەسوتێنرێت پاش مردنی چونکە بڕوایان وایە لەو ڕێگایەوە گیان بەرز دەفڕێ وبەشێوەیەکی ستونی تا مەلەکوتی بەرز وبالا.
- پیرۆزکردنی مانگا.
- سێ جیهان هەیە:

١- جیهانی بالا وبەرز: جیهانی فریشتە وپەرییەکان.

٢- جیهانی مرۆڤ: بارەگای ئادەمی بەهاتنیان.

٣- جیهانی دۆزەخ: ئەمەش بۆ تاوانکار وگوناهبارانە.

- نابێت پیاو، ئافرەت لەچینی سەرووی خۆی بخوازێت، بەڵام پێچەوانەوە ئاساییە.

- یاسا نابێت باج وپیتاك لە بەراهیمەکان بسەنێت.

- چینی شودەر کەمترن لە گیانداران و سوکترن لەسەگ (بەپێ یاسای منو).

- کفارەتی کوشتنی پیاوێکی شودەری لەگەڵ کوشتنی سەگ و یان بۆق و پشیلە و ڕیشۆڵە و کونەبەبوو یەکسانن.

- تەنها بەراهیمەکان توانایان هەیە وڕێیان پێدراوە پەڕوای پیرۆز بنوسن.

- خوا لە بەراهیمەکان خۆشبووە بۆ هەتا هەتایی.

- ئەگەر بەراهیمیەك هەق بێت بکوژرێت، ئەوا دەسەلاتدار بۆی نییە بیکوژێت تەنها تاشینی سەری نەبێت بەلام لە خوار چینی بەراهیمە دەکوژرێت.

## جەنگی سارد

## Cold War

زاراوەیەکی نوێیە، پاش جەنگی جیهانی دووەم بلاوبوە. مەبەست لەئەم ووشەیە ململانێی نێوان دوو دەوڵەت یان کۆمەڵە دەوڵەتێکە کە ململانێیان هەبێت، ئامانج تێیدا ئەو ئامانجەیە کە جەنگی چەکداری(جەنگی گەرم) بۆی دەکۆشێ لە ڕووی شکانی مەعنەویاتی دوژمن وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ

خۆبەدەستەوەدانی لەشەڕدا.

ئەوەش بە بەکارهێنانی پلان یا ستراتیژیکی سیاسی یان ئابوری، وە هەروەها بەکارهێنانی پروپاگەندەی ڕادیۆیی وخوڵقاندنی پروپاگەندە وتۆمەتی مەبەستدار ودرۆ، وە لێدوانی ڕۆژنامەوانی کە بەرەنگاری وئیستفزاز دەگرێتەخۆ، وە هەروەها سازدانی نمایشی سەربازی وهەڕەشەکانی ڕۆژنامە وئێزگەیی وبلاوکردنەوەی بەلگەنامەی نهێنی وبەخش کردنی پروپاگەندەی مەبەستدار وپاشەکشەکردن لەکۆنگرە نێودەوڵەتییەکان ورکابەریکردنی لەمەیدانی پێشکەوتنی زانستی وتەکنەلۆژی، هەروەها لەمەیدانەکانی ئابوری لەداخستن یان نگرۆکردنی بازار وگەمارۆی ئابوری. تێکڕای هەموو ئەو هەولانە بۆ پەرتەوازەکردنی بەرەی ناوخۆیی‌ونانەوەی جیاوازییە.

## سەرچاوە:

١- سموحي فوق العادة، معجم الدبلوماسية والشؤون الدولية، مكتبة لبنان-بيروت، ص٤٦٥.

٢- يحيى محمد نبهان، معجم مصطلحات الجغرافيا والتاريخ، ط١، دار يانا للنشر والتوزيع، ٢٠٠٣م، ص١٥٧.

# ناونیشانی نامە زانستیەکان



ئەم ناونیشانانەی خوارەوە ناونیشانی ئەو نامە ماستەر وتێزە دکتۆرایانەیە، کە لەبەشی مێژوو کۆلیژی ئاداب لە زانکۆی سەلاحەدین لەماوەی سالآنی ١٩٩٠ تا ٢٠٠٦ تاوتوێکراون وبەدەستهاتوون.

| ناونیشانی نامەی ماستەر | |
|---|---|
| ئاکۆ برهان محمد | الحياة العلمية في دياربكر وجزيرة ابن عمر من القرن الخامس حتى نهاية القرن السابع الهجري ((١١-١٣)). |
| ئومید ابراهيم جوزەلی | الحياة العلمية فی اربيل من القرن السادس حتى القرن السابع الهجريين. |
| احمد عبدالعزيز محمود | الهذبانيون فی اذربيجان واربل والجزيرة الفراتية (٢٩٣-٦٥٦هـ)، دراسة السياسية والحضارية. |
| احمد ميرزا ميرزا | غربي اقليم الجبال في صدر الاسلام |
| اسماعيل شكر رسول | الشداديون فی بلاد اران (٣٤٠- ٥٩٥هـ)، دراسة حضارية |
| ياسين خالد حسين | كورستان الشرقية-دراسة في الحركة التحريرية القومية في مابين الحربين((١٩١٨-١٩٣٩)). |
| حكيم احمد مام بكر | عماد الدين الكاتب الاصفهاني ومنهجه التاريخي من خلال كتابه ((البرق الشامي)) |
| حيدر لشكري خضر | الكرد في المعرفة التأريخية الاسلامية (دراسة تحليلية ونقدية) |
| درويش يوسف حسن | الاسرة الشهرزورية ودورها السياسي والحضاري |
| دلێر فرحان اسماعيل | الكرد في اليمن ((٥٦٩-٧٥٨هـ)) |
| رمضان شريف زوبير | لورستان من((٥٥٠-٨٢٨هـ))دراسة في الاحوال السياسية والحضارية |
| شهله برهان عبدالله | الحياة الثقافية في الكوفة في العهد الراشدين |
| عبدالله محمد على | الكرد فی عهد المغول (٦١٧-٧٧٦هـ) دراسة فی التاريخ السياسي |

| | |
|---|---|
| عدنان زياد فرحان | الكرد اليزيديون في كوردستان الجنوبية دراسة اقتصادية اجتماعية في بداية قرن التاسع عشر حتى نهاية الحرب العالمية الاولى. |
| زرارصديق توفيق | الكرد في العصرالعباسي حتى مجيء البويهيين ((١٣٢-٢١٤هـ)) ((٧٤٩-٩٤٦م))دراسة في تاريخه السياسي. |
| سازان حسين ابراهيم | الملك المظفر تقي الدين عمر شاهنشاه الايوبي |
| سروه اسعد صابر | كوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مسأله الموصل((١٩١٤-١٩٢٦)) |
| سعدي عثمان حسين | كوردستان الامبراطوريه العثمانيه -دراسة في تطويرها السياسي((١٥١٤-١٨٥١)) |
| سلام حسن طه | جزيرة ابن عمر فى قرنين السادس والسابع الهجرى ( دراسة السياسية الحضارية) |
| عزيزحسن عزيز | الحركة التحررية في كوردستان الجنوبية((١٩٣٩-١٩٤٥)) |
| صلاح محمد سليم محمود | إماره بوتان في عهد مير بدرخان ((١٨١٢-١٨٤٧م)) دراسة سياسية |
| طارق محمد ئه ورحيم | المستشرق مينورسكي واسهاماته في دراسة الكرد العصر الاسلامي |
| علي عادل حسين | مكة في العصر العباسي ((١٣٢-٢٤٧هـ))دراسة سياسة الحضارية |
| عماد عبد القادر محمد | الكاشيون دراسة السياسية الحضارية((١٥٩٥-١١٦٢ق-م)) |
| | |
| فائزة محمد عزت | الكرد فى اقليم الجزيرة وشهرزور فى صدر الاسلام(٥١٦-١٢٣هـ) دراسة تاريخ السياسى |
| قادر محمد حسين | الامارة الكردية خلال عصر البوهي دراسة في علاقتها السياسية والاقتصادية |
| كامران احمد محمد امين | كوردستان لەنێوان ململانێی ئیودەوڵەتی وناوچەیی دا (١٨٩٠- ١٨٣٢م) |
| كامل اسود قادر | البحرية الأيوبية((٥٦٧-٦٤٨هـ)) |
| كاوه فريق احمد | إمارة بادينان ((١٧٠٠-١٨٤٢))دراسة احتماعية والثقافية. |
| كلثوم جميل عبدالواحد | الحياة الدينية والاجتماعية والاقتصادية لبلاد الكرد في عهدالساسانين |
| كوثر إسماعيل حسين | لحوال الاقتصاية الاجتماعية في اقليم ازربيجان واران خلال القرن الرابع والخامس الهجري |
| كوڤان محمد احمد | الملك الاشرف موسى بن ملك العادل الايوبي((٥٧٦-٦٢٥هـ)) |

| | |
|---|---|
| محمدعبدالله کاکە سور | دور الضباط لكرد السياسي والثقافي في حركة الكردية في كوردستان الجنوبية((١٩٢١–١٩٤٥)) |
| مقداد حسين طه | الخدمات الصحية والاجتماعية في الجزيرة واعد خلال القرنيين الخامس والسادس الهجري. |
| مهدی قادر خضر | الحياة العلمية في غرب اقليم الجبال في قرنين الرابع والخامس الهجريين \ العاشروالحادي عشر الميلاد |
| میڤان عارف عبالرحمن | الحركة القومية التحررية في كوردستان الجنوبية((١٩٥٨–١٩٦٣)) |
| هوگر تاهر توفیق | دور الصحافة الكردية في تطوير الوعي القومي الكردي ((١٨٩٧–١٩١٨)) |
| ئەبەز مجید امین | المشطوب الهكاری دراسة دولة الهكارين من حروب الصليبية |
| نشتیمان بشیرمحمد | الاحوال السياسية والاجتماعية والاقتصادية لغرب اقليم جبال خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين /العاشر والحادى عاشر الميلاديين |
| نازنازمحمد عبدالقادر | میرنشینەکانی کوردستانی رۆژهەلات لەسەردەمی فەرمانرەوایی قاجاری دا |
| رابعة فتاح شێخ محمد | کوردستان لەسەردەی نوێەمی کۆچی – پازدەی زاینی |
| مهدی محمد قادر | پەرسندنە سیاسیەکان لە کوردستانی عێراق (١٩٤٥–١٩٥٨) |

## تێزی دکتۆرا

| | |
|---|---|
| ئەبەز مجید امین | الاستخبارات في عهد صلاح الدين |
| موسى مصطفى إبراهيم | الحياة السياسية في بلاد الشام((٦٣٤–٩٥٨م))((دراسة في العلاقة الداخلية)) |
| عبدالله محمد علي | كوردستان في العهد الدولة العثمانية من منتصف القرن التاسع عشر الى بدء الحرب العالمية الاولى ((دراسة من التاريخ السياسي)) |
| احمد عبدالعزيز | الامن في بغداد خلال عصر العباسي الاولى ((١٤٥–٢٤٧هـ)) |
| إسماعيل شكر رسول | اربيل دراسة تاريخية في دورها الفكري والسياسي ((١٩٣٩–١٩٥٨)) |
| سلام حسن طه | إنتشار الاسلام في الهند دراسة في التاثيرات الحضارية |
| احمد میرزا میرزا | السجن في صدر الاسلام ((١٣٢–٦٢٢هـ)) |
| نشتیمان بشیر محمد | الكرد والسلاجقة |
| زرار صديق توفيق | كوردستان في العهد الجلائري |
| سعدي عثمان حسين | كوردستان الجنوبية ولايتي بغداد والموصل ((دراسة في العلاقة الادارية |

| | |
|---|---|
| | السياسية والاقتصادية |
| حكيم احمد مام بكر | الكرد وبلادهم عند البلدانيين والرحالة المسلمين ((٢٣٠-٦٢٦هـ)) |
| مهدي قادر خضر | الأمن في مصر في العصر الايوبي |
| قادر محمد حسن | الكرد في مصروبلاد الشام العصر المماليك البحرية |
| صلاح محمد سليم | الاسرة البدرخانية نشاطاتها السياسية والثقافية خلال((١٩٠٠-١٩٥٠)) |
| شوكت عارف محمد | الحياة الفكرية في مصر خلال عصر الايوبي((٥٦٧-٦٤٨هـ))((١١٧١-١٢٥٠)) |
| درويش يوسف حسن | بلاد هكاري((دراسة سياسي حضاري من ((٣٣٤-٧٢٧هـ))((٩٤٥-١٣٢٦م)) |
| محمد عبدالله كاكه سور | گەشەکردنی خوێندنی فەرمی لە کوردستانی عێراق دا (١٩٢١-١٩٥٨) |

## ئەو سایتانەی پێویستە سەردان بکرێن

هەوڵدەدەین هەر جارەی لەم گۆشەیەدا کۆمەڵە سایتێك تایبەت بەزانستە مرۆڤایەتیەکان بەگشتی و مێژوو بەتایبەتی بخەینەڕوو کە توێژەرانی مێژوو یان خوێنەرانی بابەتی مێژوویی وەك پیویستی و سەرچاوە سەردانی بکەن.

**- سایتی ( علوم انسانية )**

:www.Ulum.nl



ئەم سایتە چەندین بابەت و توێژینەوەی لەمەڕ زانستە مرۆڤایەتیەکان بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی لەخۆگرتوو. سەرباری ڕێنمایی کردنت بۆ چەندین سایتی تر لەو بوارەدا کە ناوی سایتەکانی داوە.

- سایتی (فسطاط)

www. Fustat.com

ئەم سایتە توێژینەوە و گەلێك وتاری مێژوویی پسپۆڕان و دکتۆر و توێژەرانی مێــــژوویی لــــە خۆگرتوو.

سەرباری دیاریکردنی چەندین بواری تر لە مێژوو وەك(نوێ و ئیـــــــــسلامی و هاوچـــەرخ...هتـــد). وە هــەروەها بــواری جـوگرافی وخستنەڕووی تازەترین کتێب و سەرچاوە کۆنەکان و هاوچەرخەکانیش.

– سایتی (تاریخ)

:www.Altareekh.com

ئەمـــەش یەکێکـــە لـــەو ســـایتە عەرەبیانەی بایەخێکی تایبـەتی بە مێـژوو دەدا کـە تێـدا دکتـۆرا و توێژەرانی مێژوویی وتـاری مێـژووی وتوێژینـەوەی تێـدا بڵاودەکەنـەوە.

ســـەرباری گرنگـــی دانـــی بـــە چـــەندین بـــواری تـــر لـــە زانـــستە مرۆڤایەتیەکان(کۆمەڵایەتی،جوگرافی..)

- سایتی (دلیل العرب الشامل– مواقع الفنون–الادب و التاریخ)

www.star٢٨.com



ئـەم سـایتە وەك ڕێبـەرێكی سـایت وبابەتی جۆراوجۆر وایە و تێدا چەندین ماڵپـەڕ وبابـەتی مێـژوویی وزانـستە مرۆڤایـەتی وئـەدەبی بـە زمانـەكانی ئینگلیـزی وعـەرەبی بـەپێی گـشت بوارەكـان(مێـژوو، ئـاینی، سیاسـی، فكری...هتد) لـەخۆگـرتووە كـە تـوێژەر دەتوانێت یەكسەر بەكلێـك كردنـی بچێتە نێو ئەوسایتانە چونـكە ڕاستەخۆ لەسەر ماڵپەڕەكە لینك كراوە.

# فەرهەنگی وولاتان

## ئەلمانیا

***ناوی وولات: ( شێوەی درێژ ): **کۆماری ئەلمانیای یەکگرتوو.

***ناوی وولات ( شێوەی کورت ): **ئەلمانیا.

*** پایتەخت: **بەرلین

*** جوگرافیـا: **ئـەلمانیا دەکـەوێتـە کـیشوەری ئـەورووپی و سنورەکـەشـی بـە هەریەك لـە وولاتـانی نەمسا و بەلژیکا وچیك ودانیمارك وفەرەنسا و لۆکسمبۆرگ و هۆلەندا و سویسرا و پۆلەندا دەوردراوە.




– سنوری زەوی: ٣٦٢١کم، یان ٢,٤٤٩میل.

– ڕووبەری زەوی بەگشتی: ٣٥٧,٠٢١کم، یان ٧١٠,٢٢١ میل. – ڕووبەری ئاوی: ٧,٧٩١کم، یان ٤٨,٨٤٣ (میل)٥.

– گرنگترین ڕووباری ئەلمانیا: ڕاین و دانوب و ویسار و ئەلب. سێ لەمانـە لـەباکورەوە هەڵدەقوڵێن و دەرژێنـە نـاو دەریـای بـاکورەوە، وە دەریاچـەی کونـسانس(بـودیتس) گـەورەترین دەریاچـەیە و دەکـەوێتـە سـنوری نێـوان ئەلمانیا وسویسرا ونەمسا.

– ئـەڵمانیا دابەشـی پێنج ناوچـەی جـوگرافی جیـاواز دەبێـت لـەرووی سروشتیەوە: لەباکورەوە بۆ باشوور پێ دەشت وتەختە وباکور دەشت و گرد ونزمایی شاخ ورۆژئاوا وباشوور بان وشاخ وباشوریش گردی کاس.

– نزمترین خاڵی زەوی: نوندروف ٢٤٠م و ویلستر ٣،٥٤م.

– بەرزترین خاڵی زەوی: زوغستبیر ٩٦٢م.

* **ئـابوری ئـەڵمانیا:** پێنجـەم دەوڵەتـە لەجیهانـدا و تێکڕای گەشـەکردنی ئابوری لە بەرزبونەوەیەکی خێرادایە وبەجۆرێك لـەماوەی سـاڵانی ٢٠٠٠–٢٠٠٣ تەنها ١٪ بوو، بەڵام لە ٢٠٠٤ گەیشتە ١،٧٪.

– پێکهاتـــەی کـــەرتی ئـــابوری: کـــشتوکاڵ: ١٪، پیـــشەسازی:٣١٪، خزمەتگوزارییەکان:٦٨٪.

– بەدەوڵەمەندترین وپێشکەوتوترین ووڵات لە تەکنەلۆژیا دادەنرێت.

– بەرهەمـە کـشتوکاڵییەکان: بەرهەمـەکانی گـەنم، جـۆ، لۆکـە، شـەکر، میوەهات، بەراز، کێلگەی پەلەوەر، کەلەرم.

– بەرهەمە پیشەسازییەکان:ئاسن، پۆڵا، خەڵوز، چیمەنتۆ، کەرەستە، ئامێر، ئۆتۆمۆبیـــل، کەرەســـتەی ئـەلکـــترۆنی، خواردەمـــەنی، خواردنـــەوە غـازییەکان، کەشتی، چنراوەکان.

– داهاتە سروشتییەکان: خەڵوز، غازی سروشتی، خاوی ئاسن، مس، نیکل، یورانیۆم، پۆتاس، خوێ، کەرەستەی بینا، دار.

– هەندێ زانیاری تر: تێکڕای بەتاڵە: ١٢٪، هێزی کار: ٤٢،٣٢٠،٠٠٠، تێکڕای هـەڵاوسـان: ٢،٠٠٪، پـاشکـەوتی خێزان: ٣،٦، دانیشـتوانی خوار خەتـی هەژاری: ٠٪، تێکڕای سەرجەمی تاك: ٣٠،٤٠٠٪.

– تێکڕای گەشەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی: ١,٧٪.

– زەوی گونجاو بەکارهاتوو: ٣٣,٨٨٪، زەوی هەمیشەیی بۆ کشتوکاڵ: ٠,٦٥٪، زەوی بەراو: ٤,٨٥٪.

*** کۆمەلایەتی:**

– ژمارەی دانیشتوان: ٨٢,٤٢٢,٢٩٩.

– گروپە ئەتنییەکان: ئەڵمانی: ٩١,٥٪، تورکی: ٢,٤٪، ئەوانی تر: ٦,١٪ (بەشێکی زۆری پێکدێت لە یونانی و ئیتاڵی و ڕوسی و پۆلەندی و سربی و کرواتی و ئیسپانی).

– زمان: زمانی ئەڵمانی، زمانی دام و دەزگا و ڕاگەیاندنە، وە لەهەندێ ناوچە شێوەزارەکانی تریش ڕۆڵی هەیە و سەرباری بەکارهێنانی زمانی ڕوسی لە ئەڵمانیای ڕۆژهەلات.

– ئاین: پرۆتستانت: ٣٤٪، ڕۆمی کاسۆلیك: ٣٤٪، موسڵمان: ٣,٤٪، ئەوانەی هیچ ئینتمایەکیان نییە: ٢٨٪ .لەبنەڕەتدا ئەڵمانیا مەسیحیە و کۆمەڵگاکەشی عەلمانیە، لە ٣٧٪ لە دانیشتوانی ڕۆمی کاسۆلیك (بەشێکی زۆری لە باشور و ڕۆژئاوایە) و ٤٥٪ پرۆتستانت(بەشێکی زۆری لە باکور و ڕۆژهەلاتە).

– چەژنی نیشتمانی: ڕۆژی یەکگرتن ٣ یەنایەری ١٩٩٠.

– پەیکەری تەمەن: ٩–١٤: ١٤,١٪، ١٥–٦٤: ٦٦,٤٪، ٦٥ زیاتر: ١٩,٤٪.

– تێکڕای لە دایك بوون: ٨,٢٥ لە ١٠٠٠، تێکڕای مردن: ١٠,٦٢ لە ١٠٠٠.

– ڕێژەی گەشەکردنی دانیشتوان: ٠,٠٢٪.

– ڕۆژمێر: زاینی.

*ڕامیاری:

– جۆری حکومەت: کۆماری فیدراڵی.

– سەربەخۆیی: ١٨ یەنایەری١٨٧١ (یەکگرتنی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی).

– دەستور: ١٩٤٩/٥/٢٣ کە ناسراوە بەیاسای بنەڕەتی دەبێتە دەستوری گەلی ئەڵمانیای یەکگرتوو لە ٣ ئۆکتۆبەری ١٩٩٠.

– تەمەنی دەنگدان: ١٨ساڵی تەمەنی جیهانی.

– ئاڵا: لە سێ بەشی تەریب، یەکسان بەیەك پێکدێت، ڕەنگی ڕەش لە سەرەوە و ڕەنگی سوور لە ناوەڕاست و ڕەنگی ئاڵتونی لە خوارەوە.

– سیستەمی هەڵبژاردن: نهێنی– ڕاستەوخۆ ونوێنەرایەتی ڕێژەیی.

– ٥٪ بۆ بەدەستهێنانی نوێنەر لەسەر ئاستی وڵات و ٣٪ لەسەر ئاستی هەرێمەکان.

– دەسەڵاتەکان: دەسەڵاتی دادوەری، دەسەڵاتی یاسادانان، جێ بەجێکردن:

+ دەسەڵاتی دادوەری: دادگای دەستوری فیدڕاڵی (نیوەی ئەندامانی لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەران و نیوەکەی تری لەلایەن ئەنجومەنی پیرانەوە هەڵدەبژێرێت).

+ دەسەڵاتی یاسادانان: (پەرلەمان) پێکدێت لە ئەنجومەنی یەکگرتوو (٦١٢ کورسی) و ئەنجومەنی پیران.

+ دەسەڵاتی جێ بەجێکردن: سەرۆکی دەوڵەت، سەرۆك وەزیران یان سەرۆکی حکومەت (ڕاوێژکار)، کابینەی حکومەت (ئەنجومەنی وەزیران).

– پارتـە سیاسییەکان: هاوپـەیمانی سـەوز، یـەکیتی مەسیحی دیموکراتی، یـەکیتی کۆمەڵایـەتی مەسـیحی، پـارتی دیمـوکراتی ئـازاد، پـارتی چـەپی ئیشـتراکی، پـارتی دیموکراتی، پـارتـی ئیشتراکی، پارتی دیمـوکراتی کۆمەڵایەتی..هتد.

– بەشـداری ڕێکخـراوە نێودەڵەوتیـەکان: یانـەی پـاریس، بـانکی دراوی نێودەوڵەتی، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، نەتەوە یەکگرتوەکان، یونسکۆ، ئیسا، بانك و مەسرفی ئاسیاوی، ئـەنترپۆل، بانکی ئەوروپی بۆ نۆژەنکردنەوە و دروست کردن.

– گروپی فشار: یەکیتیـە بازرگانیـەکان، ڕێکخراوانـی خاوەنکـار، پەنابـەران، سەندیکاکان، کۆمەڵە پسپۆرییەکان.

سەرچاوە: سایتی

WWW.COUNTRY REPORTS.ORG



# کتێبخانەی گۆڤاری مێژوو



## خستنەڕووی کتێب

ناوی کتێب : **كوردستان الجنوبية ١٩٢٦-١٩٣٩، دراسة تأريخية- سياسية.**

ناوی کتێب بەکوردی: **کوردستانی باشوور ١٩٢٦- ١٩٣٣لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی**

ناوی دانەر: **د.سروه اسعد صابر**

نۆبەی چاپ: **یەکەم**



ساڵ و شوێنی چاپ: **کوردستان/سلێمانی-٢٠٠٦**

پەخش: **دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم**

ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا تێزی دکتۆرای دانەرە، کتێبەکە لە دووتۆیی ٤١١لاپەڕەی قەبارە مام ناوەند پەخش کراوە لەلایەن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، بە گشتی کتێبەکە لە چوار بەش و هەر بەشێکیش لە چەند باسێك پێك دێت، دانەر بەشەکانی کتێبەکەی دابەشکردووە بۆ چوار بەش بەم شێوەیە: بەشی یەکەم: کارگێڕی بەریتانی-عێراقی لە کوردستانی باشورو هەڵوێستی کورد لەو کارگێڕییە (١٩٢٦-١٩٣٠)" بەشی دووەم: چالاکی سیاسی کوردی و بزاڤە چەکدارییەکان (١٩٣٠- ١٩٣٢)" بەشی سێیەم: بارودۆخی سیاسی لە کوردستانی باشور (١٩٣٣-١٩٣٩) وهەڵوێستی کورد بەرامبەر ڕووداوە سەرەکییەکانی ئەوکاتەی عێراق" بەشی چوارەم: پارت و کۆمەڵە و یانە سیاسی و ڕۆشنبیرییە کوردییەکان لە ساڵانی (١٩٢٦- ١٩٣٩).

قۆناغی دوای ساڵی ١٩٢٥ز، بە سەرەتای قۆناغی نوێی دادەنرێت لە مێژووی کوردستانی باشوور دوای یەکلابونەوەی کێشەی موسڵ، لەم قۆناغەدا کورد تەواو

لە چیەتی مافی نەتەوەیی خۆی تێگەیشتبوو وە پێگەیشتبوو و بێ وچانیش بەرێگای جۆراوجۆر هەوڵ وتەقەللای دەدا بۆ دەستەبەرکردنی مافە نەتەوەییەکانی خۆی هەر لە هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردییەوە لەلایەن شێخ محمودەوە بگرە تا هەوڵدان بۆ چەسپاندنی چەند مافێکی سەرەکی وەك دامەزراندن و بەدەست هێنانی ئیدارەی خۆماڵی و دامەزراندنی فەرمانبەری کورد و چەسپاندنی زمانی کوردی وەك زمانی فەرمی لە دام ودەزگاکان، ئەمەش لە هەوڵی نوێنەرانی کورد ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و کەسایەتی سەربەخۆ و رۆژنامە و گۆڤار، و هەروەها پێشکەشکردنی چەندین یاداشت بۆ کۆمەڵەی گەلان و راپەرینەکان لەو ماوەیەدا دەردەکەوێت.

هەروەها پەرتوکەکە ئاکامی سیاسەتی هەڵەی کارگێری هاوبەشی بەریتانی عێراقی دەرهەق بە جێبەجێکردنی ئەو مافە سەرەکیانەی کورد بەگرتنەبەری سیاسەتی پشتگوێخستن و چەوساندنەوە بە بەرپرس و رێخۆشکەر دەزانێت بۆ چەندین راپەرین لەلایەن کوردەوە وەك راپەرینی ئاوباریك و راپەرینی بارزانی لەساڵی ١٩٣٠-١٩٣٢ و لە دوایشدا و پاش سەربەخۆیی دەوڵەتی عێراق و کۆتایی ئینتداب چەند بزوتنەوەیەك سەری هەڵدا وەك بزوتنەوەی خەلیل خۆشەوی و بزوتنەوەی یەزیدییەکان، لەلایەکی تر کتێبەکە باس لە هەڵوێستی کورد دەکات لەم قۆناغەدا لە بەرامبەر پەرەسەندنە لوکالڵ و هەرێمییەکان لەوانە پەیمانی سەعد ئاباد.

سەرباری ئەمانەش ئەم قۆناغە لە مێژووی کورد بە کردنەوەی چەندین کۆمەڵەویانەی رۆشنبیری و سیاسی کوردی لەلایەن رۆشنبیرو سیاسەتمەدارە کوردەکان، ئەمەش لە ئەنجامی سەرهەڵدانی چەند رێبازێکی فیکری وەك چەپرەو و دیموکراتی و نەتەوەیی وکاریگەر بوونی سیاسەتمەدار و رۆشنبیرە کوردەکان بەو ئاراستە فیکری و سیاسیەی لەسییەکانی سەدەی بیستەم بەربلاوبوو. ئەمەش لەلای

خۆییـەوە ڕەنگدانـەوەی لەسـەر ئـەزمونی ژیـانی حیزبایـەتی سیاسـەتمەدار و ڕۆشنبیرە کوردەکان هەبوو، سـەرەڕای ئاماژەکردن بـە گەشـەکردنی ڕۆڵـی بژێری ڕۆشنبیری کورد لـە هـەردوو بواری سیاسـی و ڕۆشـنبیری لـە گۆڕەپـانی سیاسـی کوردیدا.

ماوەتەوە ئەوە بڵێین کە دانەر لـەم کتێبـەدا چـەندین سەرچاوە و بەڵگەنامـەی بەریتانی و عێراقی و ڕۆژنامە و یاداشتنامە و گۆڤار و توێژینەوەو ووتاری بـە زیـانی (کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی) بەکارهێناوە بـۆ بـەهێزکردنی بۆچـوون و ڕاکـانی و ئاڕاستەی لێکۆڵینەوەکەی.

## خستنەڕووی کتێب

ناوی کتێب: **كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر**

ناوی کتێب بەکوردی: **کوردستانی باشور لەسەدەکانی حەڤدە وهەژدەهەمدا، توێژینەوەیـەك لەپەیوەندیە ئیداری وڕامیاری وئابورییەکانی لەگەڵ هەردوو ئەیالەتی بەغداد وموسڵ.**




نوسەر: **د.سعدی عوسمان حسێن**

ساڵ وشوێن: **کوردستان / هەولێر-٢٠٠٦**

پەخش: **کتێبفرۆشی سۆران**

ئەم کتێبە لـەبنەڕەتدا تێزی دکـتۆرای نووسـەرە، کــە پێــشکەشی کۆلێــژی ئــەدەبیاتی زانکــۆی سەلاحەدینی کردووە، باس لەڕەگ وڕیشەی مێژوویی پەیوەندی ئیداری وڕامیاری وئابورییەکانی کوردستانی باشور لەگەڵ هەردوو ئەیالەتی موسڵ وبەغداد لەسـەدەی١٧و١٨ دەکـات، نوسـەر

لەم توێژینەوەیدا بۆساغکردنەوەو وەرخستنی بۆچوون ڕاستیگەلێکی مێژوو لەمێژووی نوێ کورد لەماوەی دوو سەدەی ناوبراودا، بێ وچان هەوڵیداوە بۆ ئەمەش چەندین دەستنوس وبەڵگەنامە وسەرچاوە وگۆڤار ورۆژنامە وتوێژینەوەی بەزبانی جۆراوجۆر بۆ توێژینەوەکەی دەستی خستوە، کە بەگشتی ٢٩٣سەرچاوەیە و بەم شێوەیە دابەشبووە(بەڵگەنامەکان١٢: ٢بڵاونەکراوە-١١بڵاوکراوە؛ دەستنوس:٤دانە؛ سەرچاوەی تورکی (لاتینی،عوسمانی):٢٥، عەرەبی:١٣٢ فارسی:١٧ کوردی٣٧، ئینگلیزی١١ سەرچاوە؛ نامە زانکۆییەکان:١٢؛ فەرهەنگونەتڵەسەکان٥دانە: ٣عەرەبی، ٢ئینگلیزی؛ ووتار وتوێژینەوە:٣٦: تورکی١، عەرەبی٢٧، کوردی ٨) سەرباری بوونی پاشکۆیەکی نەخشەیی وبەڵگەنامە وپوختەی کوردی وعەرەبی وئینگلیزی.

نەخشەی توێژینەوەکەش نووسەر بەسەر دەروازە و پێنج بەش دابەشیکردووە وە هەر بەشێکیش بۆ چەند تەوەرەیەك دابەشبووە، ناونیشانی بەشەکانیش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

دەروازە: کوردستانی باشوور لێکۆڵینەوە لە جوگرافیای مێژوویی.

بەشی یەکەم: پەیوەندییە ئیدارییەکان

بەشی دووەم: سیاسەتی ئەیالەتی بەغدادوموسڵ لە کوردستانی باشوور.

بەشی سێیەم: هەڵوێستی کورد لە هەردوو ئەیالەتی بەغدادوموسڵ.

بەشی چوارەم:پەیوەندی لەنێوان ناوچەکە وهەردوو ئەیالەتی بەغداد وموسڵ لە ڕوانگەی ململانێی عوسمانی- ئێران.

بەشی پێنجەم: پەیوەندییە ئابورییەکان.

توێژەر لە پوختەی نێزەکەیدا بەم شیوەیە لەمەڕ لێکۆڵینەوەکەی دەدەوێت: ((هەوڵدەدات لە ڕەگ وریشەی ئەو پەیوەندییە بکۆڵێتەوە کە لەنێوان کوردستانی باشور و بەشەکانی تری عێراقدا لەئارادابووە، ئەویش لە ڕێگای ساغکردنەوەی

پەیوەندی ئیداری وڕامیاری وئابوری ناوچە کوردییەکان وهەردوو ئەیالەتی بەغداد وموسڵ لە ماوەیەکی مێژوویی درێژدا، کە هەردوو سەدەی ١٧و١٨ دەگرێتەوە، وە لە گۆشە نیگای کوردەوە سەیری بابەتەکە بکات)).

پەرتوکەکە لە جوگرافیایی مێژوویی کوردستانی باشوور دەکۆڵێتەوە باس لەو شاروشارۆچکانەی ئەو دوو سەدەیە و گرنگترین پەرەسەندن وپێشکەوتنی لەرووی ئاوەدانی ودانیشتوانەوە وسەرباری پەلهاویشتنی عوسمانی وسیستەمی ئیداری وڕامیاری عوسمانی لەناوچە کوردییەکان وڕۆڵی کورد لەبەڕێوبردنی هەردوو ئەیالەت ودیاریکردنی سنوری هەریەک لە ئەیالەتەکان ودابەشبونی ئیداری لەسەدەی ١٧و١٨ باس دەکات.

لەلایەکی تر نووسەر سیاسەتی هەردوو ئەیالەتی بەغداد وموسڵ لە کوردستانی باشوور بەرامبەر میرنشینە کوردییەکان وباس لە قەوارە وهۆزەکان دەکات، سەرباری ڕاپەڕین وبزاڤەکان وپەرەسەندن و هۆکاروسیماکانی بزاڤەکانیش ئاماژە پێدەکات.

هەروەها پەرتوکەکە تیشك دەخاتە سەر پەیوەندی کوردستانی باشوور وهەردوو ئەیالەت لە ڕوانگەی ململانێی عوسمانی- ئێران وباس لەهۆکارەکان و ڕەنگدانەوەی وشوێنەوارو دەرەنجامەکانی دەکات لە کوردستانی باشوور وهەڵوێستی کورد ئاماژەپێدەدا لەهەمان سیاقدا.

سەرەرای سیاسەتی ئابوری هەردوو ئەیالەت کە خۆی لە سەندنی باج وپیتاك لە ئەنجامی پاشکۆیەتی ئیداری، وە هەروەها لە چەوەساندنەوە خۆی دەنوێنێ. هەروەها باس لە زەرەر وزیانە مادی ومرۆییەکان لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە وپەیوەندی ئاڵوگۆڕەکان دەکات، وە چالاکی بازرگانییەکان و پەیوەندی بازرگانی (ناوخۆ ودەرەکی) و گواستنەوەی بازرگانی وچالاکی هەناردن و هاوردن وبازرگانی ترانسێت دەکۆڵێتەوە.

# بەڵگەنامەی مێژوویی

العدد ٢٩٩٠

التاريخ ٢٨/شوال/١٣٤٤

١٩٢٦/٤/٣٠

منطقة معارف كركوك

الموضوع ..........

الى متصرفية لواء السليمانية

اشارة الى المادة الاولى من كتاب مديرية المالية العامة المرقم ٦٢٦٢ والمؤرخ ٧/٤/١٩٢٦ ،
المبلغ الينا بكتابكم المرقم ٤٤٦١ والمؤرخ ١٦/٤/١٩٢٦ .
ان اسباب انفكاك الموالية [illegible] من ٠/تموز/٩٢٢ الى ١/مارت/٩٢٥
هي تخلية السليمانية ووقوع الانقلاب من قبل الشيخ محمود ثم تجديد الموالية الى وظيفته
الاصلية بتاريخ ١/مارت/٩٢٥ .

مدير منطقة معارف كركوك

صورة منه الى :-
المالية
مديرية المحاسبة العامة

کورتە لێدوانێك لەسەر ئەم بەڵگەنامەیە:

ئەم بەڵگەنامەیە، کە بەژمارە۲۱۹۰ی مێژووی ۲۸ محرم ۱۳۵۵کۆچی بەرامبەر بە ۱۹۳٦/٤/۲۰ تۆمار کراوە. ولەبەڕێوبەرایەتی (منطقة معارف کرکوك) نێردراوە بۆ متصرفیەیی لیوای سلێمانی(المتصرفية لواء السليمانية) باس دەکات لە:

۱- ناوهێنانی ڕاپەڕینی شێخ محمود بە کودەتا (انقلاب)، لەوانەشە کودەتا بەزمانی فارسی بەکارهاتبێ، کە لەزمانی فارسیدا کودەتا مانای شۆڕشە.

۲- هەروەها ناوی سەعید سدقی کابان بە پاڵپشت ولایەنگری خۆیان (موالی) دەهێنێت، کە ئامازە بەوەدەکات سەعید سدقی کابان لە ٥ ئەیلول ۱۹۲۲ تا ۱/مارت/۱۹۲٥ دەست لەکارکێشانەوە(انفکاك)کردووە بەهۆی ڕۆیشتنی لە سلێمانی و ڕوودانی کودەتای شێخ محمود و پاشتر باس لەوە دەکات کە لە ۱/مارت/۱۹۲٥ گەڕاوەتەوە سەر وەزیفەکەی. شایەنی باسە سەعید سدقی کابان(۱۸٦۸- ۱۹٦۱) لەسلێمانی لەدایك بووە و زانستەدینییەکان وئەدەب صرف ونحو لە حوجرە خوێندوە وە لە سەردەمی شێخ محمود لە قوتابخانەی مەحمودیە وانەی وتۆتەوە وپاشتریش وەك مامۆستا تا ۱۹۳٦ لە قوتابخانە دەرسی وتۆتەوە، ئەوەبوو دواتر خانەنشین کرا. وە لەو کەسانەیە دەستوری بە زمانی کوردی دارشتوە وە لەساڵی ۱۹۲۸ (مختصر الصرف والنحو الکردي) چاپکردووە، وباوکی عزەت کابانە کە لەحەفتاکان سەرۆکی شارەوانی سلێمانی، وبەهجەت کابان کە لەبواری خوێندندا بەردەوام بووە، وە دوا وەزیفەی کە کارتێداکردووە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی (مفتش المعارف-مشرف التربوي) بووە.

هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی ڕۆشنبیری

ژمارە: ١٢٤٨
ڕۆژ: ١٨/٦/٢٠٠٧

## مـۆڵـەت

بـە پێـی برگـەکانی یاسـای چـاپەمەنی ژمـارە (١٠)ی سـاڵی ١٩٩٣ و فـەرمانی وەزاری ژمارە (٥٠٧٨) لە ١٨/ ٩/ ٢٠٠٦، لـەبەر ئەوەی گۆڤاری (**مێژوو**) کـە خـاوەن ئیمتیازی (ئەرسـەلان موسـی ڕشـید) و سەرنووسـەرەکەی بـەڕێز (محمـد عبداللـە کاکـە سـوور) مەرجەکانی یاسایی تێدایە، بۆیە بڕیارماندا مۆڵەتی ژمارە (٢٦٣)ی پێ بدەین.

**فلک الدین کاکەیی**
وەزیری ڕۆشنبیری



## لەگەڵ مامۆستایانی مێژوو

د.حەسەن جاف

◆ ساڵی١٩٤٢ لە گوندی کەلار هاتۆتە دونیاوە.

◆ خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی ودواناوەندی لەشاری کفری وخانەقین تەواوکردووە.

◆ بەکالۆریوسی لە بەشی مێژووی کۆلێژی ئەدەبیات لە ساڵی ١٩٦٦ لە بەغداد تەواو کردووە.

◆ ماستەر و دکتۆرای لە بەشی مێژووی زانکۆی تاران لە ساڵی ١٩٧٤ تەواو کردووە.

◆ لە زانکۆی تاران کۆلێژی ئەدەبیات و مەعاریفی ئیسلامی دا، لە مێژووی ئێران لە ساڵەکانی١٩٧٤ -١٩٧٩ دەرسی وتۆتەوە.

◆ سەرۆکی بەشی مێژوویی نوێ و هاوچەرخ بووە لەپەیمانگای مێژووی عەرەب بۆ خوێندنی باڵا لە ساڵەکانی ١٩٩٢-١٩٩٨.

◆ لە زۆربەی کۆلێژەکانی زانکۆی بەغداد، مێژووی ئێرانی نوێ و هاوچەرخی وتۆتەوە.

◆ ئەندامی لیژنەی کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کوردی بووە.

◆ ڕاوێژکاری زانستی یەکێتی مێژوونوسانی عەرەب بووە.

◆ بە چوار زمان دانان و نوسین و لێکۆڵینەوەی هەیە، لەو زمانانەش بریتین لە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی.

◆ هەشت نوسراوی لەبەشی مێژوودا هەیە، کە چوار بەرگیان سەبارەت بە ئێرانە.

◆ لەساڵی ١٩٧٠ دەستی بە نوسین کردووە، پتر لە نەوەد لێکۆڵینەوە و نوسینی جۆرا وجۆری لە بواری مێژوو، ئەدەب، ڕامیاری. بەزمانی عەرەبی و کوردی و فارسی لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردی و عەرەبی یەکاندا هەیە.



متەصەریفی هەولێر ١/٣/١٩٤٠



شیخ محمود لەگەڵ یەکێکی نەناسراو



قوتابخانەیەکی سەرەتایی هەولێر لە سەیران–هەولێر– ١٩٤١

# ھەواڵ

لە هۆلی فەرهادی کۆلیژی ئاداب زانکۆی سەلاحەددین لەرۆژی( ١١/٥/ ٢٠٠٦ ) ژمارەیەك لە ئەندامان و دەستەیی دامەزرێنەری کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی کوردستان هەڵسان بەهەلبژاردنی سەرۆك جێگرەکەی لەگەڵ ئەندامانی دەستەی کارگێری کۆمەڵە بەم شێوەیە:

| | |
|---|---|
| ١- پرۆفیسۆر د.ئەرسەن موسی رشید | سەرۆکی کۆمەڵە |
| ٢- د. محەمەد عبدوللا کاکەسور | جێگری سەرۆك |
| ٣- م. فارس قادر فقی عبدوللا | بەرپرسی پەیوەندییەکان |
| ٤- ئەهرۆ اسماعیل محمد | بەرپرسی دارایی |
| ٥- د.حکیم ئەحمەد مام بکر | بەرپرسی کارگێری |
| ٦- د.نشتیمان بشیرمحمد | ئەندامی یەدەگ |
| ٧- توانا رشید کریم | بەرپرسی چالاکیەکان( ئەندامی یەدەگ) |

## دەستوری بڵاوکردنەوەی بابەت لەگۆڤارەکەمان

گۆڤاری مێژوو، گرنگی بەتوێژینەوە و وەرگێرانی مێژوویی دەدات. بەکامەرانی وبایەخەوە ڕادەگەیەنین کە گۆڤارەکەمان دەرگای واڵایە بۆ بڵاوکردنەوەی توێژینەوە ولێکۆڵینەوە زانستیەکانتان، بۆیە داوا لە توێژەران ونوسەرانی بەڕێز دەکەین، ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕەچاو بکەن لەنوسینەکانیاندا:

١- بابەتەکان دەبێت مێژوویی بێت جا مێژوویی( کۆن، ناوەند، نویٚ و هاوچەرخ )، یان هەربابەتێکی تری مێژوویی.

٢-ڕەچاوی نوسینی زانستیانە بکرێت، ناوی نوسەر وناوی سەرچاوە وکتێب ودەزگای بڵاوکراوە وساڵی بڵاوکردنەوە و ژمارەی لاپەڕەکە دیاری بکرێت.

٣-سەبارەت بەتوێژینەوە، واچاکترە ناونیشانی ئینگلیزی بابەتەکەبنوسرێت وگەر بکرێت لەگەڵیدا پوختەی عەرەبی وئینگلیزی بابەتەکەش هەبێت.

٤-هەروەها بابەتی وەرگێراو،باشترە کۆپیەکی نوسراوە ئەسڵیکەمان بۆ بنێرن.

٥- نوسینی ناوی سیانی و ناونیشانی تەواوی نوسەر.

٦- بابەتەکە لە یەك ڕووی لاپەڕەکە بێت وبەخەتێکی شاش نوسرابێت.

# MÊJU magazine

A quarterly historical magazi
Issued by Kurdistan Historic
Cultural Association. *No:1*

کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان

- Kurdish Nationalism Speech.
- Kurdish Lexicographer in 1970 - 1984.
- Finding Rock Pictures (Petroglyphs) in Kurdistan.
- Kurdish role in the Khawarij movement during The Ommawi state period.
- Hawler during the Seljukies period.
- The Ottoman state and its foundation.
- A summary about the history of diplomatic (The science of studying documents).
- The importance of the Ottoman documents in writing The Kurdish history.
- Factors of Civilization Advancement.

2006 C.A

KURDISTAN HISTORICAL CULTURAL ASSOCIATION

جمعية الثقافة التأريخية لكردستان

چاپخانەی منارە - هەولێر